# قورئانی بەڕێز

## یان

# کتێبی پیرۆز





عەقیدە #٥

أحمد کوردی

١٠/ ١٢/ ٢٠٢٣

# ناوەڕۆک


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی | ٣ |
| دەروازەی یەکەم / بیروباوەڕ | ١٣ |
| خوای گەورە سبحانە وتعالی | ١٤ |
| پێغەمبەران علیهم السلام | ٧٦ |
| ڕۆژی قیامەت | ١٧١ |
| بیروباوەڕی تر | ٢١٨ |
| دەروازەی دووەم / حوکمەکان | ٣٤٦ |
| بڵاوکردنەوەی دین | ٣٤٧ |
| هاوسەرگیری | ٤٤٣ |
| ئافرەت | ٤٨٧ |
| بابەتی تر | ٥٤٣ |
| دەروازەی سێیەم / وەڵامی چەند گومانێك | ٥٥١ |
| سەرچاوەکان | ٥٦٤ |

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله الأمين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد

قورئانی پیرۆز قسەی خوای گەورەیە و دابەزاندووە بۆئەوەی شوێنیبكەوڕێت و كاری پێبكرێت. وە موسوڵمانان باوەڕیان پێی هەیە و بە پارێزراو و دەستكارینەكراو و بەڕێز و پیرۆزی ئەبینن. وە كتێبی پیرۆز لای جوولەكە (یەهود) و گاورەكان (نەصارا) قسەی خوایە و پیرۆزە و ئەبێت شوێنیبكەوڕێت و كاری پێبكرێت، وە بە دەستكارینەكراوی ئەبینن.

بەڵام دوای خوێندنەوەی هەردوو كتێبەكە و لەكاتی بەراوردكردنیاندا بەیەكتر جیاوازی و زۆرجار دژیەكیش ئەبینین لەنێوان دەقەكانی ئەم دوو كتێبەدا. كە وامان لێئەكات بڵێین گەر هەردووكیان قسەی خوای گەورە بن كەواتە خوای گەورە دژیەك قسەی كردووە و سەری لە مرۆڤەكان شێواندووە. ئەمەش دوورە لە قسەی خوای گەورەوە و حاشا، بەڵكو خوای گەورە خاوەنی جوانترین و ڕەوانترین بەرزترین قسە و كتێبە، وە قسەكانی دژیەك نین. بەڵكو دژیەكی لە قسەی غەیری خوادایە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت:

+ ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ (البقرة - ٢) ئەم قورئانە هیچ گومانی تیا نییە كە لەلای خواوەیە، هیدایەتە بۆ تەقواكاران ﴾.

+ ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ (الزمر - ٢٣) خوای گەورە باشترین فەرموودەی دابەزاندووە کتێبێك کە ئایەتەکانی لە بەهێزیدا لە یەکتر ئەچێت و ئەحکام و چیرۆکەکانی دووبارە ئەبنەوە، لە بیستنیا پێستی ئەوانەی لە خوا ئەترسن گرژ ئەبێت، پاشان پێست و دڵیان نەرم ئەبێتەوە بۆ زیکری خوا، قورئان هیدایەتی خوایە و کێی بوێت پێی هیدایەت ئەدات، وە هەرکەس خوا گومڕای بکات هیچ هیدایەتدەرێکی نییە ﴾.
+ ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا (النساء - ٨٢) ئایا بۆ لە قورئان ناڕوانن، وە گەر قورئان لەلای غەیری خواوە بوایە ئەوا دژیەکییەکی زۆریان تیا ئەبینی ﴾.

جا ئەوەی ئەمێنێتەوە بیلێین لەم حاڵەیا ئەوەیە کە یەکێك لەم دوو کتێبە قسەی خوای گەورە نییە بەڵکو بەدرۆوە دراوەتە پاڵی. وە لەم کتێبەدا إن شاء الله ئەوە ئەسەلمێنین کە کتێبی پیرۆزی جوولەکە و گاورەکان قسەی خوای گەورە نییە، هەمووشی نەبێت ئەوا بەشێکی زۆری بەدرۆوە دراوەتە پاڵ خوای گەورە، وە

دەستکاری کراوە و، شایەنی ئەوە نییە بە پیرۆز سەیربکرێت و شوێنیبکەورێت. وە بەراوردێك ئەکەین لەنێوان دەقەکانی هەردوو کتێبەکەدا لە چەند بابەتێکدا.

وە مەبەست لەم بەراوردە چەند شتێکە:

١. بانگکردنی گاور و جوولەکەکان بۆ دینی ئیسلام و، نەسیحەتکردنیان کە وازبێنن لەو دینە بەتاڵەی لەسەرین، وە وەڵامی گومانەکانیان.
٢. وشیارکردنەوەی موسوڵمانان و پتەوکردنی بیروباوەڕیان و شانازیکردنیان بە دینەکەیانەوە، وە نەخەڵەتانیان بە درۆ و چەواشەکاریی گاور و جووەکان.
٣. سەلماندنی ئەوەی کە قورئان کتێبێکی تەواو جیاوازە و لە کتێبی جوولەکە و گاورەکانەوە زانیاری وەرنەگرتووە و نەبردووە.
٤. سەلماندنی ئەوەی کە قورئان قسەی خوای گەورەیە و قسەی مەخلوقەکان نییە، وە تەواوە و بێ نوقسانییە.

وە گەر کەسێك بڵێت: خۆ ئێوەی موسوڵمانان باوەڕتان بە ئینجیل و تەورات هەیە، کەواتە چۆن ئەڵێن دژیەکن لەگەڵ قورئاندا و قسەی خوا نین و بەراوردیان ئەکەن بە قورئان؟

لە وەڵامدا ئەڵێین: بەڵێ باوەڕمان بە دوو کتێبی تریش هەیە کە هەر قسەی خوای گەورەن و دابەزاندوون لەپێش قورئاندا کە تەوراتی موسا و ئینجیلی عیسان علیهما السلام. بەڵام ئەو دوو کتێبە ئەم دوو کتێبە نین کە ئێستە بەدەست جوولەکە و گاورەکانەوەن و پێی ئەوترێت کتێبی پیرۆز، بەڵکو ئەوەی ئێستە بەدەستیانەوەن زۆربەی قسەی سەرچاوە نەزانراون نەوەك قسەی خوای گەورە یان تەنانەت پێغەمبەرەکانی بێت علیهم السلام. وە ئێمە باوەڕمان وایە کە تەورات و ئینجیل دواتر دەستکاری کراون و وەك ئەوە نەماونەتەوە کە دابەزیون، چونکە خوای گەورە ئەرکی پاراستنیانی دابووە دەست جوولەکەکان خۆیان و خۆی سبحانە وتعالی نەیپاراستن، وە ئەوانیش خیانەتیان لەو ئەمانەتە کرد و نەیانپاراستن. جیا لە قورئان کە وەك خۆی ماوەتەوە و دەستکاری نەکراوە و خوای گەورە پاراستوویەتی و پاراستنەکەی نەخستووەتە سەر مرۆڤەکان. وە بەراوردکردنەکەی ئێمە لەگەڵ کتێبە دەستکاریکراوەکانی ئەمڕۆدایە نەوەك ئەوانەی دابەزین بۆ هەریەك لە موسا و عیسا پێغەمبەر علیهما الصلاة والسلام کە لەمڕۆیا نەماون.

+ ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ (آل عمران - ٣) قورئانی بۆ دابەزاندوویت بە حەق بەڕاستدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی، وە تەورات و ئینجیلیشی دابەزاندووە ﴾.

+ ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ (المائدة - ٤٤) ئێمە تەوراتمان دابەزاندووە هیدایەت و نووری تیابووە، کۆمەڵێك پێغەمبەر حوکمیان پێکرد کە موسوڵمان بوون و پێغەمبەری یەهودی و زانا و خواپەرستەکان بوون، کە فەرمانیان پێکرابوو لەلایەن پێغەمبەرانیانەوە کە کتێبی خوا بپارێزن وە شایەت بوون بەسەر ئەو پاراستنەوە، جا زانایان لە خەڵك مەترسن و لە من بترسن، وە ئایەتەکانم مەگۆڕنەوە بە نرخی کەمی دنیا، وە هەرکەس حوکم بەوە نەکات کە خوا دایبەزاندووە ئائەوانە کافرن ﴾.

+ ﴿ وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ (المائدة - ٤٦) وە لەدوای پێغەمبەران عیسای کوڕی مەریەمان نارد کە بەڕاستدانەری تەورات بوو کە پێش ئەو دابەزیبوو وە ئینجیلمان دایە هیدایەت و نوری تیایە وە بەڕاستدانەری تەوراتی پێش خۆیەتی و هیدایەت و ئامۆژگاری تیایە بۆ تەقواکاران ﴾.

+ ﴿ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ (البقرة - ٧٥) ئایا ئێوە چاوەڕێ

و تەماحی ئەوەتانە جولەکە باوەڕتان پێبێنن لەکاتێکا کۆمەڵێکیان گوێیان لە قسەی خوا ئەبوو لە تەوراتدا پاشان دەستکارییان ئەکرد کە تێیئەگەشتن و ئەشیانزانی ئەوە حەرامە ﴾.

+ ﴿ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا (النساء - ٤٦) لە جولەکەکان تیایانە دەستکاری تەورات ئەکەن لەجێی خۆی، وە ئەڵێن گوێبیستی فەرمانی خوا بووین و سەرپێچی ئەکەین ﴾.

+ ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ (المائدة - ١٣) جا بەو پەیمان شکاندنەیان لە رەحمی خۆمان دەرمانکردن، وە دڵیانمان ڕەقکرد، قسەکانی تەوراتیان گۆڕی لەجێی خۆی ﴾.

+ ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ (المائدة - ٤١) وە جولەکەکان گوێ لە درۆی گەورەکانیان ئەگرن وە گوێ لە کەسانێکی تریش ئەگرن کە لە تەکەبوریانا لە مەجلیسی تۆدا دانانیشن ﴾.

+ ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ (البقرة - ٧٩) دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە کتێب بە دەستی خۆیان ئەنووسن پاشان

ئەیدەنە پاڵ خوا بۆئەوەی دنیایەکی کەمی پێ بکڕن، تیابچن بۆ شتێك کە بەدەستی خۆیان نووسیویانە وە تیابچن بۆ ئەو پارە کەمەی دنیا کە دەستیان ئەکەوێت ﴾.

+ ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ (الحجر - ٩) ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووە، وە ئێمە ئەشیپارێزین ﴾.

وە ئەوەی کە واجبێتی پاراستنی کتێبەکان لەسەر جوولەکە بووە و نەیانپاراستووە لە کتێبی پیرۆزیشدا هاتووە:

– وكتب موسى هذه الشريعة، وسلمها إلى الكهنة بني لاوي، حاملي تابوت عهد الرب، وسائر شيوخ إسرائيل (٩) وأمرهم موسى قائلا: ((في نهاية السنين السبع، في الوقت المحدد لسنة الإبراء، في عيد الأكواخ (١٠) حين يأتي إسرائيل كله ليحضر أمام الرب إلهك، في المكان الذي يختاره، تقرأ هذه الشريعة، على مسمع من إسرائيل كله (١١) اجمع الشعب، الرجال والنساء والأطفال ونزيلك الذي في مدنك، لكي يسمعوا ويتعلموا ويتقوا الرب إلهكم ويتنبهوا أن يعملوا بجميع كلمات هذه الشريعة (١٢) ويسمع بنوهم الذين لم يعلموا فيتعلموا مخافة الرب إلهكم، كل الأيام التي تعيشونها في الأرض التي

أنتم عابرون إليها الأردن لترثوها )) (١٣) (التثنية / ٣١) وە موسا ئەم شەریعەتەی نووسی، وە دایە دەست کاهینەکان، کە نەوەی لاوین و هەڵگری سندوقی پەیمانی یەزدانن، لەگەڵ هەموو پیرانی ئیسرائیل (٩) وە موسا فەرمانی پێکردن و وتی: ((هەر حەوت ساڵ جارێك، لە ساڵی لێخۆشبوونی قەرزەکان، لە جەژنی کەپرە شینەدا (١٠) کاتێك هەموو ئیسرائیل دێن هەتا لەبەردەم یەزدانی پەروەردگارت دەربکەون لەو شوێنەی کە هەڵیدەبژێرێت، لە بەرامبەر هەموو ئیسرائیلدا ئەم شەریعەتە بە دەنگێکی بەرز دەخوێنیتەوە کە گوێیان لێی بێت (١١) گەل کۆبکەنەوە، پیاو و ئافرەت و منداڵ و ئەو نامۆیانەش کە لە شارۆچکەکانتانە بۆئەوەی گوێبگرن و فێربن لە یەزدانی پەروەردگارتان بترسن و هەموو وشەکانی ئەم شەریعەتە کارپێبکەن (١٢) هەروەها نەوەکانیشتان کە ئەم شەریعەتەیان نەزانیوە دەبێت گوێی لێبگرن و فێربن لە یەزدانی پەروەردگارتان بترسن، هەموو ئەو ڕۆژانەی لەسەر ئەو زەوییە ئەژین کە ئێوە لە ڕووباری ئوردون بۆی دەپەڕنەوە هەتا دەستی بەسەردا بگرن (١٣).

– ولما انتهى موسى من كتابة كلمات هذه الشريعة حتى آخرها في سفر (٢٤) أمر اللاويين حاملي تابوت عهد الرب وقال لهم: (٢٥) ((خذوا سفر هذه الشريعة، وضعوه إلى جانب تابوت عهد الرب إلهكم، فيكون هناك شاهدا

عليك (٢٦) لأني عالم بتمردك وقساوة رقبتك. ها إنكم، وأنا على قيد الحياة معكم، قد تمردتم على الرب، فكيف بعد موتي؟ (٢٧) (التثنية / ٣١) وە کاتێك موسا تەواو بوو لە نوسینەوەی وشەکانی ئەم شەریعەتە تا کۆتاییەکەی لە پەرتوکێکدا (٢٤) فەرمانی بە لاوییەکان هەڵگری سندوقی پەیمانی یەزدان کرد و پێی وتن: (٢٥) ((ئەم پەرتوکەی تەورات ببەن، وە لەپاڵ سندوقی پەیمانی یەزدانی پەروەردگارتان دایبنێن، جا لەوێدا شایەت ئەبێت بەسەرتەوە (٢٦) چونکە ئەزانم بە یاخیبوونت و کەللەرەقیت. ئەوە ئێوە من لەناوتانم لەگەڵتان و یاخیبوون لە خوا، جا دوای مردنم چی؟ (٢٧).

- كيف تقولون: (( نحن حكماء وشريعة الرب معنا ؟ )) إن قلم الكتبة الكاذب حولها إلى الكذب (٨) سيخزى الحكماء ويفزعون ويؤخذون. ها إنهم نبذوا كلمة الرب فأية حكمة لهم؟ (٩) (إرميا / ٨) چۆن ئێوە ئەڵێن: ((ئێمە داناین وە شەریعەتی خوا لەگەڵمانە)) لەکاتێکا پێنوسی درۆی نوسەرانی تەورات گۆڕی بۆ درۆ (٨) داناکان ریسوائەبن وە دەتۆقن و پێوەئەبن. ئەوەتا فەرمایشتی یەزدانیان ڕەتکردەوە ئیتر چ داناییەکیان هەیە؟ (٩).

- فما فضل اليهودي إذا؟ وما الفائدة في الختان؟ (١) هي كبيرة من كل وجه. وأولها أنهم ائتمنوا على كلام الله (٢) فماذا يكون؟ إن خان بعضهم أفتبطل خيانتهم أمانة الله؟ (٣) حاش له! بل صدق الله وكذب كل إنسان (٤)

(الرسالة إلى أهل رومية / ٣) جا ئیتر یەهودەکان چییان زیاترە؟ وە سودی خەتەنەکردن چییە؟ (١) زۆر شتیان زیاترە لە نەتەوەکانی تر. یەکەمیان ئەوەیە کە وشەی خوایان پێ سپێردرا (٢) جا چی ئەبێت؟ گەر هەندێکیان خیانەت بکەن ئایا خیانەتەکەیان ئەمانەتی خوا بەتاڵ ئەکاتەوە؟ (٣) نەخێر، بەڵکو خوا ڕاستی فەرمووە وە هەموو مرۆڤێك درۆیکرد (٤).

— فقد أخذتم الشريعة التي أعلنها الملائكة ولم تحفظوها (أعمال الرسل ٧/ ٥٣)
بەدڵنیاییەوە شەریعەتی تەوراتتان لە مەلائیکەتەوە وەرگرت و نەتانپاراست.

جا ئێمە دێین ئەو ڕاستییە بسەلمێنین و بە ئەهلی کیتاب بڵێین: ئێوە دەستکاری کتێبەکانتان کردووە و وەك خۆی نەتانپاراستووە، وە لەڕێی پێغەمبەران لاتانداوە و سەرتان لێشێواوە، وە نازانن لە کتێبەکەتانا فەرمایشتەکانی خوای گەورە کامانەن و بوختان و دەستکاریکردنەکان کامانەن. جا بگەڕێنەوە سەر ڕێی پێغەمبەران و، شوێن دواهەمین کتێب و دواهەمین پێغەمبەر بکەون کە قورئانی پیرۆز و موحەممەدن صلى الله عليه وسلم.

أحمد کوردی

# بابەتی یەکەم

## دەقەکان دەربارەی خوای گەورە سبحانە وتعالی

ئاشکرایە لای هەموو خاوەن عەقڵێك کە خوای گەورە سبحانە وتعالی خاوەنی سیفاتی بەرزە، وە لە هەموو نوقسانییەکەوە دوورە، وە دەسەڵات و توانای ڕەهایە و خۆی و سیفاتەکانی لە سەروو هەموو شتێکەوەن. وە کە هەر شتێك لاواز بێت یان بێ دەسەڵات بێت یان سیفاتەکانی نوقسانی و کەموکورتییان تیا بێت خوا نییە و شایەنی ئەوە نییە پێی بوترێت خوا.

بەڵام لە کتێبی گاور و جوولەکەکاندا وەسفی خوای گەورە کراوە بە چەندین سیفەتی ناشرین و نوقسان، کە هەرگیز شایەنی ئەوە نین بدرێنە پاڵ خوای گەورە و، خوای گەورە لەو وەسفانەوە دوورە و پاك و بێ گەردە. وە ئەو قسانە لە بەرامبەر خوای گەورەدا جنێو و سوکایەتین و ئەوەش حەرامە لای هەمووان (الأنعام - ١٠٨)، (خروج ٢٢/ ٢٧). وە لە بەرامبەردا لە قورئاندا بابەتەکە جیاوازە بەڵکو تەواو پێچەوانەیە، وە سیفاتی بەرز و بێ نوقسانی و شایستە دراونەتە پاڵ خوای گەورە سبحانە وتعالی.

جا چەند نموونەیەك لە هەردوو کتێبەکە دێنینەوە و بزانین کام سیفەتانە شایەنی ئەوەن بدرێنە پاڵ خوای گەورە؟ وە ئایا خوای گەورە بە کامە شێوە وەسفی خۆی بۆمان کردووە و چۆن خۆیمان پێئەناسێنێت؟

یەکەم/ سیفەتی هیلاکبوون.

کتێبی پیرۆز:

– وهكذا أكملت السموات والأرض وجميع قواتها (١) وانتهى الله في اليوم السابع من عمله الذي عمله، واستراح في اليوم السابع من كل عمله الذي عمله (٢) (تكوين / ٢) بەو شێوەیە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوەی تێیدا ڕێکخرابوو تەواوکران (١) وە خوا تەواو بوو لە ڕۆژی حەوتەمدا لەو ئیشەی کە کردی، وە لە ڕۆژی حەوتەمدا ئیسراحەتی کرد لە هەموو کارەکانی کە کردبووی (٢).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوب (ق - ٣٨) وە بێگومان ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیانە لە شەش ڕۆژدا دروستمانکرد و هیچ ماندووییەکمان تووشنەبوو ﴾.
+ ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْم (البقرة - ٢٥٥) الله ئەو خوایەیە کە هیچ خوایەکی حەق نییە جگە لەو وە هەمیشە زیندووە و مردنی بەسەردا نایەت، وەنەوز نایباتەوە و ناشخەوێت ﴾.
+ ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (البقرة - ١١٧) خوا داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، وە گەر بیەوێت هەر بڕیارێك بدات ئەوا ئەڵێت ببە و زوو ئەو شتە ئەبێت ﴾.

بەپێی کتێبی جولەکە و گاورەکان خوای گەورە دوای ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد ئیسراحەتی کرد. وە کەسێك ئیسراحەت ئەکات کە ماندوو و شەکەت بووبێت، وە هێز و توانای ڕۆشتبێت. وە خوای گەورە زۆر دوورە لەو سیفەتە نزم و ناشرینانەوە. بەڵکو خوای گەورە بەو جۆرەیە کە لە قورئاندا وەسفی خۆی کردووە، بەتوانا و بەدەسەڵاتە و نە هیلاك ئەبێت و نە پێویستی بە ئیسراحەتە، وە

ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد و هیلاك نەبوو، وە دروستکردنی شتەکان لای ئەو بە فەرمانێکێتی و بفەرموێت ببە دەستبەجێ ئەو شتە ئەبێت.

دووەم/ سیفەتی خەفەتخواردن.

کتێبی پیرۆز:

– ورأى الرب أن شر الإنسان قد كثر على الأرض وأن كل ما يتصوره قلبه من أفكار إنما هو شر طوال يومه (٥) فندم الرب على أنه صنع الإنسان على الأرض وتأسف في قلبه (٦) (تكوين / ٦) وە پەروەردگار بینی کە خراپەی مرۆڤ زیادیکردووە و هەر شتێك بە دڵیدا بێت لە بیرکردنەوە ئەوا خراپەیە هەموو کاتێکی (٥) جا پەروەردگار پەشیمان بوو لەوەی مرۆڤی لەسەر زەوی دروستکردووە وە خەفەتبار بوو لە دڵیدا (٦).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي ٱلْأٓخِرَةِۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٧٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ

ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (١٧٧) وَلَا
يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ
إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ (١٧٨) مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ
عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ
وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ (١٧٩) وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ
ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ (١٨٠) لَّقَدۡ
سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ
وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ (١٨١) ذَٰلِكَ بِمَا
قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ (١٨٢) ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ
إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ
مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١٨٣) فَإِن
كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ
(١٨٤) كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن
زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ
ٱلۡغُرُورِ (١٨٥) لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ
ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ (١٨٦) (آل عمـران) موحەممـەد خەفـەت نـەخۆيت

لەوانەی پەلەی کفرکردنیانە، ئەوانە هیچ زەرەر بە خوا نادەن، خوا ئەیـەوێت هیچ پاداشتێکیان نـەبێت لـە قیامـەتا، وە سـزایەکی زۆر گـەورەیان هەیـە (١٧٦) ئەوانەی کە ئیمانیان گۆڕیوەتەوە بە کوفر هیچ زەرەر بە خـوا نـادەن وە سزایەکی بەئێشیان هەیە (١٧٧) وە بـا کـافران وانـەزانن کـە تەمـەنیان درێژئەکەین ئەوە خێر و چاکەیە بۆیان، بەڵکو تەمـەنیان ئـەدەینێ بۆئـەوەی زیـاتر تاوانبـاربن، وە سـزایەکی بێڕێزکـەریان هەیـە (١٧٨) خـوا واز لـە ئیمانـداران ناهێنێـت بـەم جـۆرەی ئێـوە لەسـەرین هـەتا پـیس لـە پـاك جیانەکاتەوە، وە خوا غەیبتان پێناڵێت، بەڵام خـوا لـە پێغەمبـەرانی کێـی بوێت هەڵیئەبژێرێت، جا ئیمان بـە خـوا و پێغەمبـەرەکانی بێـنن، وە گـەر ئیمان بێنن و لە خوا بترسن پاداشـتێکی گـەورەتان هەیـە (١٧٩) ئەوانـەی نابەخشن لەوەی خوا لە فەزڵی خۆی داونەتێ وانەزانن ئەو چروکییەیان بۆیـان چاکترە، بەڵکو ئەوە بۆیان زەرەرە، ئەوەی کە لێیان نەبەخشیوە لـە قیامـەتا ئەبێتە تەوقی گەردنیان، وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییە موڵکی خوایـە، وە خوا زانایە بەوەی ئەیکەن (١٨٠) خوا قسەی ئەوانەی بیسـت کـە وتیـان خوا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین، ئەوەی وتیان ئەینوسین وە ئەوەش ئەنوسـین کە پێغەمبەرانیان بە ناحەق کوشت، وە پێیانئەڵێین بچێژن ئاگری سـووتێنەر (١٨١) ئەمە بەهۆی ئەوەیە کە کردتان، وە خوای گەورە ستەم لە بەندەکانی

ناکـات (١٨٢) ئەوانـەی وتیـان خـوا پـەیمانی پێـداوین ئیمـان بـە هـیچ پێغەمبەرێك نەهێنین تا خێرێك نەکەین و ئاگرێك لەئاسمانەوە نەیەت خێرەکە بسوتێنێت، بلێ پێغەمبەران پێش من هاتن بۆلاتان بە بەلگە و بـەوەوە کـە وتتـان، ئـەی بۆچـی کوشـتتانن گـەر ڕاسـتگۆن (١٨٣) جـا گـەر تۆیـان بەدرۆخستەوە ئەوا پێش تۆ پێغەمبەران بەدرۆخراونەتەوە کە بەلگە و کتێـب و نوسراوی ڕوونیان هێنابوو (١٨٤) هـەموو نەفسـێك مـردن ئەچـێژێت، وە پاداشتەکانتان لە قیامەتا وەرئەگرنەوە، جا هەرکەس لە ئاگر دوورخرێتەوە و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بردوویەتییەوە، وە ژیانی دنیـا هـیچ نیـە جگـە لـە ڕابواردن و ئاواتێکی کەم (١٨٥) تاقیئەکرێنەوە لە سامان و نەفسـتاندا، وە لەوانەوە کە کتێبیان دراوەتێ پێش ئێوە و لە موشریکەکانەوە ئازارێکی زۆر ئەبیستن، جا گەر سەبر بگرن و لـە خـوا بترسـن ئائـەوە لـە کـارە جـددی و گرنگەکانە (١٨٦) ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ (٤١) سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ

أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ (٤٢) (المائدة) ئەی پێغەمبەر ئەوانەی پەلەی کوفریانە خەفەتبارت نەکەن لەوانەی بە دەم وتیان ئیمانمان هێناوە و دڵیان ئیمانی نەهێناوە، وە لە جوولەکەکانیش کە گوێ لە درۆی گەورەکانیان ئەگرن و گوێ لە کەسانێکی تریش ئەگرن کە نەهاتوون بۆ لات لە لوتبەرزییاندا، دەستکاری وشەکانی تەورات ئەکەن لەجێی خۆی، لای یەکتر ئەڵێن گەر ئەوەتان دەستکەوت لە پێغەمبەرەوە کە ئەتانەوێت ئەوا وەریبگرن، وە گەر نەتاندرایە وریا بن و مەیبەن، وە هەرکەسێ خوا بیەوێت گومڕای بکات ئەوا تۆ هیچت بەدەست نییە لە خواوە بۆی بکەیت، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نەیویستووە دڵیان پاکبکاتەوە، لە دنیادا سەرشۆڕن وە لە قیامەتا سزایەکی گەورەیان هەیە (٤١) ئەوانە گوێ لە درۆ ئەگرن ماڵی حەرام ئەخۆن، جا گەر هاتن بۆ لات حوکم بکە لە نێوانیان یان پشتیان تێ بکە، وە گەر پشتیان تێبکەیت هیچ زیانت لێنادەن، وە گەر حوکمت کرد بە دادپەروەری بیکە لە نێوانیان، بێ گومان خوا دادپەروەرانی خۆشئەوێت (٤٢) ﴾.

+ ﴿ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (يونس - ٦٥)
وە قسە و تانەکەیان خەفەتبارت نەکات، بێ گومان بالادەستی هەر بۆ خوایە، وە هەر ئەو زۆر بیسەر و زانایە ﴾.

+ ﴿ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحۡزُنكَ كُفۡرُهُۥٓۚ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (٢٣) نُمَتِّعُهُمۡ قَلِيلٗا ثُمَّ نَضۡطَرُّهُمۡ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٖ (٢٤) (لقمان) هەرکەس کوفر بکات کوفرەکەی دڵگرانت نەکات، گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە جا هەواڵیان ئەدەینێ لەبارەی ئەوەوە کە کردوویانە، بێ گومان خوا زانایە بە ناو دڵەکان (٢٣) کەمێك لە دنیادا ئەیانژیێنین ڕابوێرن، پاشان ناچاری سزایەکی توندیان ئەکەین (٢٤) ﴾.

+ ﴿ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ (٧) وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ (٨) (إبراهيم) وە پەروەردگارتان ڕایگەیاندووە گەر شوکرانەبژێر بن بۆتان زیادئەکەم، وە گەر کوفر و ناشکوری بکەن ئەوا سزام قورسە (٧) وە موسا وتی گەر ئێوە و هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین کوفر بکەن ئەوا خوا دەوڵەمەند و سوپاسکراوە (٨) ﴾.

+ ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا (١٣٢) إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا (١٣٣)

(النساء) وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی خوایە، وە خوا بەسە پشت و پەنا بێت (١٣٢) گەر بیەوێت لەناوتانئەبات و کەسانێکی تر دێنێتە جێتان، وە خوا توانای ئەوەی هەیە (١٣٣) ﴾.

+ ﴿ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ (يس - ٧٦) جا قسەکەیان خەمبارت نەکات، ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە ئەیشارنەوە و دەریئەخەن ﴾.

+ ﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (آل عمران - ١٣٩) وە لاواز و بێدەسەلات مەبن و خەفەت مەخۆن هەر ئێوە بالادەستن گەر ئیماندار بن ﴾.

+ ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (التوبة - ٤٠) گەر پێغەمبەر سەرنەخەن ئەوا خوا سەریخست کاتێك کافران دەریانکرد یەکێك بوو لە دووانەکە، کاتێك لە ئەشکەوتەکەدا بوون بە هاوەڵەکەی وت خەفەت مەخۆ خوا لەگەڵمانە، جا خوا ئارامی دابەزاندە سەری، وە پشتیوانیکرد بە سەربازانێك نەبینران، وە

قسەی کافرانی ژێرخست وە قسەی خوای بڵند کرد، وە خوا بە عیززەت و کاربەجێیە ﴾.

+ ﴿ وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗاۖ وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ (العنكبوت - ٣٣) وە کاتێك نێردراوەکانمان چوون بۆ لای لوط پێیناخۆشبوو وە زۆر دڵتەنگ بوو پێیان، وە پێیان وت مەترسە و خەمبار مەبە، ئێمە تۆ و کەسوکارت ڕزگارئەکەین جگە لە ئافرەتەکەت ئەو لەناو سزاکە ئەمێنێتەوە ﴾.

بەپێی کتێبی جولەکە و گاورەکان خوای گەورە دوای ئەوەی بینی ئینسانەکان خراپەکارن لەسەر زەویدا خەفەتی خوارد. وە خەفەت سیفەتی نوقسانییە و کەسێك کە خۆی نەگرێت لەبەرامبەر ناڕەحەتیدا و بێ دەسەڵات و لاواز بێت و چواردەوری کاری لەسەربکات خەفەتئەخوات. وە ئەوە زۆر دوورە لە خوای گەورەی بەدەسەڵات و بەهێز و بێ نوقسانییەوە. بەڵکو خوای گەورە هیچ ناڕەحەتی و قورسییەکی توشنابێت لە بنەڕەتەوە، وە ئەوە خوایە کار لە مەخلوقات ئەکات و بەڕێوەیان ئەبات. وە لەناو مرۆڤەکاندا ئەوەیان باشترە کە خەفەت ناخوات و سەبر ئەگرێت لەسەر ناڕەحەتی و بەڵاکان، ئیتر چۆن ئەو سیفەتە ناشرینە لە خوای گەورەدا

هەبێت کە دەسەڵاتی ڕەهایە و هەموو شتێك بەدەست خۆیەتی سبحانە وتعالی؟ وە هەر بۆیەشە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ئەفەرموێت صلی الله علیە وسلم خەفەت نەخوات چونکە گەر مرۆڤ لەڕووی نەفسەوە بەهێز بێت و خوایەکی بەهێز بە پشت و پەنای بزانێت خەفەت ناخوات. وە گەر ئیمانداران بتوانن خەفەت نەخۆن و زاڵ بن بەسەر نەفسیاندا، ئیتر خوای گەورە چۆن خەفەت ئەخوات؟ وە لە قورئاندا خوای گەورە بە عیززەت و بێ باکییەوە باسی کوفر و سەرپێچی مرۆڤ ئەکات و هیچ خەفەتیان لێناخوات، بەڵکو وەعدی سزا ئەدات بە سەرپێچیکاران. وە ئەفەرموێت گەر هەموو خەڵك کوفر بکەن هیچ زەرەرێکی پێناگات، وە گەر بیەوێت هەموو ئەم دروستکراوانە لەناوئەبات و هی تر دروستئەکات لەجێیان.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە قورئاندا خوای گەورە زانیویەتی کە مرۆڤ خراپە ئەکات لە زەویدا بەر لەوەی دروستیان بکات، نەوەك دواتر بۆی دەرکەوتبێت (البقرة - ٣٠).

سێیەم/ بێ دەسەڵاتی و بێ توانایی.

کتێبی پیرۆز:

— وبقي يعقوب وحده (٢٤) فصارعه رجل إلى طلوع الفجر. ورأى أنه لا يقدر عليه، فلمس حق وركه، فانخلع حق ورك يعقوب في مصارعته له (٢٥) وقال:

(( اصرفني، لأنه قد طلع الفجر )). فقال يعقوب: (( لا أصرفك أو تباركني )) (٢٦) فقال له: (( ما اسمك؟ )) قال: (( يعقوب )) (٢٧) قال: (( لا يكون اسمك يعقوب فيما بعد، بل إسرائيل، لأنك صارعت الله والناس فغلبت )) (٢٨) وسأله يعقوب قال: ((عرفني اسمك )). فقال: (( لم سؤالك عن اسمي؟ ))، باركه هناك (٢٩) وسمى يعقوب المكان فنوئيل قائلا: (( إني رأيت الله وجها إلى وجه، ونجت نفسي )) (٣٠) (تكوين / ٣٢) وە یەعقوب بەتەنیا مایەوە (٢٤) جا پیاوێك تا بەرەبەریان شەڕی لەگەڵکرد. وە بینی دەرەقەتی یەعقوب نایەت لەلای سەرەوەی ئێسکی ڕانی دا، وە ڕانی یەعقوب لە زۆرانبازییەکەدا لەجێ چوو (٢٥) وە وتی: ((بەرمەدە، وا بەرەبەیان دەرکەوت)). جا یەعقوب پێی وت: ((بەرتنادەم تا بەرەکەتدارم نەکەیت)) (٢٦) پێی وت: ((ناوت چییە؟)) وتی: ((یەعقوب)) (٢٧) وتی: ((لەمەودوا ناوت یەعقوب نییە، بەڵکو ئیسرائیل، چونکە لەگەڵ خودا و مرۆڤدا زۆرانت کرد و سەرکەوتیت)) (٢٨) یەعقوب پێی وت: ((ناوتم پێ بڵێ)). وتی: ((بۆچی پرسیاری ناوم ئەکەیت))، ئیتر لەوێ بەرەکەتداری کرد (٢٩) وە یەعقوب ناوی ئەو جێیەی نا فەنوئیل و وتی: ((من خوام ڕووبەڕوو بینی و بە سەلامەتی دەرچووم)) (٣٠).

– واستولى يهوذا على غزة وأرضها وأشقلون وأرضها وعقرون وأرضها (١٨) وكان الرب مع يهوذا، فورث الجبل. أما سكان السهل فلم يطردوهم، لأنهم كانت لهم مركبات من حديد (١٩) (القضاة / ١) وە یەهوزا دەستی بەسەر غەززە و زەوییەکەیدا گرت وە هەروەها ئەشقەلۆن و زەوییەکەی وە عەقرۆن و زەوییەکەی (١٨) وە خوا لەگەڵ یەهوزادا بوو، جا ناوچە شاخاوییەکە بووە موڵکیان، بەڵام نەیانتوانی دانیشتووانی دەشتاییەکان دەربکەن، چونکە گالیسکەی ئاسنیان هەبوو (١٩).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةًۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا (فاطر - ٤٤) ئایا بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون وە سەیربکەن عاقیبەتی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بوو وە زۆر بەتواناتر بوون لەمان، وە هیچ شتێك نییە خوا لێی عاسی ببێت لە ئاسمانەکان و زەوی، ئەو زۆر زانا و بەتوانایە ﴾.

+ ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ (٢٨) وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ (٢٩) (الأنبياء) خوا ئەزانێت پێشتر چییان کردووە و دواتر چی ئەکەن، وە شەفاعەت بۆ کەس ناکەن مەگەر کەسێك خوا لێی ڕازیبێت، وە فریشتەکان لە خوا ئەترسن (٢٨) وە هەر فریشتەیەك لەوانە بڵێت من خوام ئەوا سزای ئەدەین بە جەهەننەم، ئاوها پاداشتی زاڵمان ئەدەینەوە (٢٩) ﴾.

+ ﴿ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ (٦١) ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ (٦٢) قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ (٦٣) قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ (٦٤) قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ (٦٥) (الأنعام) وە خوا باڵادەستە بەسەر عەبدەکانییەوە، وە مەلائیکەت ئەنێرێ بۆتان کردەوەکانتان ئەنوسێت، تا مردن ئەگات بە یەکێکتان مەلائیکەتەکانمان ڕۆحی ئەکێشن و ئەوان

کەمتەرخەمی ناکەن (٦١) پاشان ئەگەڕێنرێنــەوە بــۆ لای خــوای حــەقیان، حوکم هەر بۆ خوایە و ئەو خێراتــرین لێپرســینەوە ئــەکات (٦٢) بڵــێ کــێ ڕزگارتان ئەکات لە تاریکاییــەکانی وشــکانی و دەریــا هــاواری ئەکــەن بــە ملکەچی و نهێنی، کە گەر لەمە ڕزگارمان بکات لە سوپاســگوزاران ئــەبین (٦٣) بڵێ خوا ڕزگارتان ئەکات لێی وە لە هەموو ناخۆشییەك پاشــان ئێــوە شــەریکی بــۆ دائــەنێن (٦٤) بڵــێ ئــەوە خوایــە ئــەتوانێت لــە ســەرتانەوە سزایەکتان بۆ بنێرێت یان لەژێر پێتانــەوە یــان کۆمــەڵ کۆمــەڵتان بکــات و هەندێکتان بەسەر ئەوی ترا زاڵ بکات، سەیربکە چۆن بەڵگەکانیان بــۆ ڕوون ئەکەینەوە بەڵکو تێبگەن (٦٥) ﴾.

+ ﴿ ثُمَّ نَظَرَ (٢١) ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ (٢٢) ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ (٢٣) فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ (٢٤) إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ (٢٥) سَأُصْلِيهِ سَقَرَ (٢٦) وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ (٢٧) لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ (٢٨) لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ (٢٩) عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ (٣٠) (المدثر) پاشــان تەماشــایکرد (٢١) پاشــان ناوچەوانی گرژکرد و ڕووی ناشرینکرد (٢٢) پاشان پشتیهەڵکرد لــە حــەق و خۆی بە گەورە زانی (٢٣) وە وتی ئەم قورئانە سیحرە و لە خەڵك وەرگــیراوە (٢٤) ئەمە تەنها قسەی مرۆڤە (٢٥) ئەیخەمە سەقەرەوە لەسەر ئەو قســانە (٢٦) تۆ چۆن ئەزانی سەقەر چییە (٢٧) هیچ شــتێك نــاهێڵێ لــە پێســت و

گۆشت (٢٨) دەرئەکەوێت بۆ خەڵك (٢٩) نۆزدە مەلائیکەتی لەسەرە (٣٠)

.

+ ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا (١٥) وَأَكِيدُ كَيْدًا (١٦) فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا (١٧) (الطارق) کافران نەخشە دائەنێن (١٥) منیش نەخشە دائەنێم (١٦) جا مۆڵەتی کافران بدە ماوەیەکی کەم مۆڵەتیان بدە (١٧) ﴾.

+ ﴿ وَقَالُوا۟ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ (١٣٢) فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ (١٣٣) وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ۖ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ (١٣٤) فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ (١٣٥) فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ (١٣٦) وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ (١٣٧) (الأعراف) وە وتیان هەرچی ئایەتێکمان بۆ بێنیت تا چاوبەستمان لێبکەیت ئیمانت پێناهێنین (١٣٢) جا تۆفانمان ناردە سەریان، وە کوللە، وە ئەسپێ، وە بۆق، وە ئاوەکانمان کردن بە خوێن، هەموو وەك نیشانەی ڕوون، بەڵام خۆیان بەگەورە

زانی و کەسانێکی خراپەکار بوون (١٣٣) وە کاتێك سزاکە کەوتە سەریان وتیان موسا هاواری خواکەتمان بۆ بکە بەو بەڵێنەی پێتی داوە، گەر ئەم سزایەمان لەسەر لابەی ئیمانت پێ دێنین و بەنی ئیسرائیلیشت لەگەڵدا ئەنێرین (١٣٤) جا کاتێك سزاکەمان لەسەر لابردن تا کاتێکی دیاریکراو ئەوان بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوە (١٣٥) جا تۆڵەمان لێیانکردەوە وە نوقممانکردن لەناو دەریاکەدا لەبەرئەوەی نیشانەکانیان بەدرۆخستینەوە و بێ ئاگابوون لێی (١٣٦) وە ئەو قەومەش کە ئەچەوسێنرانەوە لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای زەویدا کردمانن بە جێنشینی جێیە بەرەکەتدارەکە، وە وشەی جوانی خوا بەسەر بەنی ئیسرائیلدا جێبەجێ بوو بەهۆی ئارامگرتنەکەیان، وە ئەوەی فیرعەون و قەومەکەی ئەیانکرد و خانوو و باخەکانیانمان تێکدا (١٣٧) ﴾.

+ ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا (١٦) وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا (١٧) (الإسراء) وە گەر بمانەوێت شارێك لەناوبەبەین فەرمان بە گەورەکانیان ئەکەین بە تەوحید بەڵام خراپە و شیرکی تیا ئەکەن، جا ئەوکاتە فەرمان بەسەریاندا جێبەجێ ئەبێت و لەناویان

ئەبەین (١٦) وە چەندەها میللەتمان لەناوبرد لە دوای نوح، وە بەسە کە پەروەردگارت زانا و بینایە بە تاوانی عەبدەکانی (١٧) ﴾.

+ ﴿ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا (٣٤) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلۡنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرٗا (٣٥) فَقُلۡنَا ٱذۡهَبَآ إِلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرۡنَٰهُمۡ تَدۡمِيرٗا (٣٦) وَقَوۡمَ نُوحٖ لَّمَّا كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ أَغۡرَقۡنَٰهُمۡ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ لِلنَّاسِ ءَايَةٗۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا (٣٧) وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَأَصۡحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونَۢا بَيۡنَ ذَٰلِكَ كَثِيرٗا (٣٨) وَكُلّٗا ضَرَبۡنَا لَهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَۖ وَكُلّٗا تَبَّرۡنَا تَتۡبِيرٗا (٣٩) وَلَقَدۡ أَتَوۡاْ عَلَى ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِيٓ أُمۡطِرَتۡ مَطَرَ ٱلسَّوۡءِۚ أَفَلَمۡ يَكُونُواْ يَرَوۡنَهَاۚ بَلۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ نُشُورٗا (٤٠) وَإِذَا رَأَوۡكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا (٤١) إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا لَوۡلَآ أَن صَبَرۡنَا عَلَيۡهَاۚ وَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ حِينَ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ مَنۡ أَضَلُّ سَبِيلًا (٤٢) (الفرقان) ئەو کافرانەی لەسەر ڕوویان ڕائەکێشرێن بەرەو جەهەننەم ئەوانە خراپترین جێگایان هەیە وە لە هەموو کەس گومڕاترن (٣٤) وە تەوراتمان دا بە موسا، وە لەگەڵیدا هارونمان کرد بە یارمەتیدەری (٣٥) جا پێمان وتن بچن بۆلای ئەو قەومەی کە موعجیزەکانیان بەدرۆخستینەوە، وە لەناومانبردن (٣٦) وە قەومی نوح کاتێك پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە نوقممان کردن، وە کردمانن

بە پەند بۆ خەڵك، وە بـۆ زاڵمـان سـزای بەئێشـمان ئامـادەکردووە (٣٧) وە قەومی عاد و ثەمود و هاوەڵانی بیرەکە وە چەندەها ئوممەتی تر لەم نێوانـەدا (٣٨) وە هـەموو ئەمانـە بەڵگـەمان بـۆ هێناونەتـەوە، وە هـەموویانمان لەناوبردووە (٣٩) وە خـەڵکی مەککـە بەسـەر ئـەو شـارەدا تێپـەڕیون کـە بـەردباران کـران، ئایـا شـوێنەوارەکە نـابینن، بـەڵکو ئـەوان بەتـەمای زیندووبوونەوە نین (٤٠) وە کاتێك بتبینن گاڵتەت پێئەکەن ئەڵێن ئائەمەیـە خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر (٤١) نزیك بوو گومڕامان بکات لە خواکانمـان گەر سەبرمان نەگرتایە، وە کاتێك سزایان بـۆ دێـت ئـەزانن کـێ ڕێگاکـەی گومڕا بوو (٤٢) ﴾.

+ ﴿ ثُمَّ دَمَّرۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ (١٧٢) وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلۡمُنذَرِينَ (١٧٣) (الشعراء) پاشان ئەوانەی تریشمان لەناوبرد (١٧٢) وە بـەردبارانمان کردن، جا خراپترین بەردباران بوو (١٧٣) ﴾.

+ ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ (٥٠) فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ (٥١) فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ (٥٢) (النمـل) وە ئـەوان نەخشـە و پلانیان دانا و ئێمەش نەخشەمان دانا و هەسـتیان پێمـان نـەکرد (٥٠) جـا بڕوانە سەرئەنجامی پلانەکەیان چی بوو، ئێمە ئەوان و قەومەکەیانمان هەموو

لەناوبرد (٥١) ئائەوە ماڵەکانیانە چۆڵە بەهۆی زوڵمیانەوە، بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە بۆ قەومێك بزانن (٥٢) ﴾.

+ ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْۖ وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا (١٠) ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ (١١) إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ (١٢) وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ (١٣) (محمد)

ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون ببینن عاقیبەتی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بوو، خوا لەناویبردن، وە هاوشێوەی ئەوە بۆ کافرانیش هەیە (١٠) لەبەرئەوەی خوا پشتیوانی ئەوانەیە ئیمانیان هێناوە، وە کافران پشتیوانیان نییە (١١) خوا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوەی چاکیان هەیە ئەخاتە بەهەشتێکەوە بەژێریا ڕووبار ئەڕوات، وە ئەوانەی کوفریانکردووە چێژئەبینن و ئەخۆن وەك ئاژەڵ ئەخوات وە ئاگر جێیانە (١٢) وە شاری تر هەبووە لە شارەکەی تۆ بەهێزتر بووە کە دەریانکردیت لەناومانبردن و هیچ سەرخەرێکیان نەبوو (١٣) ﴾.

+ ﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ (فصلت - ١٦) جا بایەکی وشك و ساردمان ناردە سەریان لە چەند ڕۆژێکی بەردەوامدا تا سزای سەرشۆڕییان پێبچێژین لە ژیانی دنیادا، وە سزای ڕۆژی دوایی ڕسواکەرترە و ئەوان سەرناخرێن ﴾.

+ ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ (٧٣) فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ (٧٤) (الحجر) جا لە خۆرهەڵاتندا دەنگە بەرزەکە لەناویبردن (٧٣) جا شارەکەمان ژێرەوژوور کرد، وە بەردبارانمان کردن بە بەردێك لە قوڕی سورەوکراوە (٧٤) ﴾.

+ ﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِنۡهُمۡ وَأَشَدَّ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ (٨٢) فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٨٣) فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ (٨٤) فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ (٨٥) (غافر) ئایا بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون ببینن عاقیبەتی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بوو، لەمان زۆرتر و بەهێزتربوون و زەوییان ئاوەدانتر کردبووەوە،

بـەڵام ئـەوەی دەسـتیانکەوتبوو سـوودی بۆیـان نـەبوو (٨٢) جـا کاتێـك پێغەمبەرانیان بە بەڵگەوە هـاتن بـۆ لایـان بـەو زانسـتە دڵخۆشـبوون کـە لایانبوو، وە ئەو سزایە گرتنیـەوە کـە گاڵتـەیان پێئـەکرد (٨٣) وە کاتێـك سزاکەمانیان دی وتیان باوەڕمان بـە خـوا هەیـە بەتـەنیا و کـافرین بـەوەی کردبوومان بە شەریکی (٨٤) بەڵام ئیمانیان سـوودی بۆیـان نـەبوو کاتێـك سزاکەمانیان بینی، ئەمە سوننەتی خوایە کە لەناو بەندەکانیـدا وابـووە، وە لەوێدا کافران دۆڕان (٨٥) ﴾.

+ ﴿ قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ (٣١) قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ (٣٢) لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ (٣٣) مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُسۡرِفِينَ (٣٤) فَأَخۡرَجۡنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٣٥) فَمَا وَجَدۡنَا فِيهَا غَيۡرَ بَيۡتٖ مِّنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ (٣٦) وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ (٣٧) وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ (٣٨) فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ (٣٩) فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ (٤٠) وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ (٤١) مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ (٤٢) وَفِي ثَمُودَ إِذۡ قِيلَ لَهُمۡ تَمَتَّعُواْ حَتَّىٰ حِينٖ (٤٣) فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمۡ يَنظُرُونَ (٤٤) فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مِن قِيَامٖ وَمَا كَانُواْ مُنتَصِرِينَ (٤٥)

وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ (٤٦) (الذاريات) ئیبراهیم وتی بۆچی هاتوون ئەی نێردراوانی خوا (٣١) وتیان ئێمە بۆ قـەومێکی تاوانبـار نێردراوین (٣٢) تا لە ئاسمانەوە بەردبارانیان بکـەین بـە بـەردی قـوڕ (٣٣) بەردەکان نیشانکراون لە پەروەردگارتەوە بـۆ زیادەڕەوەکـان (٣٤) جـا هـەر ئیمانـدارێکی تیـابوو دەرمـانکرد (٣٥) وە لـەناو قەومەکـەدا یـەك مـاڵی موسوڵمان نەبێت تیای نەبوو (٣٦) وە لەو قەومەدا نیشانەیەکمان جێهێشت بۆ ئەوانەی لە سزای بەئێش ئەترسن (٣٧) وە لە موساشدا کـە ناردمـان بـۆ فیرعەون بە بەڵگەی ڕوون (٣٨) فیرعەون پشتیتێکرد و ڕوویکردە سـوپاکەی (٣٩) جا خۆی و سەربازەکانیمان برد و خستماننە دەریاکەوە و لۆمە ئـەکرێ لەسەر کوفرەکەی (٤٠) وە لە عادیشـدا کاتێـك بایـەکی بێخێرمـان نـاردە سـەریان (٤١) بەسـەر هیچـدا تێنەئەپـەڕی ئـیللا ئەیڕزانـد (٤٢) وە لـە ثەمودیشدا کە پێیانوترا ڕابوێرن تا کاتی لەناوچوونتان (٤٣) جا سەرکەشـی فەرمانی پەروەردگاریان کـرد، جـا دەنگەکـە لـەناویبردن و بەچـاوی خۆیـان بینیان (٤٤) وە توانای هەستانەوەیان نەبوو وە سەرکەوتوو نـەبوون (٤٥) وە قەومی نوحیش پێشتر لەناومانبردن بەڕاستی قـەومێکی دەرچـوو بـوون لـە گوێرایەڵی خوا (٤٦) ﴾.

+ ﴿ وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ (الأنبياء - ٤٦) وە گەر کەمترین سزای خوا بەریانکەوێت ئەڵێن هاوار و تیاچوون بۆ ئێمە بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین ﴾.

+ ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (الأعراف - ١٤٣) وە کاتێك موسا هات بۆ مەوعیدی دیاریکراومان و خوا قسەی لەگەڵکرد، وتی خوایە ڕێگام بدە بتبینم، فەرمووی نامبینیت، بەڵام سەیری شاخەکە بکە گەر لەجێی خۆی مایەوە ئەوا ئەمبینیت، جا کاتێك پەروەردگاری خۆی بۆ شاخەکە دەرخست کردی بە خۆڵ و موساش لەهۆش خۆی چوو، وە کاتێك بەئاگاهاتەوە وتی پاکی و بێگەردی بۆ تۆ گەڕامەوە بۆ لات وە من یەکەم باوەڕدارم ﴾.

+ ﴿ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ (٤٧) (الحاقة) وە گەر ئەم پێغەمبەرە هەندێك قسە بەناومانەوە بکات لەخۆیەوە (٤٤) ئەوا بەدەستی ڕاست ئەیبەینەوە (٤٥) پاشان شادەماری ئەپچڕێنین (٤٦) وە هیچ کام لە ئێوە نییە ڕێگر و بەربەست بێت بۆی لە سزامان (٤٧) ﴾.

بەپێی دەقەکانی کتێب خوا زۆرانبازی لەگەڵ مەخلوقێکیا ئەکات و پێی ناوێرێت و ئەدۆڕێت. بەڵکو خوا داوا لە مەخلوقەکەی ئەکات کە وازیلێبێنێت و لێیگەڕێت بڕوات. وە هەروەها خوا نەیتوانی قەومێك دەرکات چونکە گالیسکەی ئاسنیان هەبووە. وە لە قورئانی پیرۆزدا سەرجەم مەخلوقات لە خوای گەورە ئەترسن سبحانه وتعالى. وە خوای گەورە توانای هەموو شتێکی هەیە و هیچ شتێك لە دەسەڵاتی خوا دەرناچێت لە ئاسمانەکان و زەوی. وە خوای گەورە خاوەن سزای توندە کە ناگێڕدرێتەوە، وە هەر کەس و قەومێك تەحەدای خوایان کردبێت خوا لەناویبردوون و سزای بۆ ناردوون، وە کەس نەجاتی نەبووە مەگەر ئەوەی خوا خۆی ویستبێتی. وە گەر عەبدەکان نەتوانن خوای گەورە ببینن و بەرگەی تەنها بینینیشی نەگرن (الأعراف - ١٤٣)، (خروج ٣٣/ ٢٠) ئیتر چۆن کەسێك ئەتوانێت شەڕی خوای گەورە بکات و لێی بباتەوە؟

چوارەم/ خۆناساندن و ناوپێدان.

کتێبی پیرۆز:

- وسأله يعقوب قال: ((عرفني اسمك )). فقال: (( لم سؤالك عن اسمي؟ )) (تكوين ٣٢/ ٢٩) وە یەعقوب داوایلێکرد وتی: (ناوتم پێ بڵێ). وتی: (بۆچی پرسیارت دەربارەی ناومە؟).

- فقال موسى لله: (( ها أنا ذاهب إلى بني إسرائيل، فأقول لهم: إله آبائكم أرسلني إليكم. فإن قالوا لي: ما اسمه، فماذا أقول لهم؟ )) (١٣) فقال الله لموسى: (( أنا هو من هو )). وقال: (( كذا تقول لبني إسرائيل: أنا هو أرسلني إليكم )) (١٤) (خروج / ٣) جا موسا بە خوای وت: (ئەوە من بۆ بەنی ئیسرائیل ئەچم، وە پێیان ئەڵێم: خوای باوانتان بۆتانی ناردووم. جا گەر پێمیان وت: ناوی چییە؟ چییان پێبڵێم؟) (١٣) خواش بە موسای وت: (من هەم ئەوەی کە هەم). وە وتی: (ئاوا بە بەنی ئیسرائیل دەڵێیت: من ئەو ناردوومی بۆتان) (١٤).

- وكلم الله موسى وقال له: (( أنا الرب (٢) أنا الذي ترائيت لإبراهيم وإسحق ويعقوب إلها قديرا، وأما اسمي (( الرب )) فلم أعلمهم به (٣) (خروج / ٦) وە خوا قسەی لەگەڵ موسا کرد و پێی وت: (من پەروەردگارم (٢) منم کە

بۆ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب دەرکەوتم وەك خوایەکی بەتوانا، بەڵام ناوەکەم (پەروەردگار) ئەوا پێم نەوتوون (٣).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ (طه - ١٤) منم الله هیچ خوایەکی حەق نییە جگە لە من جا بمپەرستە وە نوێژ بکە بۆئەوەی یادی منت بکەوێتەوە ﴾.

+ ﴿ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ (الشورى - ١٥) وە بڵێ باوەڕم بە هەموو ئەو کتێبانەیە کە خوا دایبەزاندوون، وە فەرمانپێکراوە لەنێوانتان دادپەروەری بکەم، الله پەروەردگاری ئێمە و ئێوەیە، ئێمە کردەوەی خۆمان بۆ هەیە و ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ هەیە، هیچ مشتومڕێك نییە لەنێوان ئێمە و ئێوەدا، الله کۆمانئەکاتەوە لە قیامەتدا و سەرئەنجام هەر بۆ لای ئەوە ﴾.

+ ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ (٢) (الإخلاص) بڵێ الله تاقانەیە (١) الله هەمیشە زیندووە و هەمووان موحتاجین (٢) ﴾.

+ ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ (٢٢) هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (٢٣) هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (٢٤) (الحشر) الله ئەو خوایەیە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە غەیری ئەو، زانای نهێنی و ئاشکرایە، ئەوە بەسۆز و میهرەبان و بەرەحم (٢٢) ئەو الله یە کە هیچ خوایەکی حەق نییە جگە لەو پاشایە پاکە لە گشت نوقسانییەك پارێزراوە لە کەموکورتی ئاسایشی داوە بە بەندەکانی لە زوڵم چاودێر و شایەتە بالادەستە لەوپەڕی دەسەلات و تواناداییە گەورەیە لە هەرشتێك شایەنی نەبێت، پاکی بۆ الله لەو شەریکانەی بۆی دائەنێن (٢٣) ئەو الله یە بەدیهێنەرە ئەو شتەی تەقدیری کردووە ئەیهێنێتە بوون وێنەکێشە، ناوە جوانەکانی هەیە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییە زیکری ئەکەن وە ئەوە بالادەست و کاربەجێ (٢٤) ﴾.

+ ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (الأعراف - ١٨٠) وە الله ناوە جوانەکانی هەیە جا بەوانە هاواری بکەن، وە لەوانە بگەڕێن کە بێباوەڕن بە ناوەکانی، ئەوانە سزای ئەوە ئەدرێن کە ئەیکەن لە لەڕێ لادان ﴾.

+ ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ (الإسراء - ١١٠) بڵێ هاواری الله یان ڕەحمان بکەن، لە هەرکامیان بپاڕێنەوە ئەوا خوا ناوە جوانەکانی هەیە ﴾.
+ ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ (طه - ٨) الله ئەو خوایەیە کە هیچ خوایەکی حەق نییە جگە لەو، ناوە جوانەکانی هەیە ﴾.

لە کتێبدا خوا خۆی ناناسێنێت و ناوی خۆی نادات بە عەبدەکانی، بەڵکو گەر بشپرسن ناوی چییە هەر نایڵێت. بەڵام خوای گەورە سبحانە وتعالی لە قورئاندا خۆی ئەناسێنێت و ناوی خۆی بە بەندەکانی ئەڵێت تا بیناسن و هاواری بکەن. وە نەك تەنها یەك ناو بەڵکو دەیان ناوی خۆی بە بەندەکانی ئەڵێت تاوەکو بەوانە بانگی بکەن و ئەویش سبحانە وتعالی وەڵامیان بداتەوە.

وە هەر ناوێکی خوای گەورە سبحانە سیفەتێك لە سیفەتە بەرزەکانی لەخۆ ئەگرێت، کە هەر یەکێکیان گونجاوە بۆ حاڵەتێك تا هاواری خوای گەورەی پێ بکەین. بۆنموونە: یا ڕەحمان (میهرەبان) ڕەحممان پێ بکە، ئەی ڕەززاق (ڕزقدەر) ڕزقمان پێ ببەخشە، ئەی غەفور (لێبوردە) لە تاوانمان ببورە. وە گەر ناوی خوامان

نەزانی چۆن بانگی بکەین و هاواری بکەین؟ وە ئایا گونجاوترە و شایستەترە بە جێناو بانگی خوای گەورە بکەین یان بە ناوی خۆی؟

پێنجەم/ لەبیرچوون و نەزانین.

کتێبی پیرۆز:

- ويكون أنه إذا غيمت على الأرض وظهرت القوس في الغمام (١٤) ذكرت عهدي الذي بيني وبينكم وبين كل نفس حية في كل جسد (١٥) (تكوين / ٩) ئینجا هەرکات هەور بەسەر زەویدا هات و پەلکەزێڕینە لە هەوردا دەرکەوت (١٤) پەیمانەکەی نێوان من و ئێوە و هەر نەفسێکی زیندوو لە هەموو جەستەیەکدام بیرئەکەوێتەوە (١٥).
- وقد سمعت أيضا أنين بني إسرائيل الذين استعبدهم المصريون، فذكرت عهدي (خروج ٦/ ٥) وە هاواری بەنی ئیسرائیلیشم بیست ئەوانەی میسرییەکان بەکۆیلەیانکردبوون، جا پەیمانەکەم بیرکەوتەوە.
- فنادى الرب الإله الإنسان وقال له: ((أين أنت؟ )) (تكوين ٣/ ٩) جا پەروەردگاری یەزدان بانگی ئینسانی کرد و پێی وت: (تۆ لەکوێیت؟).

- فكان كلام الرب إلى صموئيل قائلا: (١٠) "إنـي قـد نـدمت علـى إقـامتي شاول ملكا، لأنه ارتد عن اتباعي ولم يعمل بأمري" (١١) (صموئيل الأول / ١٥) جا وتەی پەروەردگار ڕووەو ساموێل بوو وتی: (١٠) "من پەشیمانم کە شاولم کرد بە پاشا، چونکە هەڵگەڕایەوە لـە شـوێنکەوتنم و کارینـەکرد بـە فەرمانم" (١١).
- فقال له: (( ما اسمك؟ )) قـال: (( يعقـوب )) (٢٧) قـال: (( لا يكـون اسمـك يعقوب فيما بعد، بل إسرائيل، لأنك صـارعت الله والنـاس فغلبـت )) (٢٨) (تكوين / ٣٢) پێی وت: (ناوت چییە؟) وتی: (یەعقوب) (٢٧) وتی: (ناوت یەعقوب نییە لەمەودوا، بەڵکو ئیسرائیل، چونکە زۆرانـی خـوا و خـەڵکت کرد و سەرکەوتیت) (٢٨).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا (مريم - ٦٤) وە پەروەردگارت هیچی بیرناچێت ﴾.
+ ﴿ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى (طه - ٥٢) وتی زانستی ئەو بابەتە لای پەروەردگارمە لـە پەڕاوێکـدا نوسـراوە، خـوای گەورە شت ون ناکات و بیریناچێت ﴾.

+ ﴿ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًا (الأنعام - ٨٠) زانست و زانینی پەروەردگارم هەموو شتێکی گرتووەتەوە ﴾.

+ ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ (الحديد - ٤) ئەوە خوایە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکرد پاشان بەرزبووەوە لەسەر عەرش، ئەزانێت چی بەناو زەویدا ئەچێت و چی لێوە دەردێت، وە چی لە ئاسمانەوە دائەبەزێت و چی تیایدا بەرزئەبێتەوە، وە ئەو لەگەڵتانە لە هەرجێیەك بن، وە خوا بەوەی ئەیکەن بینەرە ﴾.

+ ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٖ وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٖ وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا إِذۡ تُفِيضُونَ فِيهِۚ وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ (يونس - ٦١) وە لە هەر حاڵێکدا بیت یان کە قورئان بخوێنیت وە هیچ کارێك ناکەن ئیللا ئێمە چاودێر و شاهیدین کاتێك پێوەی خەریکن، وە لە پەروەردگارت ون نابێت هێندەی مێرولەیەکی بچووك نە لە زەوی وە نە لە ئاسمان، وە لەوە بچوکتر وە لەوە گەورەتریش و هەمووی لە کتێبی ئاشکرادا نوسراوە ﴾.

+ ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢٧) بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ (٢٨) (الأنعام) وە کاتێک ئەبینیت کە ئەوان لەسەر جەهەننەم ڕائەگیرێن جا ئەڵێن خۆزگە بگەڕێندرایناینەتەوە و ئایەتەکانی پەروەردگارمان بەدرۆنەخستایەتەوە و لە ئیمانداران بووینایە (٢٧) بەڵکو ئەو حەقەیان بۆ دەرکەوت کە پێشتر ئەیانشاردەوە، وە گەر بگەڕێنرێنەوە ئەوا ئەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی حەرامکرابوو لێیان وە درۆزنن لەو بانگەشەیەیاندا (٢٨) ﴾.

+ ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ (النمل - ٦٥) بڵێ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە غەیب و داهاتوو نازانێت جگە لە الله، وە ئەوانەی بانگەشەی غەیب ئەکەن نازانن خۆیان کەی خوا زیندوویانئەکاتەوە ﴾.

بەپێی دەقەکانی کتێب بێت خوا پێویستی بە بینینی مەخلوقێکێتی تا ئەو پەیمانەی بیرکەوێتەوە کە لەنێوان خۆی و مرۆڤدا هەیەتی. وە خوا پەیمانەکەی بیرچووبووەوە و تا گوێی لە هاوار وناڵەی عەبدەکانی نەبوو بیری نەکەوتەوە. وە

خوا نەیزانی ئادەم لەکوێی بەهەشتدا خۆی شاردووەتەوە. وە نەیزانی کە عەبدێکی خراپ دەرئەچێت لە دوارۆژدا دوای ئەوەی هەڵیبژراد و کردییە پاشا. وە خوا نەیزانی ناوی ئەو مرۆڤە چییە کە زۆرانبازی لەگەڵ ئەکات.

بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە زانستی ڕەهای هەیە، هەموو ئەوانەی ڕوویانداوە ئەیزانێت، وە ئەوەشی ئێستە ڕووئەدات ئەیزانێت و ئاگاداریانە. نەك هەر شتە گەورەکان، بەڵکو هەموو وردەکارییەکان کە کەس نایانزانێت ئەو ئەیزانێت سبحانە وتعالی. وە هەموو داهاتووش ئەزانێت، تەنانەت ئەو شتانەشی ڕوویاننەداوە یان ڕوونادەن، وە گەر ڕوو بدەن ئەزانێت چۆن ڕووئەدەن. وە جیهانی بینراو و غەیب ئاگادارە و هەموو ڕووداوەکانی نوسیوەتەوە.

وە گەر کەسێك بڵێت: خۆ لە قورئانیشدا چەند ئایەتێك هەیە کە تیایا ئەڵێت خوا کافرانی بیرئەچێتەوە ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ (طه - ١٢٦) پێی ئەڵێت ئاوا ئایەتەکانمان بۆت هات جا پشتگوێتخست، وە بەهەمان شێوە ئەمرۆ پشتگوێئەخرێیت ﴾، ﴿ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ (الجاثية - ٣٤) وە ئەوتریت ئەمرۆ پشتگوێتانئەخەین وەك ئێوە مەوعیدی ئەمرۆی قیامەتتان پشتگوێخست، وە جێگەتان ئاگرە و هیچ سەرخەرێکتان نییە ﴾، ﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ

ٱلۡفَٰسِقُونَ (التوبة - ٦٧) خوایان پشتگوێخست جا پشتگوێیخستن، بێگومان مونافیقان لەڕێ دەرچوون ﴾. کەواتە قورئانیش هەمان شت ئەداتە پاڵ خوا و هیچ جیاواز نییە لە کتێبی جوولەکە و گاورەکان.

لە وەڵامدا ئەڵێین:

١. وشەی (نسیان) لە زمانی عەرەبیدا دوو واتای هەیە (بیرچوونەوە، وازلێهێنان)[٨] [٩]. وە لەو ئایەتانەدا کە (نسیان) ئەدەنە پاڵ خوای گەورە وشەکە بە واتای (وازلێهێنان و پشتگوێخستن و تەرککردن و ئیهمالکردن) دێت نەوەك (بیرچوونەوە). چونکە لە قورئاندا خوای گەورە پێی فەرمووین کە هەموو شتێك ئەزانێت و هیچی بیرناچێتەوە و ئەو واتایەی ڕەتکردووەتەوە بۆ خۆی وەك لە ئایەتەکاندا خوێندمانەوە، وە ئەوە حاشا هەڵنەگر و بەڵگەنەویستە لامان. وە واتای ئایەتەکان کە دەڵێن خوای گەورە هیچی بیرناچێتەوە موحکەم و جێگیر و ڕوونن و هیچ واتایەکی تر لەخۆیان ناگرن جگە لە (بیرچوونەوە و بێ ئاگایی). کەواتە ئایەتەکانی تر کە سیفەتی (نسیان) ئەدەنە پاڵ خوای گەورە ئیحتیمالی ئەوەیان تیا نییە واتایان (بیرچوونەوە) بێت، بەڵکو واتایان (وازلێهێنان)ـە.

٢. دەقی ئەو ئایەتانەی کە (نسیان) ئەدەنە پاڵ خوای گەورە باسیان لە سزادانی کافرانە لەسەر تاوانەکانیان، کە بەپێی ئایەتەکان تاوانەکەیان بریتییە لە (نسیان) ﴿ فَنَسِيتَهَا ﴾، ﴿ نَسِيتُمْ ﴾، ﴿ نَسُواْ ﴾. وە گەر بڵێین واتای (نسیان) تیایاندا بریتییە لە (بیرچوونەوە) هەڵەین. چونکە لە ئیسلامدا (بیرچوونەوە) تاوان نییە، بەڵکو خوای گەورە لە بەندەکانی ئەبووریێت گەر بکەونە تاوان و سەرپێچییەوە بەهۆی بیرچوونەوەوە. ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ (البقرة - ٢٨٦) خوا ئەرك ناخاتە سەر هیچ نەفسێك مەگەر بەپێی توانای، چاکە بکات پاداشت وەرئەگرێت خراپەش بکات سزا ئەدرێت، پەروەردگارمان لێمان مەگرە گەر بیرمانبچێت یان هەڵە بکەین، وە باری گران مەخەرە سەرمان وەك خستتە سەر ئەوانەی پێش ئێمە، پەروەردگارمان شتێك مەخەرە سەرمان توانای هەڵگرتنیمان نەبێت، وە لێمان ببوورە وە لێمان خۆشبە وە ڕەحمان پێبکە، هەر تۆ گەورە و سەرخەرمانی، جا سەرمانبخە بەسەر میللەتی کافراندا ﴾، ﴿ من نامَ عن صلاةٍ أو نسيَها فليصلِّها إذا ذَكرَها (مجموع الفتاوى ٢٣/ ٩٠) هەرکەس بخەوێت لە نوێژێك یان بیریبچێت با کە بیریکەوتەوە بیکات ﴾، ﴿ مَن نام

عنْ وِترِه أو نَسِيَه، فليُصَلِّه إذا أصبَحَ أو ذَكَره (المستدرك - ١١٤٢) هەرکەس لە نوێژە ویترەکەی خەوت یان بیریچوو، یا کە ڕۆژبووەوە یان کە بیریکەوتەوە بیکات ﴾، ﴿ إنَّ اللهَ تجاوَز عنْ أُمَّتي الخطأَ والنِّسيانَ وما استُكرِهوا عليه (صحيح إبن حبان - ٧٢١٩) خوا لە هەڵە و بیرچوونەوە و زۆرلێکراوی ئوممەتەکەم خۆشبووە ﴾. بەڵکو کاری ئەو کەسانە پشتکردنە لە دین وازهێنان و ئیهمالکردنی حوکمەکانی خوای گەورەیە بە ئەنقەست نەك بێئاگایی، وە ئەوەش تاوانە لە ئیسلامدا. وە سزاکەشیان لە جۆری تاوانەکەیانە لای خوای گەورە (الجزاء من جنس العمل)، جا وەك چۆن ئەوان پشتیان کردە دینەکەی و فەرمانەکانیان وازلێهێنا و حوکمیان بە شەریعەتەکەی نەکرد، خوای گەورەش وازیان لێدێنێت و ئیهمالیان ئەکات.

٣. وازلێهێنان لە کافران لە جەهەننەمدا و پشتتێکردنیان و وەڵامنەدانەوەیان و بەدەمەوەنەهاتنیان یەکێکە لە سزاکانیان، کە خوای گەورە و ئیمانداران و فریشتەکان بەرامبەر کافران ئەیکەن. وە ئەمە بیرچوونەوە نییە بەڵکو سزادانە. چونکە ئاشکرایە کە فریشتەکانی سزادان ئەو کافرانەیان بیرناچێتەوە کە بە بەردەوامی سزایان ئەدەن، ئیتر خوای گەورە چۆن لەبیریانی ئەچێتەوە؟ وە کافران دوای ئەوەی بێ هیوا بوون لەوەی خوای گەورە قسەیان لەگەڵ بکات و وەڵامیان بداتەوە پەنا بۆ فریشتەکان و ئیمانداران ئەبەن بێن

بەدەمیانەوە، وە ئەوانیش نایەن بەدەمیانەوە و ئیهمالیان ئەکەن. وە ئەمە لە چەند شوێنێکی تری قورئان و لە فەرموودەشدا باسکراوە. ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ (البقرة - ١٧٤) ئەو کەسانەی کە ئەوە ئەشارنەوە کە خوا دایبەزاندووە لە کتێب و نرخێکی کەمی دنیای پێ ئەکڕن، ئەوانە هیچ ناخەنە سکیانەوە جگە لە ئاگر، وە خوا لە قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکات، وە پاکیان ناکاتەوە، وە سزایەکی بەئێشیان هەیە ﴾، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ (٣٦) وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ (٣٧) إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (٣٨) (فاطر) وە ئەوانەی کوفریان کردووە ئاگری جەهەننەمیان هەیە تیایا ناکوژرێن و بمرن، وە سزاکەیشیان لەسەر کەمناکرێتەوە، ئاوا پاداشتی هەموو کافرێك ئەدەین (٣٦) وە تیایا هاوارئەکەن پەروەردگارمان دەرمانکە کاری چاك بکەین جیا لەوەی ئەمانکرد، ئایا تەمەنمان نەدانێ تیایا کە ئەوەی بیەوێ سوودمەند بێت سوودمەند بوو وە ئاگادارکەرەوەش هات بۆلاتان، جا بچێژن وە زاڵمان

سەرخەریان نییە (٣٧) خوا زانای شاردراوەکانی ئاسمانەکان و زەوییـــە، ئـەو شارەزایە بەوەی لە سنگەکاندایە (٣٨) ﴾، ﴿ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُـهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ (١٠٣) تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّـارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ (١٠٤) أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (١٠٥) قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَـا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗـا ضَـآلِّينَ (١٠٦) رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَـا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ (١٠٧) قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَـا وَلَا تُكَلِّمُونِ (١٠٨) إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَـا وَٱرۡحَمۡنَـا وَأَنـتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ (١٠٩) فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّـىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ (١١٠) إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ (١١١) (المؤمنون) وە ئەوەی کێشراوەکانی سووك بێت ئەوانــە ئەوانــەن کـە خۆیان دۆڕاندووە لە جەهەننەمدا نەمرن (١٠٣) ئاگر ڕوخساریان دائەپۆشێت وە تیایدا لێوشـۆڕن (١٠٤) ئایـا ئایەتـەکانم بەسـەرتاندا نەئەخوێنرایـەوە و ئێـوەش پێیـان بێبـاوەڕ بـوون (١٠٥) وتیـان پـەروەردگارمان ئارەزوومـان بەسەرماندا زاڵ بوو وە میللـەتێکی گـومڕا بـووین (١٠٦) پـەروەردگارمان دەرمانکە تیای جا گەر گەڕاینەوە بۆ کوفر ئەوا زاڵمین (١٠٧) وتی بێدەنگبن تیای و قسەم لەگەڵ مەکەن (١٠٨) لە دنیا کۆمەڵێك لە عەبدەکانم ئەیانوت پەروەردگارمان ئیمانمان هێنـا جـا لێمـانببوورە و ڕەحمـان پێبکـە، وە تـۆ

باشترین بەبەزەییت (١٠٩) جا ئێوە بە گاڵتە گرتتانن تا یادی منتان لەبیرکرد، وە پێیان پێئەکەنین (١١٠) من ئەمڕۆ پاداشتمدانەوە بەوەی سەبریانگرت و ئەوان براوەن (١١١) ﴾، ﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ (٧٤) لَا يُفَتَّرُ عَنۡهُمۡ وَهُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ (٧٥) وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ (٧٦) وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ (٧٧) لَقَدۡ جِئۡنَٰكُم بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَكُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ (٧٨) أَمۡ أَبۡرَمُوٓاْ أَمۡرٗا فَإِنَّا مُبۡرِمُونَ (٧٩) أَمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّا لَا نَسۡمَعُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيۡهِمۡ يَكۡتُبُونَ (٨٠) (الزخرف) بێگومان تاوانباران لە سزای جەهەننەمدان بە نەمری (٧٤) لێیان ساردنابێتەوە وە تیایا بێئومێدن (٧٥) وە زوڵمان لێیان نەکردووە بەڵکو ئەوان زاڵمبوون (٧٦) وە بانگی مالیکی دەرگاوانی جەهەننەم ئەکەن با پەروەردگارت بمانکوژێت (وە مالیك دوای هەزار ساڵ وەڵامیان ئەداتەوە و ئەڵێت[٧]:) ئێوە لە جەهەننەما ئەمێننەوە و نامرن (٧٧) حەقمان بۆناردن لە دنیا بەڵام زۆربەتان ڕقتان لە حەق بوو (٧٨) بەڵکو نەخشە دائەنێن دژ بە حەق و ئێمەش نەخشە دائەنێین (٧٩) وە واحسابئەکەن گوێبیستی نهێنی و چپەیان نین، نەخێر نێردراوانمان لەلایانن و ئەینوسن (٨٠) ﴾، ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ

(الأعـراف - ٥٠) وە هاوەڵانی ئاگر بانگی هـاوەڵانی بەهەشـت ئەکـەن کـە ئاومان بدەنێ یان هەرشتێك لەوەی خوا پێیبەخشیون، وتیـان خـوا ئەوانـەی حەرامکردووە لە کافران ﴾، ﴿ ثلاثةٌ في المنسَا تحتَ قدمِ الرَّحمنِ يـومَ القيامـةِ، لا يُكلِّمُهمُ اللَّهُ ولا ينظرُ إليْهم ولا يزَكِّيهم. قلتُ: يا رسولَ اللَّهِ مَن هم؟ جلِّهم لنا. قالَ: المُكذِّبُ بالقدَرِ والمدمنُ الخمـرَ والمتـبرِّئُ مـن ولَـدِهِ. قـالَ: قلـتُ: فمـا المنسأُ؟ قالَ: جُبٌّ في قعرِ جَهنَّمَ وأسفلَ طينتِها (تخريج كتـاب السـنة - ٣٣٣) سێ جۆر کەس لە شوێنە وازلێهێنراوەکەیان لەژێر پێی خوای بەبەزەییـدا لـە قیامەتدا، خوا قسـەیان لەگـەڵ ناکـات و سەیریشـیان ناکـات و پاکیشـیان ناکاتەوە. وتم: پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟ بۆمان ئاشکرا بکە. فـەرمووی: بەدرۆخەرەوەی قەدەر، وە ئالوودەبووی خەمر، وە حاشاکەر لە منداڵی خـۆی. وتم: شوێنە وازلێهێنراوەکە چییە؟ فەرمووی: بیرێکە لە قوڵایی جەهەننەمـدا وە لەژێر قوڕاوەکەیدا ﴾.

شەشەم/ چواندنی خوا بە مەخلوقەکان.

کتێبی پیرۆز:

– الرب رجل حرب (خروج ١٥/ ٣) پەروەردگار پیاوی جەنگە.

– إن الله الذي من مصر يخرجه هو كقرون الجاموس له. جثث أعدائه يفترس وعظامهم يحطم وبسهامه يضرب (٨) جثم وربض كأسد وكلبؤة فمن ذا يقيمه؟ (٩) (العدد / ٢٤) ئەو خوایەی لە میسر دەریئەکات ئەو وەك شاخی گامێشە بۆیان. پڕ بە لاشەی دوژمنەکانیا ئەکات وە ئێسقانەکانیان ئەشکێنێت وە بە تیرەکانی لێئەدات (٨) ڕاکشاوە و خۆیماتداوە وەك نێرە و مێیەی شێر جا کێ هەڵێدەستێنێت؟ (٩).

– لأن الرب إلهك هو نار أكلة (التثنية ٤/ ٢٤) لەبەرئەوەی پەروەردگاری یەزدانت ئاگرێکی سوتێنەرە.

– الرب صخرتي وحصني ومنقذي (٢) إلهي الصخر به أعتصم (٣) (صموئيل الثاني / ٢٢) پەروەردگار تاشە بەردمە وە قەڵامە وە ڕزگارکەرمە (٢) خوای من تاشە بەردە بەو پەنائەگرم (٣).

– دخان صعد من أنفه ونار آكلة من فمه وجمر اتقد منه (صموئيل الثاني ٢٢/ ٩) دووکەڵێك لە لوتیەوە بەرزبووەوە وە ئاگرێکی لووشدەر لە دەمیەوە وە پشکۆ لێوەی داگیرسا.

– أعماق البحر أنكشفت وأسس الكون أنجلت لصوت وعيد الرب لهبوب ريح أنفه (صموئيل الثاني ٢٢/ ١٦) قوڵایی دەریا دەرکەوت وە بناغەی گەردوون ئاشکرابوو لە سەرزەنشتی یەزدان لە گەرمیی هەناسەی لووتی.

- ثم استيقظ الرب كما يستيقظ النائم، مثل جبار يصرخ عاليا من الخمر (المزامير ٧٨/ ٦٥) پاشان پەروەردگار هەستا لەخەو وەك چۆن خەوتوو لە خەو هەڵئەستێت، وەك پاڵەوانێك بەدەنگی بەرز هاوارئەکات لە سەرخۆشییا.
- لذلك أنتحب وأولول وأمشي حافيا عريانا وأقيم انتحابا كبنات آوى. ونوحا كبنات النعام (ميخا ١/ ٨) لەبەرئەوە دەلورێنم و دەلاوێنمەوە وە بەپێی پەتی و بە ڕووتی ئەگەڕێم وە وەك چەقەڵ دەلورێنم. وە وەك کوندەپەپوو شیوەن ئەکەم.
- والسيد الرب ينفخ في البوق (زكريا ٩/ ١٤) وە یەزدانی باڵادەست فوو بە کەڕەنادا ئەکات.
- ركب على كروب وطار وظهر على أجنحة الرياح (صموئيل الثاني ٢٢/ ١١) سواری کەڕوب بوو وە فڕی وە سوار باڵی با بوو.
- في ذلك اليوم، يصفر الرب للذباب الذي في أقصى أنهار مصر وللنحل الذي في أرض أشور (إشعياء ٧/ ١٨) لەو ڕۆژەدا، خوا فیکە بۆ ئەو هەنگانە لێئەدات کە لەوپەڕی ڕووبارەکانی میسرن وە ئەوانەشی کە لە زەوی ئاشورن.
- في ذلك اليوم، يحلق السيد بموسى مستأجرة في عبر النهر (مع ملك أشور) الرأس وشعر الرجلين واللحية أيضا تزال (إشعياء ٧/ ٢٠) لەو ڕۆژەدا،

پەروەردگار بە گوێزانێکی بەکرێگیراو لەوبەری ڕووباری فوراتەوە (لەگەڵ پاشای ئاشورییەکان) قژ و مووی قاچەکان ئەتاشێت و ڕیشیش لائەبرێت.

- ثم يحاربون الحمل، ولكن الحمل يهزمهم، لأنه رب الأرباب وملك الملوك (الرؤيا ١٧/ ١٤) پاشان شەڕی مەڕەکە ئەکەن، بەڵام مەڕەکە لێیانئەباتەوە، چونکە خوای خواکانە و پاشای پاشاکانە.

- لأن الحمل الذي في وسط العرش سيرعاهم وسيهديهم إلى ينابيع ماء الحياة (الرؤيا ٧/ ١٧) لەبەرئەوەی ئەو مەڕەی لە ناوەڕاستی عەرشدایە شوانێتییانئەکات وە بەرەو کانییەکانی ژیانیان ئەبات.

- وكل خليقة في السماء وعلى الأرض وتحت الأرض وفي البحر، وكل ما فيها، سمعته يقول: (( للجالس على العرش وللحمل التسبيح والإكرام والمجد والعزة أبد الدهور )) (الرؤيا ٥/ ١٣) وە هەموو بوونەوەرێکی ئاسمان و سەر زەوی و ژێر زەوی و ناو دەریا، وە هەموو ئەوەی تیایەتی، بیستم ئەیوت: (با ستایش و ڕێز و شکۆ و توانا بۆ دانیشتووی سەر تەختەکە و بەرخەکە بێت هەتاهەتایە).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ (الشورى - ١١) هیچ شتێك هاوشێوەی خوا نییە، وە ئەوە بیسەر و بینەر ﴾.

+ ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا (مريم - ٦٥) پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە جا بیپەرستە و سەبربگرە لەسەر پەرستنی، ئایا هاوشێوەی ئەو ئەزانیت هەبێت ﴾.

+ ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ (٢) لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ (٣) وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ (٤) (الإخلاص) بڵێ الله تاکە (١) الله ناموحتاجە (٢) لەکەس نەبووە وە هیچی لێنەبووە (٣) وە کەس هاوشێوەی ئەو نییە (٤) ﴾.

+ ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (الزمر - ٦٧) وە خوایان بەگەورە نەزانیوە بە حەقی خۆی، وە هەموو ئاسمانەکان و زەوی لە مشتی ڕاستیدایە لە قیامەتدا بەلوولکراوی، پاکی و بەرزی بۆ ئەو لەوەی ئەیکەن بە شەریکی ﴾.

+ ﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ (الصافات - ١٨٠) پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارت پەروەردگاری بە عیززەت لەوەی وەسفی ئەکەن ﴾.

+ ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٦٩) (النحل) وە پەروەردگارت ئیلهامی بۆ هەنگ کرد کە لە شاخەکاندا ماڵ دابنێ وە لە درەختەکاندا وە لەو کوورانەدا کە بۆتان دروستئەکەن (٦٨) پاشان بخۆ لە هەموو بەرێك وە ئەو ڕێگایەی خوا تێیگەیاندوویت بیگرە بەر بە ملکەچی، لە سکیانەوە خواردنەوەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە شیفای تیایە بۆ خەڵك، بێگومان لەوەدا بەڵگە هەیە بۆ قەومێك بیرئەکەنەوە (٦٩) ﴾.

لە کتێبی جولەکە و گاورەکاندا ئەشێ بەڵکو زۆر ئاساییە خوای گەورە بشوبهێنیت بە مەخلوقەکانی، وە هاوتا و یەکسانی بکەیت لەگەڵیاندا. جا جارێك بە سەربازی جەنگ وەسفکراوە، وە جارێك بە شاخی گامێش، وە جارێك بە نێرەی شێر، وە بە مێیەی شێر، وە بە ئاگر، وە بە بەرد، وە بە ئاژەڵە ئەفسانەیی و ئەژدیهاکان کە ئاگر و دوکەڵ لە دەم و لوتیەوە دێنە دەرەوە، وە بە خەواڵوو، وە بە سەرخۆش و

مەی خۆر، وە وەك ئاژەڵ دەنگ دەرئەکات، وە بە شێتێك کـە بـەپێی پـەتی دێ و دەچـێ، وە زوڕنـا لێئـەدات، وە سـواری مەخلوقـەکانی ئـەبێت، وە بـە فیکـە مەخلوقەکانی بانگ ئەکات، وە شت بەکرێ ئـەگرێت، وە مـوس بـەکاردێنێت، وە موو و ڕیشی هەیە، وە سەر و ڕیش و قاچی ئەتاشێت، وە جارێك بە مـەڕ و بـەران وەسفکراوە.

وە خوای گەورە بەرز و پاك و دوورە لەو سیفەت و وەسفە ناحەز و نزم و کورتانـەوە پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە. وە زۆربەی ئەو سیفەتانە گەر بیاندەینە پاڵ گاور و جوولەکەکان بۆ خۆیان ڕازی نین پێیان، ئیتر چۆن ڕازین بیدەنە پاڵ خـوای گـەورە سبحانە وتعالی؟ وە سیفەتێك کە ئەوەندە نزم و ناشـرین بێـت مرۆڤێکـی نوقسـان ڕازی نەبێت بدرێتە پاڵی، ئیتر چۆن و بە چ هۆشێکەوە دراونەتە پاڵ خوای گـەورە؟ ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (زخـرف - ١٧) وە گەر یەکێکیان مژدەی ئەوەی پێبدرێت کە داوێتییە پـاڵ خـوای بەبەزەیی ڕووی ڕەش هەڵئەگـەڕێت و خـەمبارە ﴾، ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَىٰ ۖ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ (النحل - ٦٢) وە ئەوە بۆ خوا دائـەنێن کـە ڕقیانلێیـە، وە زمانیـان وەسـفی درۆ ئەکات کە پاداشتی چاکیان هەیە، بێگومان ئاگر بۆ ئەوانە وە تیـای جێئـەهێڵرێن

.

حەوتەم/ پەشیمانی.

کتێبی پیرۆز:

– فندم الرب على أنه صنع الإنسان على الأرض وتأسف في قلبه. فقال الرب: (٦) (( أمحو عن وجه الأرض الإنسان الذي خلقت، الإنسان مع البهائم والزحافات وطيور السماء، لأني ندمت على أني صنعتهم )) (٧) (تكوين / ٦) خوا پەشیمانبوو لەسەر ئەوەی ئینسانی لەسەر زەوی دروستکردووە وە لە دڵیدا خەفەتی خوارد. جا خوا وتی: (٦) (لەسەر زەویدا ئەو ئینسانە ئەسڕمەوە کە دروستمکرد، ئینسان لەگەڵ ئاژەڵ وخشۆك و باڵندەی ئاسمان، چونکە پەشیمانم لەوەی دروستمکردوون) (٧).

– فكان كلام الرب إلى صموئيل قائلا: (١٠) " إني قد ندمت على إقامتي شاول ملكا، لأنه ارتد عن اتباعي ولم يعمل بأمري " (١١) (صموئيل الأول / ١٥) وتەی خوا بۆ ساموئیل بوو وتی: (١٠) "من پەشیمانم لەوەی شاولم کردووە بە پاشا، چونکە هەڵگەڕایەوە لە شوێنکەوتنم و کاری بە فەرمانم نەکرد" (١١).

– وندم الرب على أنه ملك شاول على إسرائيل (صموئيل الأول ١٥/ ٣٥) وە خوا پەشیمانبوو لەوەی شاولی کرد بە پاشا بەسەر بەنی ئیسرائیلەوە.

– وبسط الملاك يده على أورشليم ليدمرها. فندم الرب على الشر وقال للملاك المهلك الشعب: ((كفى! فكف الأن يدك )) (صموئيل الثاني ٢٤/ ١٦) وە فریشتەکە دەستی کردەوە لەسەر ئۆرشەلیم تا لەناویببات. جا خوا پەشیمانبوو لە کارەساتەکە و بە فریشتەی لەناوبەری میللەتەکەی وت: (بەسە! ئێستا دەستهەڵگرە).

– فعدل الرب عن الإساءة التي قال إنه ينزلها بشعبه (خروج ٣٢/ ١٤) جا خوا پاشگەزبووەوە لەو خراپەیەی کە وتی دایئەبەزێنێت بەسەر گەلەکەیدا.

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِي۟ ٱلْمُرْسَلِينَ (الأنعام - ٣٤) وە پێغەمبەرانێکی پێش تۆ بەدرۆخرانەوە جا سەبریانگرت لەسەر ئەوەی بەدرۆخرانەوە و عەزێتدران هەتا سەرخستنمان پێیانگەشت، وە قسەکانی خوا گۆڕەریان نییە، وە لە هەواڵی پێغەمبەرانت بۆ هات ﴾.

+ ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (الأنعام - ١١٥) وە وتەی پەروەردگارت تەواوە بە حەق و دادپەروەری، وشەکانی هیچ گۆڕەرێکیان نییە، وە ئەو زۆر بیسەر و زۆر زانایە ﴾.

+ ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا (الكهف - ٢٧) وە ئەو وەحییە بخوێنەرەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت دابەزیوە، وشەکانی ناگۆڕێن، وە جگە لەو هیچ پشت و پەنایەك نادۆزیتەوە ﴾.

+ ﴿ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ (يونس - ٦٤) وشەکانی خوا گۆڕانیان نییە ﴾.

+ ﴿ قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ (٢٨) مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ (٢٩) (ق) وتی لەلای منا مشتومڕ مەکەن وە من پێشتر هەڕەشەم بۆ ناردبوون (٢٨) قسە لەلای من ناگۆڕێت، وە من بۆ عەبدەکان زاڵم نیم (٢٩) ﴾.

+ ﴿ وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا (مـريم - ٧١) وە هەمووتان دێنە سەر جەهەننەم، ئەوە لەلای خواوە بڕاوەتەوە و تەواوبووە ﴾.

+ ﴿ يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآۖ إِنَّهُۥ قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ (هـود - ٧٦) ئەی ئیبراهیم وازبێنە لەوە، وا فەرمانی پەروەردگارت هاتووە، وە ئەوان سزایەکیان دێتەسەر کە ناگەڕێتەوە ﴾.

+ ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ (٤٤) وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ (٤٥) قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ (٤٦) (هود) وە وترا ئەی زەوی ئاوەکەت قووتبدە وە ئەی ئاسمان باران بگرەرەوە، وە ئاوەکە کەمیکرد، وە فەرمانەکە جێبەجێبوو وە کەشتییەکە لەسەر جودی نیشت، وە وترا با میللەتی زاڵم دووربن (٤٤) وە نوح هاواری پەروەردگاری کرد جا وتی پەروەردگارم کوڕەکەم لە کەسوکاری منە وە وەعدی تۆش حەقە وە تۆ دادوەرترین حاکمیت (٤٥) وتی ئەی نوح ئەو لە کەسوکارت نییە، ئەو کردەوەی باشی نەکرد، جا داوای شتێکم لێمەکە کە نایزانیت، من ئامۆژگاریت ئەکەم کە لە نەفامەکان نەبیت (٤٦) ﴾.

+ ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا (١٤) وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا (١٥) (الشمس) جا بەدرۆیانخستەوە و حوشترەکەیان سەربڕی، جا پەروەردگاریان سزای بۆ ناردن بەهۆی تاوانەکەیانەوە و تەختیکردن (١٤) وە خوا لە سەرئەنجامی کارەکانی ناترسێت (١٥) ﴾.

+ ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ (التين - ٨) ئایا خوا دادوەرترینی دادوەرەکان نییە ﴾.

+ ﴿ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ (المائدة - ٥٠) ئایا حوکمی نەفامییان ئەوێت، وە کێ لە خوا حوکمی باشترە بۆ قەومێك یەقینیان هەبێت ﴾.

+ ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا (النساء - ١٢٢) وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کاری چاکیان کردووە ئەیانخەینە بەهەشتانێکەوە بەژێریا چەندین ڕووبار ئەڕۆن تاهەتایە نەمرن تیای، وەعدی حەقی خوایە، وە کێ لە خوا ڕاستگۆترە ﴾.

لە کتێبی جوولەکە و گاورەکاندا خوا ئەشێ قسەیەك بکات یان بڕیارێك بدات و دواتر لێی پەشیمانببێتەوە، یان بەهۆی خراپی بڕیارەکەیەوە یان بەهۆی ئەوەی خوا داهاتوو و عاقیبەتی شتەکان نازانێت. وە لە قورئانی پیرۆزدا قسە و حوکمی خوای گەورە ناگۆڕێت و پەشیمان نییە لێیان. چونکە خوای گەورە زانا و کاربەجێیە، وە بڕیارەکانی باشترین بڕیارن و تەواوترینن و دادن و بێ هەڵەن. وە خوای گەورە

شارەزا و زانایە بە داهاتوو و وە عاقیبەتی شتەکان ئەزانێت، وە لە ئەنجام و عاقیبەتی ڕووداوەکان ناترسێت تا بیانگۆڕێت و پەشیمانی بکێشێت لەوەی ڕۆشتووە. وە ڕاستگۆترینە و گەر بڕیار یان بەڵێنی شتێك بدات ئەیباتە سەر و جێبەجێی ئەکات.

وە گەر کەسێك بڵێت: لە قورئاندا هاتووە کە بڕیار و حوکمەکان نەسخ ئەبنەوە و هەڵئەگیرێن، وە لە جێیان بڕیار و حوکمی تر دائەبەزن. ﴿ مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (البقرة - ١٠٦) هیچ ئایەتێك حوکمەکەی لانابەین یان لەبیرینابەینەوە ئەوا باشتر لەو یان هاوشێوەی بۆ خەڵك دێنین، ئایا نەتزانیوە کە خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ﴾. وە چەندین بابەت هەن کە نەسخبوونەتەوە و حوکمەکانیان گۆڕاون. ئایا ئەمەش هۆکارەکەی پەشیمانبوونەوە نییە؟

لە وەڵامدا ئەڵێین:

١. لە ئیسلامدا نەسخ هەیە و بابەتێکی تەواو جیاوازە لە پەشیمانی. نەسخ لە زماندا واتا گۆڕینی شتێك بە شتێکی تر[٩]. وە لە شەرعدا واتا هەڵگرتنی حوکمێکی چەسپاو بە دەقێك کە پێشتر دابەزیوە بە دەقێك کە دواتر دابەزیوە[٦]. واتا دەقێك دابەزیوە و حوکمێکی داناوە، پاشان دواتر دەقێکی

تر دابەزیوە لە هەمان بابەتدا و حوکمەکەی پێشتری لابـردووە و حـوکمێکی نوێی داناوە لەبەر هۆیەکی شەرعی. وە پەشیمانبوونەوە بریتییە لە ئەسـەف بۆ شتێك کە ڕابوردووە و ڕۆشـتووە[٨] [٩]. کەواتـە گـۆڕینی حوکمێـك یـان لابردنی بەشێوەی نەسخ بەهۆی نەفامی خـوای گـەورە نییـە بـە داهـاتوو و عاقیبەتی شتەکان، وە بەهۆی ئەسەف بۆ ڕابردوو نییـە، وە بـەهۆی خراپـی حوکمەکەوە نییە. بەڵکو بەپێی گونجاوی کات و شـوێن و کەسـەکانە، تـا چ حوکمێك گونجاوە بۆ ئێستەی مرۆڤەکان ئەوەیان بۆ دابەزێت. وە خوای گەورە زانیویەتی دواتر وا بۆیان گونجاوە نەسخ ببێتەوە و بگۆڕێت بە حوکمێکی تر. وە خوای گەورە بەویستی خۆی ئەیگۆڕێت نەوەك لە ناچـاری و ئەسـەفدا. وە هیچ دەقێك نییە لە ئیسـلامدا کـە پەشـیمانی خـوای گـەورە دەربخـات لـە کردارێك یان حوکمێکی وەك چـۆن لـە کتـێبی جوولەکـە و گاورەکانـدا بـە ئاشکرا هاتووە. وە نەسخ وەك نموونەی گـۆڕینی بابەتەکانـە لـە مەکتـەب و زانکـۆ بـەپێی ئاسـت، وە ئـەم بابەتـە نوێیانـە ئەشـێ مامۆسـتای نـوێش پێیبلێینەوە. جا گۆڕینی بابـەت و مامۆسـتاکان لـە قۆنـاغی نوێـدا واتـای پەشیمانی بەڕێوەبەری شوێنەکە نییە لە قۆناغی پێشـوو. بـەڵکو بـەگوێرەی ئاستی تەلەبەکە بابەتـەکان گـۆڕاون و نوێبوونەتـەوە. هـەروەها نەسـخ وەك نموونەی منالّی ساوایە کە سەرەتا دایکی ژەك و شیری خۆی ئەداتێ و هیچی

تری ناداتێ، وە پاش ماوەیەك لەشیر ئەیبڕێتەوە و خواردنی تری ئەداتێ. جا گۆڕانی جۆری خواردنەکە نەسخ بوونەوەی شیرەکەیە و گۆڕینێتی بە خواردنی تر. وە لەشیربڕینەوەکە واتای پەشیمانی دایکەکە نییە لەوەی چەند وەختە شیری داوەتێ، بەڵکو کاتێك منداڵەکە ساوا بوو ئەو شیرە بۆی گونجاو بوو، وە دواتر خواردنی تر بۆی گونجاوە.

٢. لە جۆرەکانی نەسخ[١٠] [٣٦]: گۆڕینی حوکم لە ئاسانەوە بۆ قورستر (واجببوونی ڕۆژووی ڕەمەزان (البقرة - ١٨٥))، گۆڕینی حوکم لە قورسەوە بۆ ئاسان (کەمکردنەوەی ژمارەی نوێژەکان لە پەنجاوە بۆ پێنج (صحيح البخاري - ٣٤٩))، گۆڕینی حوکم بە هاوشێوەی (گۆڕینی قیبلە لە مزگەوتی ئەقصاوە بۆ کەعبە (البقرة - ١٤٤)). جا گەر دیقەتی ئەم نەسخانە بدەین و بگەڕێینەوە سەر دەقەکان، ئەبینین کە هۆکاری نەسخەکان پەشیمانی نییە.

٣. لە هۆکارەکانی نەسخ: ئاسانکاری لەسەر عەبدەکان (کەمکردنەوەی عیددەی ئافرەت کە مێردی بمرێت لە ساڵێکەوە بۆ چوار مانگ و دە ڕۆژ (البقرة - ٢٣٤))، ڕەحمی خوای گەورە و گەورەیی فەزڵی (کەمکردنەوەی ژمارەی نوێژە فەرزەکان و وەرگرتنی پاداشتی پەنجا نوێژ (صحيح البخاري - ٣٤٩))، هەنگاونان لە زیادکردنی عیبادەتەکاندا بەپێی دامەزراوی ئیمانی کەسەکان

(زیادکردنی ژمارەی رکاتەکانی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و عیشا لە دووانەوە بۆ چوار رکات (صحيح البخاري - ٣٩٣٥))، هەنگاونان لە قەدەغەکردنی شتە خراپەکاندا بەپێی دامەزراوی ئیمانی کەسەکان (قەدەغەکردنی خەمر و مەی (المائدة - ٩١))، جیاکردنەوەی موسوڵمانان لە کافران و وازهێنانی موسوڵمانان لە خۆچواندن پێیان (گۆڕینی قیبلە (البقرة - ١٤٤))، ئیمتیحانی خەڵك و موسوڵمانان بۆ جیاکردنەوەی ئەوانەیان زووتر پابەندی حوکمەکانی خوای گەورەن (بوونی نەسخ (البقرة - ١٠٦))، گۆڕینی قیبلە (البقرة - ١٤٣) (صحيح البخاري - ٤٠)). وە پەشیمانبوونەوە هۆکارێك نییە لە هۆکارەکانی نەسخ.

هەشتەم/ وەسفی تری خوا.

کتێبی پیرۆز:

— وقال الرب: (( هوذا هم شعب واحد ولجميعهم لغة واحدة، وهذا ما أخذوا يفعلونه. والآن لا يكفون عما هموا به حتى يصنعوه (٦) فلننزل ونبلبل هناك لغتهم، حتى لا يفهم بعضهم لغة بعض )) (٧) ففرقهم الرب من هناك على وجه الأرض كلها، فكفوا عن بناء المدينة (٨) ولذلك سميت بابل، لأن الرب

هناك بلبل لغة الأرض كلها. ومن هناك فرقهم الرب على وجه الأرض كلها (٩) (تكوين / ١١) وە خوا وتی: (ئەوەتا ئەوان یەك میللەتن وە هەموویان یەك زمانیان هەیە، دەستیانداوەتە ئەوە. وە لەمەودوا دەست لەوە هەڵناگرن کە مەبەستیانە هەتا ئەیکەن (٦) وەرن با بچینە خوارەوە و لەوێ زمانیان بشێوێنین، هەتا هەندێکیان زمانی هەندێکیان تێنەگەن) (٧) جا خوا لەوێ جیایکردنەوە بەسەر ڕووی زەویدا، جا وازیانهێنا لە دروستکردنی شارەکە (٨) وە بۆیە ناوینرا بابل، چونکە خوا لەوێ زمانی هەموو زەوی شێواند. وە لەوێوە خوا جیایکردنەوە بەسەر هەموو زەویدا (٩).

- ورأى داود الملاك الذي كان يضرب الشعب فقال للرب: ((أنا الذي خطئت وأنا الذي فعلت السوء، وأما اولئك الخراف، ماذا فعلوا؟ فلتكن علي يدك وعلى بيت أبي )) (صموئيل الثاني ٢٤/ ١٧) وە داود ئەو فریشتەیەی بینی کە لە گەلەکەی ئەدا جا بە خوای وت: (من بووم هەڵەمکرد وە من بووم خراپەمکرد، وە ئەمما ئەو مەڕانە، چیانکرد؟ با سزاکەت لەسەر من و ماڵی باوکم بێت).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (الزمـر - ٦٧) وە قەدری خوای گەورەیان نەگرتووە حەقی خۆی، وە زەوی هەمووی لە مشتیایەتی لە قیامەتدا وە ئاسمانەکان لوولکراون بە دەستی ڕاستی، پاکی و بەرزی بۆ ئەو لەوەی ئەیکەن بە شەریکی ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ (الحجـرات - ١٣) ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە، وە کردوومانن بە گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خوا بەتەقواترینتانە، بێگومان خوا زۆر زانا و شارەزایە ﴾.

+ ﴿ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخۡتَلَفُواْۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ (يونس - ١٩) وە خەڵك یەك ئوممەت بوون جا دواتر جیاوازییان تێکەوت، وە گەر ئەو قسەیە نەبووایە کە پێشتر لە پەروەردگارتەوە وترابوو ئەوا لە دنیا بڕیاریان لەسەرئەدرا لەوەی ڕاجیان تیایا ﴾.

+ ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ (البقرة - ٢١٣) خەڵكی یەك ئوممەت بوون جا خوا پێغەمبەرانی نارد مژدەدەر و ترسێنەر وە لەگەڵیاندا کتێبی دابەزاند بە حەق تا حوکم بکات لەنێوان خەڵکدا لەوەی تیای ڕاجیان، وە کەس ڕاجیانەبوو لەو کتێبانەدا مەگەر ئەوانەی بۆیانهاتووە لەدوای ئەوەی ڕوونکردنەوەیان بۆهات لە حەسوودی خۆیاندا، جا خوا ئەوانەی هیدایەتدا کە ئیمانیانهێنابوو لەوەی کە ڕاجیابوون بۆ حەق بە ئیزنی خۆی، وە خوا کێی بوێت هیدایەتی ئەدات بۆ ڕێگای ڕاست ﴾.

+ ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا (١٥) وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا (١٦) (الإسراء) کێ هیدایەت وەرگرێت ئەوا بۆخۆی هیدایەت وەرئەگرێت، وە کێ گومڕابێت خراپەکەی بۆ خۆیەتی، وە هیچ کەسێك تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت، وە سزای هیچ قەومێك نادەین تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین (١٥) وە گەر بمانەوێت شارێك لەناوبەبەین فەرمان

بە سەرۆکەکانیان ئەکەین چاکە بکەن، جا خراپەی تیا ئەکەن ئەوکاتە فەرمانی خوا بەسەریان جێبەجێ ئەبێت وە لەناویانئەبەین (١٦) ﴾.

+ ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولٗا يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ (القصص - ٥٩) وە پەروەردگارت شارەکان لەناونابات هەتا پێغەمبەر نەنێرێتە ناویانەوە ئایەتەکانمان بەسەریاندا نەخوێنێت، وە شارەکان لەناونابەین ئیللا وە خەڵکەکەی ستەمکارن ﴾.

+ ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةٗ وَأَثَارُواْ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (الروم - ٩) ئایا بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون ببینن سەرئەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بوو، لەمان بەهێزتربوون وە زەوییان ئاوەدانکردبووەوە زیاتر لەوەی ئەمان ئاوەدانیانکردووەتەوە وە پێغەمبەرانیان بە بەڵگەوە بۆیان هاتبوون، وە خوا زوڵمی لێیان نەکرد بەڵکو زوڵمیان لەخۆیانکرد ﴾.

لە کتێبی یەهود و نەصارادا خوا دژایەتی مرۆڤەکان ئەکات و سەریان لێئەشێوێنێت و لەیەکیان ئەکات و نێوانیان ئەشێوێنێت، هەموو ئەوانەش لەسەر هەوڵ بۆ بووژانەوە و پێشکەوتنی دنیایی. وە لە کتێبدا خوا زاڵمە و سزای بێ تاوانەکان ئەدات و چاوپۆشی لە تاوانباران ئەکات.

وە خوای گەورە سبحانە وتعالی هەرگیز خاوەنی ئەو سیفەتانە نییە کە کتێب ئەیانداتە پاڵی تعالی الله علوا کبیرا. وە ئەوە بەڵگەیەکی ڕوونە کە کتێب دەستکاریکراوە و وەك خۆی نەماوەتەوە. چونکە ناچێتە عەقڵەوە کە خوای گەورە ئاوا بێت یان بەو جۆرە وەسفی خۆی بکات. وە کتێبێك نەتوانێت خوای گەورەمان وەك خۆی و بە ڕێکوپێکی پێ بناسێنێت، ئیتر چۆن شایەنی ئەوەیە پیرۆز سەیربکرێت و بکرێت بە سەرچاوەی ناسینی خوای گەورە؟

وە لە بەرامبەردا وەسفەکانی قورئان تەواو و پڕ و بێ نوقسانی و بەرز و لایەقن بە خوای گەورەوە و، هەر ئەو وەسفانە چاوەڕێ ئەکرێت لە خوایەکی گەورە و بەرزەوە تبارك وتعالی.

وە دەقەکانی هەردوو کتێبەکە تەواو دژ و پێچەوانەی یەکن، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە قورئان هیچی لەو کتێبەوە وەرنەگرتووە وەك ئەوترێت. بەڵکو وەحییە و خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی ناردووە صلی الله علیه وسلم.

## بابەتی دووەم

## دەقەکان دەربارەی پێغەمبەران علیهم السلام

پێغەمبەر ئەو مرۆڤەیە کە لەناو میللەت و خەڵکەکەی خۆیا خوای گەورە هەڵیئەبژێرێت تاوەکو پەیامی خۆی پیا بنێرێت بۆ مرۆڤەکان، بۆ ئەوەی ئەو هەڵە و تاوانانەی تێیکەوتوون تەرکی بکەن و ڕاستیانبکاتەوە (آل عمران - ٣٣)، (الأعراف - ١٤٤)، (الحديد - ٢٥)، (التثنية ١٨/ ١٥)، (الملوك الثاني ١٧/ ١٣).

وە کەسێك ئەم ئەرکە گەورە و پیرۆزەی پێ بسپێردرێت و خوای گەورە لەناو هەزاران کەسدا هەڵیبژاردبێت و بیکات بە پێشەوا و پێشەنگ بۆیان، ئەوا هەڵبەتە خاوەنی ڕەوشتی بەرزە، وە ئاقڵە، وە لەوانی تر زۆر باشترە، وە ئەو تاوان و سەرپێچییانەی تیا نییە کە خەڵکە تاوانبارەکە ئەیکەن، وە خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتی جوان و بەرزە کە شایەنی ئەو پلە بەرز و مەزنەیە.

وە پێغەمبەران لە ئیسلامدا هەموویان هەمان خوا ناردوونی و هەمان پەیامیان گەیاندووە، وە ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان بە هەموو پێغەمبەران هەیە علیهم

السلام و جیاوازییان تیا ناکەین. وە بەشێك لە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل لە قورئانی پیرۆزدا باسیان کراوە و چیرۆکیان هەیە، وە باوەڕمان پێیان هەیە بەڵام بەدووریان ئەزانین کە ئەو سیفەتانەیان هەبێت کە کتێبی جوولەکە و گاورەکان ئەیانداتە پاڵیان و بە بوختانێکی گەورەی ئەبینین.

یەکەم/ نوح علیه السلام.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– وابتدأ نوح حارث الأرض يغرس الكرم (٢٠) وشرب من الخمر فسكر وتكشف في داخل خيمته (٢١) فرأى حام أبو كنعان عورة أبيه فأخبر أخويه وهما في خارج الخيمة (٢٢) فأخذ سام ويافث الرداء وجعلاه على كتفيهما ومشيا إلى الوراء فغطيا عورة أبيهما، ووجههما إلى الجهة الأخرى، فلم يريا عورة أبيهما (٢٣) فلما أفاق نوح من خمره، علم ما صنع به ابنه الصغير (٢٤) فقال: (( ملعون كنعان! عبدا يكون لعبيد إخوته )) (٢٥) وقال: (( مبارك الرب إله سام وليكن كنعان عبدا له! (٢٦) ليوسع الله ليافث وليسكن في خيام سام وليكن كنعان عبدا له! )) (٢٧) (تكوين / ٩) وە نوح جوتیاری کرد و ڕەزە مێوێکی چاند (٢٠) وە لە شەرابی مێوەکەی خواردەوە و

سەرخۆش بوو وە لەناو چادرەکەیدا بەڕووتی ڕاکشا (٢١) جا حـامی بـاوکی کەنعان عـەورەتی باوکی بـینی و بـە دوو براکـەی وت و ئـەوان لـە دەرەوەی چادرەکە بوون (٢٢) جا سام و یافث پۆشاکێکیان هێنا و بـە شـانیاندا دا و پشتاوپشت بەرەو باوکیان چوون و عەورەتی باوکیان داپۆشـی و ڕوویـان لـە لاکەی تر بوو، بۆیە عەورەتی باوکیان نەبینی (٢٣) جا وەختیٚ نـوح هاتـەوە هۆش خۆی، زانـی کـوڕە بچـووکەکەی چـی پێکـردووە (٢٤) ئەوسـا وتـی: (کەنعان نەفرەتلێکراوە! ئەبێت بـە کۆیلـەی کۆیلـەکانی براکـانی) (٢٥) وە وتی: (ستایش بۆ یەزدان پەروەردگاری سام وە با کەنعان ببێـت بـە کۆیلـەی (٢٦) با خوا فراوانی بکات بۆ یافـث وە با لە چادرەکانی سـامدا بـژی و بـا کەنعان ببێت بە کۆیلەی) (٢٧).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ (آل عمـران - ٣٣) خـوا ئـادەم و نـوح و ئـالی ئیـبراهیم و ئـالی عیمرانـی هەڵبژاردووە بەسەر جیهاندا ﴾.
+ ﴿ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُ (الأنعام - ٨٤) وە نوحیش پێشتر هیدایەتماندا ﴾.

+ ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ (٥٩) قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ (٦٠) قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِي ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٦١) أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦٢) أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (٦٣) فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا عَمِينَ (٦٤) (الأعراف)

نوحمان نارد بۆ قەومەکەی جا وتی هۆ قەومەکەم بەس خوا بپەرستن هیچ خوایەکتان نییە غەیری ئەو، من ئەترسم لەسەرتان لە سزای ڕۆژێکی مەزن (٥٩) سەرۆکەکانی قەومەکەی وتیان ئێمە لە گومڕاییەکی ڕووندا تۆ ئەبینین (٦٠) وتی ئەی قەومەکەم گومڕانیم بەڵکو نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانم (٦١) پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێئەگەیەنم و نەسیحەتتان ئەکەم، وە لە خواوە ئەوە ئەزانم کە ئێوە نایزانن (٦٢) ئایا بەلاتانەوە سەیرە وەحییەك لەلای پەروەردگارتانەوە بۆتان بێت لەسەر پیاوێك لەخۆتان تا ئاگادارتان بکاتەوە و ئێوەش لە خوا بترسن بەڵکو ڕەحمتان پێبکرێت (٦٣) جا بەدرۆیانخستەوە وە ڕزگارمانکرد و ئەوانەشی لەگەڵیابوون لە کەشتییەکەدا،

وە ئەوانەی ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە نوقممانکردن، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی کوێربوون لە ئاست حەق (٦٤) ﴾.

+ ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ (٧١) فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ (٧٢) فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ (٧٣) (يونس) وە هەواڵی نوحیان بەسەردا بخوێنەرەوە کاتێك بە قەومەکەی وت ئەی قەومەکەم گەر بەلاتانەوە گەورەیە لەناوتانا بمێنمەوە و ئامۆژگاریتان بکەم بە ئایەتەکانی خوا، ئەوا من پشتم بە الله بەستووە ئێوەش خۆتان و شەریکەکانتان کۆبکەنەوە و با کارتان ئاشکرا و یەکلایی بێت، ئینجا چیتان لەدەستدێت بەرامبەرم بیکەن و مۆڵەتم مەدەن (٧١) وە گەر پشتهەڵکەن خۆ داوای پاداشتم لێنەکردوون، من پاداشتم تەنها لەسەر خوایە، وە فەرمانمپێکراوە کە لە موسوڵمانان بم (٧٢) جا بەدرۆیانخستەوە وە ڕزگارمانکرد وە ئەوانەشی لەگەڵیابوون لە کەشتییەکەدا و ئەمانمان کرد بە جێنشینی خەڵك، وە

ئەوانەمان نوقمکرد کە ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە، جا سەیربکە سەرئەنجامی ئەوانەی ئاگادارکرانەوە چۆن بوو (٧٣) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ (٢٥) أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٖ (٢٦) فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلِۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ (٢٧) قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةٗ مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ (٢٨) وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًاۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمٗا تَجْهَلُونَ (٢٩) وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (٣٠) وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِيٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًاۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمْ إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٣١) قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ (٣٢) قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ (٣٣) وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٣٤) أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجْرِمُونَ (٣٥) وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا

مَن قَدۡ ءَامَنَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ (٣٦) وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا
وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ (٣٧) وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ
وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا
نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ (٣٨) فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ
وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ (٣٩) حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا
ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ
ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ (٤٠) وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا
وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ (٤١) وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ
كَٱلۡجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن
مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ (٤٢) قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِۚ قَالَ لَا
عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ فَكَانَ مِنَ
ٱلۡمُغۡرَقِينَ (٤٣) وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ
وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ (٤٤)
وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ
أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ (٤٥) قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ
فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ (٤٦)
قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي
وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٤٧) قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ
عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ

(٤٨) تِلْكَ مِنْ أَنْبَاءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَٱصْبِرْ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ (٤٩) (هود) وە نوحمان نارد بۆ قەومەکەی من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام (٢٥) کە هیچ نەپەرستن غەیری الله، من ئەترسم لەسەرتان لە سزای ڕۆژێکی بەئێش (٢٦) جا سەرانی کافرانی قەومەکەی وتیان ئێمە تۆ وەك ئینسانێکی هاوشێوەی خۆمان ئەبینین، وە نابینین غەیری هەژار و بێ دەسەڵاتەکانمان شوێنتکەوتبن بێ بیرکردنەوە، وە نابینین فەزڵێکتان بەسەرمانەوە هەبێت، بەڵکو بە درۆزنتان ئەبینین (٢٧) وتی قەومەکەم نابینن لەسەر بەڵگەی ڕوونم لە پەروەردگارمەوە و ڕەحمەتێکی پێداوم لەلایەن خۆیەوە، بەڵام لەئێوە شاردراوەتەوە و نایبینن، خۆ بەزۆر نایخەینە دڵتانەوە و ئێوە ڕقتان لێیەتی (٢٨) وە ئەی قەومەکەم من لەسەری داوای سامانتان لێناکەم، من پاداشتم تەنها لەسەر خوایە، وە من ئەوانەی ئیمانیانهێناوە دەریاناناکەم، ئەوان بە خوای خۆیان ئەگەن، بەڵام من بە کەسانێکی نەفامتان ئەبینم (٢٩) وە ئەی قەومەکەم کێ سەرمئەخات لەبەرامبەر خوادا گەر دەریانبکەم، ئایا بیرناکەنەوە (٣٠) وە پێتان ناڵێم کە من خەزێنەکانی خوام لایە وە غەیب نازانم وە ناڵێم من فریشتەم وە بەوانە ناڵێم کە ئێوە لەچاوتانا سووکن کە خوا خێریان ناداتێ، خوا باشتر ئەزانێت چی لە دڵیاندایە، من لە ستەمکارانم

گەر وابکەم (٣١) وتیان ئەی نوح تۆ مشتومڕت کردین و زۆرت وت، جا ئەو سزایەی کە وەعدمان ئەدەیتێ بۆمانی بنێرە گەر لە ڕاستگۆکانیت (٣٢) وتی خوا ئەینێرێتە سەرتان گەر بیەوێت، وە ئێوە لێی ڕزگارتان نابێت (٣٣) وە نەسیحەتم سوودی نابێت بۆتان گەر بمەوێت نەسیحەتتان بکەم، گەر خوا بیەوێت گومڕاتان بکات و شایەنی هیدایەت نەبن، ئەو پەروەردگارتانە و بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە (٣٤) یان کافرانی مەککە ئەڵێن ئەمانەی هەڵبەستووە، بڵێ گەر هەڵمبەستبێ تاوانەکەی لەسەر خۆمە، وە من بەریم لەو تاوانانەی ئێوە ئەیانکەن (٣٥) وە وەحی بۆ نوح هات کە لە قەومەکەت کەس ئیمان ناهێنێت جگە لەوانەی ئیمانیانهێناوە، وە خەفەت مەخۆ لەوانەی ئەیکەن (٣٦) وە کەشتییەکە دروستبکە لەپێش چاومان و بە فەرمانمان، وە قسەم لەگەڵدا مەکە لەسەر ئەوانەی کە کوفریانکردووە، ئەوان بێگومان نوقم ئەبن (٣٧) وە کەشتییەکەی دروستئەکرد و هەریەکێ لە قەومەکەی بەلایا بڕۆشتایە گاڵتەیان پێئەکرد، وتی گەر ئەمڕۆ گاڵتەمان پێبکەن ئەوا ئێمەش سبەی گاڵتەتان پێئەکەین وەك چۆن ئێوە گاڵتەئەکەن (٣٨) جا ئەوسا ئەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت سووکی ئەکات، وە لە قیامەتیشدا سزایەکی بەردەوامی لەسەرئەبێت (٣٩) هەتا فەرمانەکەمان هات و سەر زەوی گشت ئاوی لێ هەڵقوڵا وتمان لە کەشتییەکەدا لە هەموو شتێك جووتێك هەڵگرە و

کەسوکاریشت جگە لەوەی کە پێشتر بڕیاری لەسەردراوە و لە کافرانە وە ئەوەی ئیمانیهێناوە، وە ئیمانی نەهێنا لەگەڵیا کەمێك نەبێت (٤٠) وە وتی سواری بن بەناوی خواوە ڕۆشتنی و لەنگەرگرتنی، بێگومان پەروەردگارم لێبووردەیە بۆ تاوانەکان و بەبەزەییە بۆ ئیمانداران (٤١) وە کاتێك کەشتییەکە بەناو شەپۆلی وەك شاخدا ئەڕۆشت، وە نوح هاواری کوڕەکەی کرد و دوور بوو لێی هۆ کوڕم لەگەڵمان سەرکەوە و لەگەڵ کافرەکان مەبە (٤٢) وتی ئەچمە سەر شاخێك کە لە ئاوەکە بمپارێزێت، وتی هیچ پارێزەرێك نییە ئەمڕۆ لە فەرمانی خوا ئیللا کەسێك خۆی رەحمی پێبکات، وە شەپۆلەکە کەوتە نێوانیانەوە و لە نوقمبووەکان بوو (٤٣) وە وترا ئەی زەوی ئاوەکەت قووتبدە وە ئەی ئاسمان باران بگرەرەوە، وە ئاوەکە کەمیکرد، وە فەرمانەکە جێبەجێبوو وە کەشتییەکە لەسەر جودی نیشت، وە وترا با میللەتی زاڵم دووربن (٤٤) وە نوح هاواری پەروەردگاری کرد جا وتی پەروەردگارم کوڕەکەم لە کەسوکاری منە وە وەعدی تۆش حەقە وە تۆ دادوەرترین حاکمیت (٤٥) وتی ئەی نوح ئەو لە کەسوکارت نییە، ئەو کردەوەی باشی نەکرد، جا داوای شتێکم لێمەکە کە نایزانیت، من ئامۆژگاریت ئەکەم کە لە نەفامەکان نەبیت (٤٦) وتی پەروەردگارم من پەنا بەتۆ ئەگرم کە داوای شتێکت لێبکەم زانستم پێی نەبێت، وە گەر

لێمنەبووریت و رەحمم پێنەکەیت لە دۆڕاوەکان ئەبم (٤٧) وترا ئەی نــوح بــە سەلامەتی لە ئێمەوە دابەزە و بەرەکەتی ئێمە لەسەر خۆت و ئەو ئوممەتانەی لە نەوەی ئەوانەن کە لەگەڵتان، وە کەسانی تر لە نەوەیان ئەیانژیێنین پاشــان سزای بەئێش لەئێمەوە ئەیانگرێتەوە (٤٨) ئەمە لە هەواڵەکانی غەیبــە بــۆ تۆی ئەنێرین، نە تۆ ئەتزانی و نە قەومەکەت پــێش ئەمــە، جــا ســەبربگرە، بێگومان سەرئەنجام هەر بۆ تەقواکارانە (٤٩) ﴾.

بەگوێرەی کتێبی جولەکــە و گاورەکــان نــوح علیــە الســلام خــەمری خــواردووە و سەرخۆش بووە، وە بە بیٚ هۆشی خۆی ڕووتکردووەتــەوە و عــەورەتی بینــراوە، کــە ئەوە شایەنی پێغەمبەرێکی خوا نییە وایلێبێت. وە کوڕەکەی بەلەعنەت کــردووە و سزای داوە، لەکاتێکدا کوڕەکەی تاوانێکی وای نەکردووە شایەنی لەعنەت بێت. وە گــەر کەســێك شــایەنی ســزا بێــت ئــەو کەســەیە کــە ســەرخۆش بــووە و خــۆی ڕووتکردووەتەوە، نەوەك ئەو کەسەی بیٚ مەبەست بەسەر ئەم حاڵەتەیا کەوتووە. وە دوعای لە کوڕەکەی کرد ببێت بە کۆیلەی براکانی، وە ئەم سیفەتەش زۆر دوورە لەم پێغەمبەرە بەڕێزەوە علیە السلام.

بەڵام لەقورئانی پیرۆزدا نوح علیه السلام لە پێغەمبەرە پێشەنگ و اولو العزمەکانە. وە زۆر بەسەبر بووە لەسەر بانگەوازی قەومەکەی و نەسیحەتکار و دڵسۆز بووە، نەوەك لەعنەتکار و تووڕە. وە هیچ کام لەو سیفەتە ناشرینانەی تیا نەبووە کە کتێبی جولەکە و گاورەکان ئەیانداتە پاڵی. وە کوڕێکی باوەڕی پێی نەهێناوە و ئەم هەر دڵسۆزانە هەوڵی لەگەڵ داوە و نەسیحەتی کردووە و لەخوای گەورەش پاڕاوەتەوە لێی خۆشببێت.

دووەم/ ئیبراهیم علیه السلام.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– وقال إبراهيم لأقدم خدام بيته، المولى على جميع ما له: (( ضع يدك تحت فخذي، (٢) فأستحلفك بالرب (٣) ... فوضع الخادم يده تحت فخذ سيده وحلف له (٩) (تكوين / ٢٤) وە ئیبراهیم بە کۆنترین خزمەتکارانی ماڵەکەی وت، کە سەرپەرشتیاری هەموو ئەو شتانە بوو کە هەیبوو: (بە دەستت ئەندامی نێرینەم و هەردوو گونم بگرە (٢) با سوێندت بدەم بە یەزدان (٣) ... جا خزمەتکارەکە ئەندامەکەی ئیبراهیم و هەردوو گونی گرت و سوێندی بۆ خوارد (٩).

# بابەتی سێیەم

## دەقەکان دەربارەی ڕۆژی قیامەت

یەکێك لە بابەتە گەورە و زۆر گرنگەکان بابەتی چارەنوس و سەرئەنجامی مرۆڤ و گەردوون و زەوییە. وە دەستکەوتنی وەڵامە لەسەر: ئایا دوای مردن چی ڕووئەدات؟ زەوی و ژیان لەسەری هەتاهەتاییە یان کۆتایی دێت؟ واتای ژیان چییە؟ هۆی بوونمان چییە؟ شوێنی جێگیربوونی مرۆڤەکان دوای مردن کوێیە؟ زاڵم لە دنیایا لە سزا ڕابکات ئیتر تەواو سزا وەرناگرێت؟ بوونەوەری تر جیا لە مرۆڤەکان هەیە؟ وە چەندین پرسیاری تر کە لای مرۆڤ دروستئەبێت و پێویستی بە خوایەکی زانا و کاربەجێیە وەڵامیان بداتەوە و بۆیان ڕوونبکاتەوە.

وە مرۆڤی عاقڵ ئامادەیە لە ژیان و سامانی سەرفبکات بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە. چونکە بابەتی دوای مردن زۆر شتی لەسەر بەندە، نەك تەنها بۆ دوای مردن بەڵکو بۆ ژیانی دنیاش. چونکە گەر دوای مردن ژیان نەبێت و ببینەوە بە هیچ، ئەوا ئەشێ مرۆڤەکان بڵێن: ئیتر چ پێویست ئەکات دڵم بەم دنیایە خۆشبێت و چ ئەمەلێکم هەبێت؟ مادەم هەر ئەم ژیانە کورتەیە و ئەچمەوە دنیای

نەبوون و عەدەم با هەتا ئەتوانم ڕابوێرم و خۆشی و لەزەتەکان تاقیبکەمەوە، بێ گوێدانە زوڵم و داد و حەڵاڵ و حەرام. وە چ پێویست ئەکات باش بم یان خراپ؟ ڕاستگۆ یان درۆزن؟ دەستپاك یان دەستپیس؟

بەڵام گەر زانی و دڵنیابوو کە بێگومان دوای مردن زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە و پاداشت و سزا هەیە، وە ئەم دنیایە تاقیکردنەوەیە و ئەوەی تیای دەربچێت بەهەشتییە و ئەوەی دەرنەچێت جەهەننەمییە. وە خوایەکی بەتوانا دروستی کردووە لە نەبوونەوە و ئەشتوانێت گەر مراندی زیندووی بکاتەوە و هەموو کردەوەکانی نیشانبداتەوە، وە شەرع و حەڵاڵ و حەرامی بۆ داناوە و بە پێغەمبەراندا بۆی ناردووە و لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەران پاداشت و سزا هەیە. ئەوا ئەوکاتە هۆشی لای کردەوە و قسەکانی ئەبێت، وە لەبەر لێپرسینەوەی قیامەت سەرپێچی خوا ناکات. وە پاڵنەرێکی گەورەی ئەبێت کە کاری چاکە بکات. وە ژیان بێ مەعنا نابینێت و هەوڵی خۆکوشتن نادات، وە زوڵم و تەعەدا ناکات.

جا لە کتێبی جولەکە و گاورەکاندا زۆر کەم و دەگمەن باسی بابەتی ژیانی دوای مردن و زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە کراوە[٢٥]. وە سەرەڕای کەمییان دەقەکان ناڕوونن و وێنەیەکی تەواو و ڕێکوپێك نادەن بەدەستەوە، کە نەك وەڵامی پرسیار

نادەنەوە بەڵکو پرسیار دروستئەکەن. وە جولەکە و گاورەکان بەم هۆیەوە لەناو خۆیاندا چەندین بیروباوەڕی جیایان بۆ دروستبووە سەبارەت بەم بابەتە و ڕاجیان لەسەری[٢٥].

بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا دەقەکان زۆر و ڕوونن کە موسوڵمان بەرچاوڕوون ئەکەن دەربارەی ئەو ڕۆژە. وە زۆر وردەکاری و بابەت باسکراون کە لە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکی تردا باسنەکراون. وە وەڵامی پرسیاری زۆری مرۆڤەکان ئەداتەوە.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– والأحياء يعلمون أنهم سيموتون أما الأموات فلا يعلمون شيئا ولم يبق لهم جزاء، إذ قد نسي ذكرهم (٥) حبهم وبغضهم وغيرتهم قد هلكت وليس لهم نصيب للأبد في كل ما يجري تحت الشمس (٦) (الجامعة / ٩) وە زیندووەکان ئەزانن کە ئەمرن بەڵام مردووەکان هیچ نازانن وە هیچ پاداشتیان نەماوە لەمەودوا، چونکە یادیان نەماوە (٥) خۆشویستن و ڕق و غیرەتیان لەناوچووە، وە هیچ بەشێکیان نییە تاهەتایە لە هەموو ئەوەی لەژێر خۆردا ڕووئەدات (٦).

– فافرح أيها الشاب في صباك وليسعدك قلبك في أيام شبابك وسر في طرق قلبك وبحسب رؤية عينيك لكن اعلم أن الله من أجل هذه كلها سيحضرك لتدان عليها (الجامعة ١١/ ٩) جا ئەی گەنج دڵخۆشبە لە لاوێتیتدا وە با دڵت خۆشحاڵت بکات لە ڕۆژانی گەنجێتیتدا، وە بڕۆ بە ڕێگاکانی دڵتدا وە بەپێی بینینی چاوەکانت، بەڵام بزانە کە خوا لەسەر هەموو ئەوانە ئەتهێنێت تا حوکم بدرێیت لەسەری.

– لأن الله سيحضر كل عمل فيدين كل خفي، خيرا كان أم شرا (الجامعة ١٢/ ١٤) چونکە خوا هەموو کردەوەیەك ئەهێنێت وە حوکم لەسەر هەموو شاردراوەیەك ئەدات، چاك بێت یان خراپ.

– فقالت المرأة: " من أصعد لك؟ ". قال: " أصعدي لي صموئيل " (صموئيل الأول ٢٨/ ١١) جا ئافرەتەکە وتی: "کێت بۆ بێنم لە مردووەکان؟". وتی: "صاموئیلم بۆ بێنە".

– وسمعت صوتا جهيرا من العرش يقول: (( هوذا مسكن الله مع الناس، فسيسكن معهم وهم سيكونون شعوبه وهو سيكون ((الله معهم )) (٣) وسيمسح كل دمعة من عيونهم. وللموت لن يبقى وجود بعد الآن، ولا للحزن ولا للصراخ ولا للألم لن يبقى وجود بعد الآن، لأن العالم القديم قد زال )) (٤) وقال الجالس على العرش: (( هاءنذا أجعل كل شيء جديدا )) وقال: ((

أكتب: هـذا الكـلام صـدق وحـق )) (٥) (رؤيـا يوحنـا / ٢١) وه دەنگێكـی گەورەم بيست لە عەرشەوە ئەيوت: (ئەوەتا جێی نيشتنی خوا لەگەڵ خەڵك، جا لەگـەڵيان ئـەژی و ئـەوانيش گەلـەكانی ئـەبن وە ئـەويش خـوا ئـەبێت لەگەڵيان (٣) وە هەموو فرمێسكێك ئەسڕێت لـە چـاويان. وە مـردن هـيچ بوونی نامێنێت دوای ئەمە، وە خەفـەتيش وە هـاواريش وە ئـازاريش هـيچ بوونی نامێنێت دوای ئەمە، چونكە جيهانە كۆنەكە تـەواوبوو و نـەما) (٤) وە دانيشتووەكە لەسەر تەخت وتی: (ئەوەتا من هەموو شتێك نـوێ ئەكـەم) وە وتی: (بنووسە: ئەم قسەيە ڕاست و حەقە) (٥).

قورئانی پيرۆز:

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ (الحجـرات - ١٣)

ئەی خەڵك ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێيەك دروستكردووە، وە كردوومانن بـە گەل و هۆزەوە تـا يـەكتر بناسـن، بـەڕێزترينتان لای خـوا بەتەقواترينتانـە، بەدڵنيايی خوا زانا و شارەزايە ﴾.

+ ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (آل عمران - ٥٩) نموونەی عیسا لای خوا وەك نموونەی ئادەمە، لە گڵ دروستیکرد پاشان پێی وت ببە و ئەبێت ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٍ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٍ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلًا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗا (الحج - ٥) ئەی خەڵکینە گەر لە گوماندان لە زیندووبوونەوە ئەوا ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروستکردووە پاشان لە دڵۆپە تۆوێك پاشان لە پارچە خوێنێکی هەڵواسراو پاشان لە پارچە گۆشتێك شێوەدار و بێ شێوە تا بۆتان ڕوونبکەینەوە، وە چیمان بوێت ئەوە لە ڕەحمەکاندا جێگیر ئەکەین تا کاتێکی دیاریکراو، پاشان بە کۆرپەیی دەرتانئەکەین پاشان تا بگەنە ئەوپەڕی تواناتان، وە تیاتانە ئەمرێندرێت و تیاتانە ئەگەیەنرێت بە ئەوپەڕی تەمەن تا دوای توانا و زانین هیچ نەزانێت ﴾.

+ ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ (فاطر - ١١) وە خوا لە خۆڵ دروستیکردوون پاشان لە تۆو پاشان کردوونی بە جووتێك نێر و مێ، وە

هەرچییەك ئافرەت هەڵیگرێت بە سك و دایبنێت ئیللا بە ئاگاداری خوایە، وە هەرکەس تەمەنی بدرێتێ یان لە تەمەنی کورتبکرێت ئیللا لە نوسراوێکدایە، بەدڵنیایی ئەوە لەسەر خوا ئاسانە ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ (١٤) ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ (١٦) (المؤمنون) وە بێگومان ئینسانمان لە دەرهێنراوی گڵ دروستکردووە (١٢) پاشان کردوومانە بە تۆوێك لە جێیەکی جێگیردا (١٣) پاشان تۆوەکەمان کردووە بە هەڵواسراو جا هەڵواسراوەکەمان کردووە بە پارچە گۆشت جا پارچە گۆشتەکەمان کرد بە ئێسقان جا ئێسقانەکەمان داپۆشی بە گۆشت، پاشان رۆحمان کرد بە بەریا و بوو بە مرۆڤێکی تر، جا خوا بەرەکەتی زۆرە و باشترین دروستکەرە (١٤) پاشان ئێوە دوای ئەوە ئەمرن (١٥) پاشان ئێوە ڕۆژی هەڵسانەوە زیندووئەکرێنەوە (١٦) ﴾.

+ ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا (الأحزاب - ٧٢) ئێمە ئەمانەتی دینمان خستە پێش ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان

بـەڵام ڕەتیـانکردەوە هـەڵیگرن و داوای ڕەحمـەتی خوایـان کـرد وە ئینسـان هەڵیگرت، ئەو زۆر ستەمکار و نەفامە ﴾.

+ ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٣٩) (البقرة) وتمان هەمووتان دابەزنە سـەر زەوی، جا لە منەوە هیدایەتتان بۆ دێت جـا هەرکـەس شـوێن هیدایەتەکـەم بکەوێت ئەوا ترسیان لەسـەر نییـە و خەفـەتیش نـاخۆن (٣٨) وە ئەوانـەی کوفریان کرد و ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە ئائەوانە هاوەڵانی ئاگرن ئـەوان تیایا ئەمێننەوە بە نەمری (٣٩) ﴾.

+ ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ (١٧٢) أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ (١٧٣) وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ (١٧٤) (الأعـراف) وە کـە پـەروەردگارت لـە ئـادەم لـە پشـتیان هەموو نەوەکانیانی دەرکرد وە کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە ئایـا مـن پەروەردگارتان نیم، وتیان بەڵێ شایەتین، تا لە ڕۆژی قیامـەتا نـەڵێن ئێمـە لەمە غافڵ و بێ ئاگا بووین (١٧٢) یان بڵێن ئـەوە بـاو و باپیرانمـان بـوون

شیرکیان کرد پێشتر و ئێمە نەوە بووین دوایان، ئایا ئەمانفەوتێنیت بە شتێك کە خراپەکاران کردیان (١٧٣) وە بەو شێوەیە ئایەتەکان ڕوونئەکەینەوە وە بەڵکو بگەڕێنەوە (١٧٤) ﴾.

+ ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (٥٦) مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ (٥٧) (الذاریات) وە ئینس و جننم دروستنەکردووە بۆ ئەوە نەبێت کە بمپەرستن (٥٦) رزقم لێیانەوە ناوێت و نامەوێت خواردنم بدەن (٥٧) ﴾.

+ ﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا (القصص - ٧٧) وە هەوڵ بۆ ئەوە بدە کە خوا داویە پێت لە ماڵی کۆتایی، وە بەشەکەی خۆشت بیرنەچێت لە دنیا ﴾.

+ ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ (آل عمران - ١٨٥) هەموو نەفسێك مردن ئەچێژێت، وە پاداشتەکانتان لە قیامەتا وەرئەگرنەوە، جا هەرکەس لە ئاگر دوورخرێتەوە و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بردوویەتییەوە، وە ژیانی دنیا هیچ نیە جگە لە ڕابواردن و ئاواتێکی کەم ﴾.

+ ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ (٣٤) كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ (٣٥) (الأنبياء) وە نەمریمان نەداوە بە هیچ مرۆڤێك پێش تۆ، ئایا گەر بمریت ئەوان نەمرن (٣٤) هەموو نەفسێك مردن ئەچێژێت، وە بە شەڕ و خێر تاقیتانئەكەینەوە وە بۆ لامان ئەگەڕێنەوە (٣٥) ﴾.

+ ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ (العنكبوت - ٥٧) هەموو نەفسێك مردن ئەچێژێت، پاشان بۆ لامان ئەگەڕێنەوە ﴾.

+ ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ (٩٩) لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٠٠) فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ (١٠١) فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ (١٠٢) وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ (١٠٣) تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ (١٠٤) أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (١٠٥) قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ (١٠٦) رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ (١٠٧) قَالَ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ (١٠٨) إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ (١٠٩) فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ

سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ (١١٠) إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ
ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ (١١١) قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ
سِنِينَ (١١٢) قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ (١١٣) قَٰلَ إِن
لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ (١١٤) أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا
وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ (١١٥) فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ
ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ (١١٦) وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ
فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ (١١٧) وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ
وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ (١١٨) (المؤمنون) هەتا مردن دێت بۆ
یەکێکیان ئەڵێت خوایە بمگەڕێننەوە (٩٩) بەڵکو کارێکی چاك بکەم لەوەی
جێمهێشتووە، نەخێر ئەوە تەنها قسەیەکە ئەیلێت وە لە پێشیانەوە
بەرزەخێکە تا ئەو ڕۆژەی هەڵئەسێنرێنەوە (١٠٠) جا کە فووکرا بە کەڕەنادا
ئەوا نەسەب نامێنێت لە بەینیانا ئەو ڕۆژە وە لە یەکتر ناپرسن (١٠١) جا
هەرکەس کێشراوەکانی قورس بن ئائەوانە سەرفرازن (١٠٢) وە ئەوەی
کێشراوەکانی سووك بێت ئەوانە ئەوانەن کە خۆیان دۆڕاندووە لە جەهەننەمدا
نەمرن (١٠٣) ئاگر ڕوخساریان دائەپۆشێت وە تیایدا لێوشۆڕن (١٠٤) ئایا
ئایەتەکانم بەسەرتاندا نەئەخوێنرایەوە و ئێوەش پێیان بێباوەڕ بوون (١٠٥)
وتیان پەروەردگارمان ئارەزوومان بەسەرماندا زاڵ بوو وە میللەتێکی گومڕا

بووین (١٠٦) پەروەردگارمان دەرمانکە تیای جا گەر گەڕاینەوە بۆ کوفر
ئەوا زاڵمین (١٠٧) وتی بێدەنگبن تیای و قسەم لەگەڵ مەکەن (١٠٨) لە
دنیا کۆمەڵێك لە عەبدەکانم ئەیانوت پەروەردگارمان ئیمانمان هێنا جا
لێمانببوورە و ڕەحمان پێبکە، وە تۆ باشترین بەبەزەییت (١٠٩) جا ئێوە بە
گاڵتە گرتتانن تا یادی منتان لەبیرکرد، وە پێیان پێئەکەنین (١١٠) من
ئەمڕۆ پاداشتمدانەوە بەوەی سەبریانگرت و ئەوان براوەن (١١١) وتی
چەندێك لە زەویدا مانەوە بە ژمارەی ساڵ (١١٢) وتیان ڕۆژێك یان بەشێکی
ڕۆژێك ماینەوە جا لەوانە بپرسە کە حسابیان کردووە (١١٣) وتی تەنها
کەمێك مانەوە گەر بتانزانیایە (١١٤) ئایا وائەزانن ئێوەمان بۆ گاڵتە
دروستکردووە وە ئێوە بۆ لامان ناگەڕێنەوە (١١٥) جا بەرزی بۆ الله پاشای
حەق، هیچ خوایەکی حەق نییە جگە لەو پەروەردگاری تەختی بەڕێز (١١٦)
وە هەرکەس عیبادەتی خوایەکی تر بکات لەگەڵ الله دا کە هیچ بەڵگەیەکی
نییە لەخواوە ئەوا لێپرسینەوەی لەسەر پەروەردگارێتی، بێگومان کافران
سەرفراز ناکات (١١٧) وە بڵێ پەروەردگارم ببوورە و ڕەحم بکە وە تۆ
باشترین ڕەحمکەریت (١١٨) ﴾.

+ ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ
وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ (٥٠) ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ

لِّلۡعَبِيدِ (٥١) كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ (٥٢) (الأنفال) وە گەر ئەبینیت كە ئەوانەی كوفریانكردووە مەلائیكەتەكان ئەیانمرێنن لە ڕوخسار و پشتیان ئەدەن وە سزای سووتێنەر بچێژن (٥٠) ئەوە بەهۆی ئەوەیە كە دەستەكانتان پێشیخستووە لە كردەوە، وە خوا زاڵم نییە بۆ عەبدەكان (٥١) وەك كردەوەی ئالی فیرعەون و ئەوانەی پێشیان، كافربوون بە ئایەتەكانی خوا جا خوا بە تاوانەكانیان بردنی، بێگومان خوا بەهێزە و سزای توندە (٥٢) ﴾.

+ ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ (محمد - ٢٧) جا چۆنە كە مەلائیكەتەكان ئەیانمرێنن لە ڕوخسار و پشتیان ئەدەن ﴾.

+ ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ (٤٥) ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ (٤٦) وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ (٤٧) قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ (٤٨) (غافر) جا خوا پاراستی لە فێڵی خراپیان، وە ئەشكەنجەی خراپ توشی ئالی فیرعەون بوو (٤٥) ئەخرێنە پێش ئاگر بە بەیانیان و ئێواران، وە لە قیامەتیشدا ئالی فیرعەون بخەنە توندترین سزاوە (٤٦) وە كە دەمەقاڵێ

ئەکــەن لــە ئــاگردا جــا لاوازەکــان بــە خۆبەگەورەزانــەکان ئــەڵێن ئێمــە
شوێنکەوتووتان بووین جا ئایا ئێوە بەشێك لە ئاگرمان لەسەر لائەبەن (٤٧)
خۆبەگەورەزانەکان وتیان ئێمە هــەموومان لــە ئــاگراین تــازە خــوا حــوکمی
کردووە لە بەینی عەبدەکانا (٤٨) ﴾.

+ ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٤٨) مَا يَنظُرُونَ إِلَّا
صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ (٤٩) فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ
إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ (٥٠) وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ
رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ (٥١) قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ
ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ (٥٢) إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ
جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ (٥٣) فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا
مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٥٤) إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَٰكِهُونَ (٥٥) هُمْ
وَأَزْوَٰجُهُمْ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ (٥٦) لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا
يَدَّعُونَ (٥٧) سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ (٥٨) وَٱمْتَٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا
ٱلْمُجْرِمُونَ (٥٩) أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ
لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ (٦٠) وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ (٦١) وَلَقَدْ أَضَلَّ
مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ (٦٢) هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ
تُوعَدُونَ (٦٣) ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ (٦٤) ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ

أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ (٦٥) وَلَوۡ نَشَآءُ
لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ (٦٦) وَلَوۡ نَشَآءُ
لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ (٦٧) وَمَن
نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ (٦٨) وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي
لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ (٦٩) لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ
عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ (٧٠) أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ
لَهَا مَٰلِكُونَ (٧١) وَذَلَّلۡنَٰهَا لَهُمۡ فَمِنۡهَا رَكُوبُهُمۡ وَمِنۡهَا يَأۡكُلُونَ (٧٢) وَلَهُمۡ
فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ (٧٣) وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ
لَّعَلَّهُمۡ يُنصَرُونَ (٧٤) لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَهُمۡ وَهُمۡ لَهُمۡ جُندٞ مُّحۡضَرُونَ
(٧٥) فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّا نَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ (٧٦) أَوَلَمۡ يَرَ
ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ (٧٧) وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا
وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ (٧٨) قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ
أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ (٧٩) ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ
ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ (٨٠) أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ (٨١) إِنَّمَآ
أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (٨٢) فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ
مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ (٨٣) (يس) وە ئەڵێن ئەم وەعدی

قیامەتە کەیە گەر ڕاستگۆن (٤٨) چاوەڕێی هیچ نین تەنها یەك هاوار نەبێت هەموویان ئەبات وە ئەوان مشتومڕی دنیایانە (٤٩) جا ناتوانن وەسێت بکەن یان بگەڕێنەوە ناو کەسوکاریان (٥٠) وە فوو بە کەڕەنادا کرا جا ئەوان بە خێرایی بۆ لای پەروەردگاریان ئەڕۆن (٥١) وتیان هاوار بۆخۆمان کێ ئێمەی هەستانەوە لە گۆڕەکانمان، ئەمە ئەوەیە کە خوا وەعدی دا و پێغەمبەران ڕاستیانکرد (٥٢) ئەمە تەنها یەك دەنگ بوو جا هەموویان لەلامان ئامادەن (٥٣) جا ئەمڕۆ کەس هیچ زوڵمی لێناکرێت، وە پاداشتتان نادرێتەوە هی ئەوە نەبێت کە کردووتانە (٥٤) بێگومان هاوەڵانی بەهەشت ئەمڕۆ سەرقاڵی خۆشین (٥٥) ئەوان و خێزانەکانیان لە سێبەردان لەسەر جێ دانیشتوون (٥٦) میوەی تیایە بۆیان، وە چی داواکەن هەیانە (٥٧) سەلامیان لێ ئەکرێت لە پەروەردگارێکی بەرەحمەوە (٥٨) وە ئەی تاوانباران ئەمڕۆ جیاببنەوە (٥٩) ئایا نەوەی ئادەم پەیمانم لێ وەرنەگرتن کە شەیتان نەپەرستن، ئەو دوژمنێکی ڕوونتانە (٦٠) وە کە بمپەرستن ئەوە ڕێی ڕاستە (٦١) وە خەڵکێکی زۆری لێتان گومراکرد، ئایا بۆ عاقڵ نەبوون (٦٢) ئەمە ئەو جەهەننەمەیە کە پەیمانتان درایە (٦٣) ئەمڕۆ پێیبگەن بەو کوفرەی ئەتانکرد (٦٤) ئەمڕۆ مۆر لە دەمیان ئەدەین و دەستەکانیان قسەمان لەگەڵ ئەکەن و پێیەکانیان شایەتی ئەدەن بەوەی دەستیانئەخست

(٦٥) وە گەر بمانویستایە چاوەکانیانمان ئەسڕییەوە جا هەوڵی گەشتن بە ڕێی ڕاستیان ئەدا جا چی ئەبینن (٦٦) وە گەر بمانویستایە لەجێی خۆیاندا ئەمانکردن بە بەرد جا نەیانئەتوانی بجووڵێن و بگەڕێنەوە (٦٧) وە ئەوەی تەمەنی بدەین لاوازی ئەکەین لە لەشدا، ئایا عاقڵ نابن (٦٨) وە فێری شیعرمان نەکردووە و بۆیشی نییە، بەڵکو ئەمە تەنها زیکرە و قورئانێکی ڕوونە (٦٩) تا ئەوە ئاگادار بکات کە زیندووە، وە قسەی سزا بەسەر کافراندا جێبەجێ ئەبێت (٧٠) ئایا نەیانبینیوە ئێمە بەدەستمان بۆمان دروستکردوون ئاژەڵ جا ئەوان خاوەنیانن (٧١) وە بۆیانمان ژێربار کردوون، جا هەیانە سواری ئەبن و هەیانە ئەیخۆن (٧٢) وە بۆیان تیایەتی سوودی تر و خواردنەوە، ئایا بۆ سوپاس ناکەن (٧٣) وە جگە لە خوا خوای تریان بڕیارداوە تا بەڵکو سەربخرێن (٧٤) ناتوانن سەریانخەن، وە ئەمان بۆیان سەربازی ئامادەن (٧٥) جا قسەکەیان خەمبارت نەکات، ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە ئەیشارنەوە و دەریئەخەن (٧٦) ئایا ئینسان نەیدیوە کە ئێمە لە تۆوێك دروستمانکردووە جا ئەو زۆر دوژمنایەتی ئەکات و ڕوونە لە گفتوگۆ (٧٧) وە نموونەی بۆمان هێنایەوە و دروستکردنی خۆی بیرچووەوە، وتی کێ ئێسقان زیندووئەکاتەوە لەکاتێکا ڕزیوە (٧٨) بڵێ ئەوە زیندووی ئەکاتەوە کە یەکەمجار دروستیکردووە وە ئەو زانایە بە هەموو دروستکراوێك (٧٩)

ئەوەی کە لە درەختی سەوزەوە ئاگری بۆتان دروستکردووە جا ئێوە لێوەی ئاگر ئەکەنەوە (٨٠) ئایا ئەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ناتوانێت هاوشێوەیان دروستکات، بەڵێ وە ئەو زۆر دروستکەرە و زانایە (٨١) فەرمانەکەی بەو شێوەیەیە کە شتێکی بوێت کە پێی بڵێت ببە جا ئەبێت (٨٢) جا پاکی بۆ ئەوەی موڵکی هەموو شتێکی بەدەستە و بۆ لای ئەو ئەگەڕێنرێنەوە (٨٣) ﴾.

+ ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (٦٧) وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ (٦٨) وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ (٦٩) وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَا يَفۡعَلُونَ (٧٠) وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ (٧١) قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ (٧٢) وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ (٧٣) وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ

أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ (٧٤) وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ
بِحَمْدِ رَبِّهِمْۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّۚ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٧٥)
(الزمر) وە خوایان بەگەورە نەزانیوە بە حەقی خۆی، وە هەموو ئاسمانەکان و زەوی لە مشتی ڕاستیدایە لە قیامەتدا بەلوولکراوی، پاکی و بەرزی بۆ ئەو لەوەی ئەیکەن بە شەریکی (٦٧) وە فوو بە کەڕەنادا کرا جا ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەوییە مرد جگە لەوەی خوا ئەیەوێت، پاشان فوویەکی تری پیا کرا و ئەوان هەستاون ئەڕوانن (٦٨) وە زەوی ڕووناکبووەوە بە نوری پەروەردگاری، وە پەڕاو دانرا، وە پێغەمبەران و شەهیدەکان هێنران، وە بە داد حوکم کرا لەنێوانیان وە ئەوان زوڵمیان لێناکرێت (٦٩) وە هەموو نەفسێك بەوەی کە کردبووی پاداشت درا وە ئەو زاناترە بەوەی ئەیانکرد (٧٠) وە ئەوانەی کوفریانکرد پۆل پۆل بەڕێکران بەرەو جەهەننەم، هەتا کاتێ هاتنە لای دەرگاکانی کرانەوە وە دەرگاوانەکانی وتیان ئایا پێغەمبەرتان لەخۆتان بۆ نەهات ئایەتەکانی پەروەردگارتانیان بۆ ئەخوێندن وە ئاگاداریانکردن لە گەشتن بەم ڕۆژەتان، وتیان بەڵێ، بەڵام وتەی سزا جێبەجێ بوو لەسەر کافران (٧١) وترا بچنە جەهەننەمەوە لە دەرگاکانیەوە تیایا بە نەمری، جا خراپترین جێی خۆبەگەورەزانەکانە (٧٢) وە ئەوانەی تەقوای پەروەردگاریان کردبوو پۆل پۆل بران بەرەو بەهەشت، هەتا کە هاتنە

لای وە دەرگاکانی کرانەوە وە دەرگاوانەکانی وتیان سەلامتان لەسەربێت، کەسانی چاك بوون دە بچنە ناوی بە نەمری (٧٣) وە وتیان حەمد و سوپاس بۆ خوا کە وەعدەکەی ڕاستبوو لەگەڵمان، وە کردینی بە میراتگری زەوی چۆنمان بوێت لە بەهەشتدا نیشتەجێین، جا باشترین پاداشتی ئەوانەیە کاریانکردووە (٧٤) وە فریشتەکان ئەبینیت دەوری عەرشیان داوە تەسبیحاتی پەروەردگاریان ئەکەن، وە بە حەق بڕیار درا لەنێوانیان، وە وترا سوپاس بۆ خوا پەروەردگاری جیهانیان (٧٥) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ (١٦) إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ (١٧) مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ (١٨) وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ (١٩) وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ (٢٠) وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ (٢١) لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ (٢٢) وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ (٢٣) أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٖ (٢٤) مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٖ مُّرِيبٍ (٢٥) ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلۡقِيَاهُ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ (٢٦) قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٖ (٢٧) قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ (٢٨) مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ

أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ (٢٩) يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ
(٣٠) وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ (٣١) هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ
حَفِيظٖ (٣٢) مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ (٣٣) ٱدۡخُلُوهَا
بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ (٣٤) لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ (٣٥) (ق)

وە ئینسانمان دروستکردووە وە ئەزانین نەفسی چی پیا دێت، وە ئێمە لێی نزیکترین لە شادەماری ملی (١٦) کە دوو نووسەرەکە لە ڕاست و چەپەوە دانیشتوون و ئەنوسن (١٧) هیچ قسەیەك لەفز ناکات ئیللا چاودێر و ئامادەیەکی لایە (١٨) وە سەختی گیانکێشان هات کە حەقە، ئەمە ئەوەیە کە لێی ڕاتئەکرد (١٩) وە فوو کرا بە کەڕەنادا ئەوە ڕۆژی هەڕەشەکەیە (٢٠) وە هەموو نەفسێك هات و لەگەڵیا بەڕێکەرێك و شایەتێکی لەگەڵە (٢١) لە غەفڵەتدا بوویت لەمە جا ئێمە پەردەکەتمان لابرد جا ئەمڕۆ چاوت زۆر تیژە (٢٢) وە هاوەڵەکەی وتی ئەمەم هێناوە حازرە بۆ لێپرسینەوە (٢٣) هەردووکتان هەموو کافرێك و عینادێك بخەنە جەهەننەمەوە (٢٤) قەدەغەکەری چاکە دەستدرێژکەر خاوەن گومان (٢٥) ئەوەی کە لەگەڵ الله دا خوای تری دانابوو، دەی فڕێیدەنە سزای سەختەوە (٢٦) هاوەڵەکەی وتی پەروەردگارمان من ئەمەم گومڕا نەکرد بەڵام لە گومڕاییەکی دووردا بوو (٢٧) وتی لەلای منا مشتومڕ مەکەن وە من پێشتر هەڕەشەم بۆ ناردبوون

(٢٨) قسە لەلای من ناگۆڕێت، وە من بۆ عەبدەکان زاڵم نیم (٢٩) ئەو ڕۆژە بە جەهەننەم ئەڵێین ئایا پڕبوویت وە ئەڵێت ئایا زیاتر هەیە (٣٠) وە بەهەشت نزیککرایەوە بۆ تەقواکاران دوور نییە (٣١) ئەمەیە بەڵێنتان ئەدرێتێ بۆ هەموو گەڕاوەیەکی خۆپارێز (٣٢) ئەوەی لە ڕەحمان ترسا بە نهێنی وە بە دڵێکی گەڕاوەوە هات (٣٣) بە سەلامەتی بچنە ناوی، ئەوە ڕۆژی نەمرییە (٣٤) هەرچیان بوێت تیایەتی وە بینینی خواشی تیایە (٣٥) ﴾.

+ ﴿ إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ (١) لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ (٢) خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ (٣) إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا (٤) وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا (٥) فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا (٦) وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ (٧) فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ (٨) وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ (٩) وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ (١٠) أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ (١١) فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ (١٢) ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ (١٣) وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ (١٤) عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ (١٥) مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ (١٦) يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ (١٧) بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ (١٨) لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ (١٩) وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ (٢١) وَحُورٌ عِينٞ (٢٢) كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِٕ ٱلۡمَكۡنُونِ (٢٣) جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (٢٤) لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا

تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴿٢٦﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ
﴿٢٧﴾ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ﴿٢٨﴾ وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ﴿٢٩﴾ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴿٣٠﴾
وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ﴿٣٣﴾
وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾
عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٞ مِّنَ
ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٖ
وَحَمِيمٖ ﴿٤٢﴾ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ
قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُتۡرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤٦﴾
وَكَانُواْ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿٤٧﴾
أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَوَّلِينَ وَٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ
مِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلۡمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَأٓكِلُونَ
مِن شَجَرٖ مِّن زَقُّومٖ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيۡهِ مِنَ
ٱلۡحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحۡنُ
خَلَقۡنَٰكُمۡ فَلَوۡلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تُمۡنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمۡ تَخۡلُقُونَهُۥٓ أَمۡ
نَحۡنُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحۡنُ قَدَّرۡنَا بَيۡنَكُمُ ٱلۡمَوۡتَ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٦٠﴾
عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمۡثَٰلَكُمۡ وَنُنشِئَكُمۡ فِي مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلنَّشۡأَةَ
ٱلۡأُولَىٰ فَلَوۡلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ

أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ (٦٤) لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ حُطَٰمٗا فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ (٦٥) إِنَّا
لَمُغۡرَمُونَ (٦٦) بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ (٦٧) أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلۡمَآءَ ٱلَّذِي تَشۡرَبُونَ
(٦٨) ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ (٦٩) لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ
أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ (٧٠) أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ (٧١) ءَأَنتُمۡ
أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ (٧٢) نَحۡنُ جَعَلۡنَٰهَا تَذۡكِرَةٗ وَمَتَٰعٗا
لِّلۡمُقۡوِينَ (٧٣) فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ (٧٤) فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ
(٧٥) وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦) إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ (٧٧) فِي
كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ (٧٨) لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ (٧٩) تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ (٨٠) أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ (٨١) وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ
تُكَذِّبُونَ (٨٢) فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ (٨٣) وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ (٨٤)
وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ (٨٥) فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ
مَدِينِينَ (٨٦) تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٨٧) فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ
ٱلۡمُقَرَّبِينَ (٨٨) فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ (٨٩) وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ
أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ (٩٠) فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ (٩١) وَأَمَّآ إِن كَانَ
مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ (٩٢) فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ (٩٣) وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ (٩٤)
إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ (٩٥) فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ (٩٦) (الواقعة)

کاتێك کە قیامەت ڕوویدا (١) بە ڕوودانی کەس بەدرۆی نازانێت (٢)

نزمکەرەوەی کافران و بەرزکەرەوەی ئیماندارانە (٣) کە زەوی لەرزی و جـوڵا (٤) وە شاخەکانیش شکان بەسەر یەکترا (٥) جا ئەبن بە تۆزی بـڵاو (٦) وە ئێوە ئەبن بە سێ پۆلەوە (٧) جـا هـاوەڵانی لای ڕاسـت، وە هـاوەڵانی لای ڕاست چین (٨) وە هاوەڵانی لای چەپ، وە هاوەڵانی لای چـەپ چـین (٩) وە وە پێشەنگەکان بۆ ئیمان (١٠) ئائەوانەن نزیکەکان (١١) لە بەهەشـتەکانی خاوەن نیعمەتەکاندان (١٢) کۆمـەڵێکی زۆریـان لـە سـەرەتاکانن (١٣) وە کـەمێکیان کۆتاکـانن (١٤) لەسـەر جێیـەکن بـە ئـاڵتوون چـنراوە (١٥) ڕاکشاون لەسەری و ڕووبەڕووی یەکن (١٦) منداڵانێك کە پیرنابن بەسەریاندا ئەگەڕێن (١٧) بە پەرداخ و کوپ و جامی شـەرابەوە (١٨) پێـی سـەرخۆش نابن وە لێیان نابڕێت (١٩) وە میـوە لـەوەی خۆیـان هەڵیئەبـژێرن (٢٠) وە گۆشتی باڵندە لەوەی حەزیانلێیە (٢١) وە ئـافرەتی چـاو گـەورە (٢٢) وەك شێوەی مرواری پارێزراو (٢٣) پاداشتە لە بەرامبەر ئەوەی ئـەیانکرد (٢٤) تیایا قسەی پووچ نابیستن نـە تـاوانیش (٢٥) تـەنها سـەلام لەیەکترئەکـەن (٢٦) وە هاوەڵانی لای ڕاسـت، هـاوەڵانی لای ڕاسـت چـین (٢٧) لـە گـەڵا سیدری بێ دڕك و بەرداردان (٢٨) وە دار تەڵحی بەر چڕ (٢٩) وە سـێبەری درێـژکراوە (٣٠) وە ئـاوی بـەردەوام (٣١) وە میـوەی زۆر (٣٢) نابڕێـت و قەدەغە ناکرێت (٣٣) وە ئافرەت لەسەر ڕاخەری بەرز (٣٤) ئێمـە ئـەوانمان

دروستکردووه (٣٥) جا کردوومانن بە کچ (٣٦) خۆشەویست و هاوتەمەنی مێردەکانیان (٣٧) ئەمانە بۆ هاوەڵانی لای ڕاست (٣٨) کۆمەڵێکی زۆر لە سەرەتاکان (٣٩) وە کۆمەڵێکی زۆر لە کۆتاکان (٤٠) وە هاوەڵانی لای چەپ، هاوەڵانی لای چەپ چین (٤١) لە گڕی ئاگر و ئاوی کوڵاودان (٤٢) وە سێبەرێك لە دووکەڵ (٤٣) نە سارده و نە بەسوود (٤٤) ئەوان بەر لەوە لە ناز و نیعمەتدا بوون (٤٥) وە سووربوون لەسەر تاوانە گەورەکە (٤٦) وە ئەیانوت گەر بمرین و ببین بە گڵ و ئێسقان ئایا زیندوو ئەبینەوە (٤٧) ئەی باوانمان (٤٨) بڵێ هەموو سەرەتاکان و کۆتاکان (٤٩) کۆئەکرێنەوە بۆ جێی ڕۆژی زانراو (٥٠) پاشان ئێوە ئەی گومڕای بێ باوەڕەکان (٥١) لە درەختی زەقوم ئەخۆن (٥٢) جا سکیانی لێ پڕئەکەن (٥٣) وە ئاوی کوڵاوی بەسەردا ئەخۆنەوە (٥٤) جا ئەخۆنەوە وەك حوشتری نەخۆش کە تێر نابێت پێی (٥٥) ئەمە جێیانە لە ڕۆژی سزادا (٥٦) ئێمە دروستمانکردوون بۆچی باوەڕناکەن (٥٧) ئایا ئەوەتان بینیوە کە فڕێیئەدەنە رەحمی ئافرەتەوە (٥٨) ئایا ئێوە دروستیئەکەن یان ئێمە بەدیهێنەرین (٥٩) ئێمە مردنمان بۆ دیاریکردووه وە کەس بەسەرماندا زاڵنابێت (٦٠) وە توانامان هەیە شێوەتان بگۆڕین و بتانکەینە شێوەیەك کە نەتاندیوه (٦١) وە بێگومان دروستکردنی مرۆڤ ئەزانن چۆنە جا بۆ بیرناکەنەوە (٦٢) ئایا نەتاندیوه ئەوەی ئەیکێڵن (٦٣)

ئایا ئێوە ئەیانڕوێنن یان ئێمەین دەریانئەکەین (٦٤) گەر بمانەوێت تێکیئەشکێنین جا خەفەت ئەخۆن و سەرسام ئەبن (٦٥) وە ئەڵێن ئێمە ڕەنج بە خەسارین (٦٦) بەڵکو ئێمە بێبەشکراوین (٦٧) ئایا دیقەتی ئەو ئاوەتان نەداوە کە ئەیخۆنەوە (٦٨) ئایا ئێوە لە هەورەوە داتانبەزاندووە یان ئێمەین دایئەبەزێنین (٦٩) گەر بمانەوێت تاڵمان ئەکرد ئەی بۆ شوکر ناکەن (٧٠) ئایا ئەو ئاگرەتان دیوە کە ئەیکەنەوە (٧١) ئایا ئێوە دارەکەیتان دروستکردووە کە ئەسووتێت یان ئێمەین دروستمانکردووە (٧٢) ئێمە کردوومانە بە هۆی بیرکەوتنەوە وە شتومەك بۆ سەفەرکەرەکان (٧٣) جا ناوی پەروەردگارە مەزنەکەت پاك ڕاگرە (٧٤) جا سوێند بە شوێنی ئەستێرەکان ئەخۆم (٧٥) وە ئەوەش سوێندێکە گەر بزانن گەورەیە (٧٦) ئەمە قورئانێکی بەڕێزە (٧٧) لە کتابێکی پارێزراودایە (٧٨) کەس دەستی لێنادات پاکەکان نەبێت (٧٩) دابەزێنراوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە (٨٠) ئایا بەم قسانە بێ باوەڕن (٨١) وە لەبری شوکری رزقەکەتان بەدرۆی ئەخەنەوە (٨٢) ئای لەو کاتەی روح ئەگاتە گەروو (٨٣) وە ئێوە ئەو کاتە سەیری گیانکێشان ئەکەن (٨٤) وە ئێمە لەئێوە نزیکترین لێی بەڵام نابینن (٨٥) جا گەر ئێوە موحاسەبە ناکرێن (٨٦) روحەکە بگەڕێننەوە گەر ڕاستگۆن (٨٧) جا گەر کەسەکە لە نزیکەکان بێت (٨٨) ئەوا ئیسراحەت و

ڕەیحان و بەهەشتی خاوەن نیعمەتی هەیە (٨٩) وە گەر لە هاوەڵانی لای ڕاست بێت (٩٠) ئەوا سەلام لەسەر هاوەڵانی لای ڕاست بێت (٩١) وە گەر لە بەدرۆخەرەوە گومڕاکان بێت (٩٢) ئەوا ئەبرێتە جێیەکەوە ئاوی کوڵاوە (٩٣) وە ئەگات بە ئاگری دۆزەخ (٩٤) ئائەمە حەقی بێ گومانە (٩٥) جا ناوی پەروەردگاری مەزنت پاك ڕابگرە (٩٦) ﴾.

+ ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ (١) وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ (٢) أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ
أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ (٣) بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ (٤) بَلۡ يُرِيدُ
ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ (٥) يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ (٦) فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ
(٧) وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ (٨) وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ (٩) يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ
أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ (١٠) كَلَّا لَا وَزَرَ (١١) إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ (١٢) يُنَبَّؤُاْ
ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۢ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ (١٣) بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ (١٤)
وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ (١٥) لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ (١٦) إِنَّ عَلَيۡنَا
جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ (١٧) فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ (١٨) ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ
(١٩) كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ (٢٠) وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ (٢١) وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ
نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ (٢٣) وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذِۭ بَاسِرَةٞ (٢٤) تَظُنُّ أَن
يُفۡعَلَ بِهَا فَاقِرَةٞ (٢٥) كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ (٢٦) وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ (٢٧)
وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ (٢٨) وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ (٢٩) إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ

ٱلۡمَسَاقُ (٣٠) فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ (٣١) وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ (٣٢) ثُمَّ
ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ (٣٣) أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ (٣٤) ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ
(٣٥) أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى (٣٦) أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيٍّ يُمۡنَىٰ
(٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ (٣٨) فَجَعَلَ مِنۡهُ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ
وَٱلۡأُنثَىٰٓ (٣٩) أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ (٤٠) (القيامة

سوێند ئەخۆم بە ڕۆژی قیامەت (١) وە سوێند ئەخۆم بە نەفسی لۆمەکار (٢) ئایا مرۆڤ وائەزانێت کە ئێسقانەکانی کۆناکەینەوە (٣) بەڵێ ئەتوانین پەنجەکانیشی ڕێکبخەینەوە (٤) بەڵکو مرۆڤ ئەیەوێت تاوان پێشبخات (٥) ئەپرسێت کەی قیامەتە (٦) جا کاتێك کە چاو ئەبلەق ئەبێت (٧) وە مانگ ڕووناکی نامێنێت (٨) وە خۆر و مانگ ڕووناکییان نامێنێت (٩) مرۆڤ ئەو ڕۆژە ئەڵێت کوێ پەنایە (١٠) نەخێر هیچ پەنایەك نییە (١١) بۆ لای خوایە شوێنی جێگیربوون (١٢) بە مرۆڤ ئەوترێت ئەو ڕۆژە چی پێشخستووە کۆن و تازەی (١٣) بەڵکو ئینسان خۆی باشتر ئەناسێت (١٤) گەر بەهانەش بێنێتەوە (١٥) زمانت مەجووڵێنە بۆ خێرا خوێندنەوەی قورئان (١٦) بێگومان لەسەرمانە کۆکردنەوە و خوێندنەوەی (١٧) جا کە خوێندمانەوە شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە (١٨) پاشان ڕوونکردنەوەکەی لەسەر خۆمانە (١٩) نەخێر ئێوە حەزتان لە پەلەکردن و دنیایە (٢٠) وە گرنگی بە

قیامـــەت نـــادەن (٢١) ڕوخســـارانێك لـــەو ڕۆژەدا گەشـــە (٢٢) ســـەیری پەروەردگاری ئەکات (٢٣) وە ڕوخسارانێك لەو ڕۆژەدا گرژە (٢٤) ئـەزانێت کە بەڵایەکی گەورەی بەسەر دێت (٢٥) نەخێر گەر رۆح گەشتە گەروو (٢٦) وە وترا کێ چارەسەری ئـەکات (٢٧) وە دڵنیـابوو کـە ئـەوە جیابوونەوەیـە (٢٨) وە قاچەکان لە یەکتر ئاڵان (٢٩) بەرەو پەروەردگارتە ئەو ڕۆژە ڕۆشـتن (٣٠) جـا بـاوەڕی نـەهێنا و نوێـژی نـەکرد (٣١) بـەڵکو بەدرۆیخسـتەوە و پشتیهەڵکرد (٣٢) پاشان چووە لای خێزانەکەی خـۆی بـادا (٣٣) (دوعـا و هەڕەشە بۆ تۆ. وەك بڵێیت:) قوڕت بەسەر جـا قـوڕت بەسـەر (٣٤) پاشـان قوڕت بەسەر جا قوڕت بەسەر (٣٥) ئایا مرۆڤ وا حساب ئـەکات ئـاوا وازی لێبهێنرێت (٣٦) ئایا تۆوێك نەبوو لە مەنییەکەوە کە پرژێنرا (٣٧) پاشـان هەڵواسراوێك بوو بە رەحمەوە وە خـوا دروسـتیکرد و ڕێکیخسـت (٣٨) جـا لێوەی هەردوو جووتەکە نێر و مێی دروستکرد (٣٩) ئایا ئەوە توانای نییـە مردووەکان زیندووبکاتەوە (٤٠) ﴾.

+ ﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا (٢١) وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا
(٢٢) وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ (٢٣)
يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي (٢٤) فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ (٢٥) وَلَا
يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ (٢٦) يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ (٢٧) ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ

رَاضِيَةً مَّرۡضِيَّةً (٢٨) فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي (٢٩) وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي (٣٠)
(الفجر) نەخێر کاتێك کە زەوی تەخت ئەکرێت (٢١) وە پەروەردگارت و
مەلائیکەتەکان پۆل پۆل دێن (٢٢) وە ئەو رِۆژە جەهەننەم ئەهێنرێت، ئەو
رِۆژە ئینسان بیر لە کردەوەکانی ئەکاتەوە وە چ سوودی هەیە بیربکاتەوە
لێیان (٢٣) ئەڵێ بریا کاری چاکم پێشخستایە بۆ ئەم ژیانەم (٢٤) جا ئەو
رِۆژە کەس سزای وەك سزای خوا نییە (٢٥) وە کەس زنجیرکردنی وەك
زنجیرکردنی نییە (٢٦) ئەی نەفسە ئارامەکە (٢٧) بگەرِێرەوە بۆ لای
پەروەردگارت رازیت و خوا لێت رازییە (٢٨) جا بچۆرە ناو عەبدە
چاکەکانمەوە (٢٩) وە بچۆرە بەهەشتەکەمەوە (٣٠) ﴾.

+ ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ (١٣) وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ
فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ (١٤) فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ (١٥) وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ
يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ (١٦) وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ
يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ (١٧) يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ (١٨) فَأَمَّا مَنۡ
أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ (١٩) إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ
حِسَابِيَهۡ (٢٠) فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ (٢١) فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ (٢٢) قُطُوفُهَا
دَانِيَةٞ (٢٣) كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ (٢٤) وَأَمَّا
مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ (٢٥) وَلَمۡ أَدۡرِ مَا

حِسَابِيَهۡ (٢٦) يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ (٢٧) مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ (٢٩) خُذُوهُ فَغُلُّوهُ (٣٠) ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ (٣١) ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ (٣٢) إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ (٣٣) وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ (٣٤) فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ (٣٥) وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنۡ غِسۡلِينٖ (٣٦) لَّا يَأۡكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡخَٰطِـُٔونَ (٣٧) (الحاقة) جا کە یەك فوو کرا بە کەڕەنادا (١٣) وە زەوی و شاخەکان هەڵکەندران و وردبوون (١٤) جا ئەو ڕۆژە قیامەت ڕوودەدات (١٥) وە ئاسمان شەق بوو جا ئەو ڕۆژە لاوازە ئاسمان (١٦) وە مەلائیکەتەکان لەملاولایەوەن، وە ئەو ڕۆژە هەشت مەلائیکەت عەرشی پەروەردگارت هەڵئەگرن (١٧) ئەو ڕۆژە ئەخرێنە ڕوو هیچ شاردراوەیەکتان نییە (١٨) جا هەرکەس پەڕاوەکەی بە دەستی ڕاستی بدرێتێ ئەڵێت وەرن نامەی کردەوەکانم بخوێننەوە (١٩) من دڵنیابووم کە بە حسابم ئەگەم (٢٠) جا ئەو لە ژیانێکدایە لێی ڕازییە (٢١) لە بەهەشتێکی بەرزدایە (٢٢) بەری دارەکانی نزمە (٢٣) بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت بەوەی کردتان لە دنیادا (٢٤) وە ئەما ئەوەی پەڕاوەکەی بدرێتێ بە دەستی چەپی جا ئەڵێت خۆزگە کتێبەکەم نەدرایەتێ (٢٥) وە نەمزانیایە حسابەکەم چییە (٢٦) خۆزگە ئەو مردنەی مردم هەر ئەوە بوایە (٢٧) سەروەت و سامانم سوودی نەبوو بۆم

(٢٨) بەهانەکان و دەسەلاتم فەوتان (٢٩) بیبەن و زنجیری بکەن (٣٠) پاشان بیگەیەنن بە ئاگری دۆزەخ (٣١) پاشان بە زنجیرێك کە گەورەییەکەی حەفتا گەزە بیبەستنەوە (٣٢) ئەو باوەڕی بە خوای مەزن نەبوو (٣٣) وە هانی خواردندانی هەژاری نەئەدا (٣٤) جا ئەمڕۆ لێرەدا هیچ خزم و دڵسۆزێکی نییە (٣٥) وە هیچ خواردنێکیش ئیللا زوخاو و کێماوی جەهەننەم (٣٦) تاوانباران نەبێت کەس لێی ناخوات (٣٧) ﴾.

+ ﴿ إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا (١) وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا (٢) وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا (٣) يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا (٤) بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا (٥) يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ (٦) فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ (٧) وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ (٨) (الزلزلة) گەر زەوی لەرزەکەی کرد (١) وە زەوی قورساییەکانی دەرکرد (٢) وە ئینسان وتی ئەوە زەوی چییەتی (٣) ئەو ڕۆژە هەواڵەکەی باسئەکات (٤) کە پەروەردگارت وەحی بۆ ناردووە (٥) ئەو ڕۆژە خەڵك ئەبن بە چەند پۆلێکەوە تا کردەوەکانیان ببینن (٦) جا هەرکەس هێندەی مێروولەیەکی بچووك کارێکی چاکی کردبێت ئەیبینێتەوە (٧) وە هەرکەس هێندەی مێروولەیەکی بچووك کارێکی خراپی کردبێت ئەیبینێتەوە (٨) ﴾.

+ ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا (٤٧) وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا (٤٨) وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا (٤٩) (الكهف) وە ئەو ڕۆژە شاخەکان ئەجوولێنین وە زەوی تەخت ئەبینیت وە حەشرمانکردن جا کەسمان لێ جێنەهێشتن (٤٧) وە خرانە پێش پەروەردگارت پۆل پۆل، بەو جۆرە هاتنەوە لامان وەك چۆن ئەوەڵ جار دروستمانکردن، بەڵکو گومانتان وابوو کە کاتی گەڕانەوەتان بۆ دانانیێن (٤٨) وە نامەی کردەوەکان دانرا جا تاوانبارەکان ئەبینیت ئەترسن لەوەی تیایەتی وە ئەڵێن ئەی تیاچوون بۆخۆمان ئەم کتێبە چییە هیچ بچووك و گەورەیەکی جێنەهێشتووە ئیللا حسابیکردووە، وە ئەوەیان بینییەوە کە ئەیانکرد، وە پەروەردگارت زوڵم لە کەس ناکات (٤٩) ﴾.

+ ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ (٢٤) وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٢٥) قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ

ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ (٢٦) وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ
يَوۡمَئِذٖ يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ (٢٧) وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٖ جَاثِيَةٗۚ كُلُّ أُمَّةٖ تُدۡعَىٰٓ إِلَىٰ
كِتَٰبِهَا ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٢٨) هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ
إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٢٩) فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدۡخِلُهُمۡ رَبُّهُمۡ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ (٣٠) وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ
(٣١) وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيۡبَ فِيهَا قُلۡتُم مَّا نَدۡرِي مَا
ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنّٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ (٣٢) وَبَدَا لَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا
عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٣٣) وَقِيلَ ٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰكُمۡ كَمَا
نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ (٣٤) ذَٰلِكُم
بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذۡتُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗا وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُخۡرَجُونَ
مِنۡهَا وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ (٣٥) فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ
رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٣٦) وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ
ٱلۡحَكِيمُ (٣٧) (الجاثية) وە وتیان تەنها ژیانی ئەم دنیایەیە ئەمرین و ئەژین
وە تەنها زەمانەیە ئەمانمرێنێت، وە زانستی ئەوەیان نییە، بەڵکو تەنها
گومان ئەبەن (٢٤) وە کاتێك ئایەتەکانمانیان بۆ ئەخوێنرێتەوە بە ئاشکرایی
بەهانەیان نییە تەنها ئەوە نەبێ وتیان باوانمان بهێنن گەر ڕاستئەکەن (٢٥)

بلێ الله ئەتانژیێنێت و ئەتانمرێنێت پاشان کۆتانئەکاتەوە لە قیامەتدا هیچ گومانی تیا نییە بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن (٢٦) وە بۆ خوایە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی، وە ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵئەسێ ئەو ڕۆژە خاوەن بەتاڵەکان ئەدۆڕێن (٢٧) وە هەموو ئومەتێك ئەبینیت لەسەر چۆکە، هەموو ئومەتێك بانگئەکرێت بۆ لای پەڕاوەکەی خۆی، ئەمڕۆ پاداشتی ئەوە ئەدرێنەوە کە ئەتانکرد (٢٨) ئەمە نوسراوەکەمانە لەسەرتان ئەدوێ بە حەق، ئێمە ئەوەی ئەتانکرد نوسیومانەتەوە (٢٩) جا ئەوانەی ئیمانیان هەبوو وە کردەوەی چاکیان کرد ئەوا پەروەردگاریان ئەیانخاتە رەحمەتی خۆیەوە، ئەوە بردنەوەی ئاشکرایە (٣٠) وە ئەمما ئەوانەی کوفریانکرد ئایا ئایەتەکانم بەسەرتاندا نەئەخوێنرایەوە جا خۆتان بە گەورە زانی و قەومێکی تاوانبار بوون (٣١) وە گەر بوترێت وەعدی خوا حەقە و قیامەت شکی تیا نییە وتتان نازانین قیامەت چییە ئێمە تەنها لە گوماندایین و دڵنیا نین لە زیندووبوونەوە (٣٢) وە سزای کردەوە خراپەکانیان بۆ دەرکەوت، وە ئەوەی گاڵتەیان پێئەکرد لە سزای خوا دەوریانی دا (٣٣) وە وترا ئەمڕۆ پشتگوێتانئەخەین وەك ئێوە مەوعیدی ئەمڕۆی قیامەتتان پشتگوێخست، وە جێگەتان ئاگرە و هیچ سەرخەرێکتان نییە (٣٤) ئەوە بەهۆی ئەوەی ئایەتەکانی خواتان کرد بە گاڵتە وە ژیانی دنیا هەڵیخەڵەتاندن، جا ئەمڕۆ

لێی دەرناهێنرێن وە ڕێی عوزرهێنانەوەشیان نادرێتێ (٣٥) جا حەمد و سوپاس بۆ خوا پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی پەروەردگاری جیهانیان (٣٦) وە لە ئاسمانەکان و زەویدا بەس ئەو گەورەیی و تەکەبوری هەیە، وە بەعیززەت و کاربەجێیە (٣٧) ﴾.

+ ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ (٣٣) يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ (٣٤) وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ (٣٥) وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ (٣٦) لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ (٣٧) وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ (٣٨) ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ (٣٩) وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ (٤٠) تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ (٤١) أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ (٤٢) (عبس) جا کە دەنگە بەرزەکە هات (٣٣) ئەو ڕۆژە پیاو لە برای ڕائەکات (٣٤) وە لە دایکی وە باوکی (٣٥) وە ژنەکەی وە منداڵەکانی (٣٦) هەریەکێك لەوان ئەو ڕۆژە بە کارێکی خۆیەوە سەرقاڵە (٣٧) ڕووخسارانێك ئەو ڕۆژە گەشاوەن (٣٨) پێئەکەنێت مژدەی دراوەتێ (٣٩) وە ڕووخسارانێك ئەو ڕۆژە تۆزاوین (٤٠) ڕەشایی داییپۆشیون (٤١) ئائەوانە کافرە تاوانبارەکانن (٤٢) ﴾.

+ ﴿ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ

عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ (١١٦) مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي
وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ
عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ (١١٧) إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن
تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (١١٨) قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ
ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ
رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ (١١٩) لِلَّهِ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ (١٢٠) (المائدة)

وە کە خوا وتی ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ بوویت وتت بە خەڵك من و دایکم بکەن بە دوو خوا جگە لە خوا، وتی پاکی بۆ تۆ بۆم نییە ئەوەی حەقی من نەبێت بیڵێم، گەر وتبێتم ئەوا زانیوتە، ئەوە ئەزانیت کە لە نەفسمدایە وە نازانم چی لە نەفستدایە، تەنها تۆی غەیب ئەزانیت (١١٦) تەنها ئەوەم پێ وتن کە فەرمانت پێمکرد کە الله بپەرستن پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوە، وە لەسەریان شایەتبووم هەتا لەناویانا بووم، جا کاتێك منت بەرزکردەوە تۆ چاودێربوویت بەسەریانەوە، وە تۆ شایەتی بەسەر هەموو شتێکەوە (١١٧) جا گەر عەزابیان بدەیت ئەوا عەبدی خۆتن، وە گەر لێیان خۆشبیت ئەوا تەنها تۆ بەعیززەت و دانایت (١١٨) خوا وتی ئەمە ڕۆژێکە ڕاستگۆکان ڕاستگۆییەکەیان سوودی هەیە بۆیان، باخاتێکیان بۆ هەیە

ڕووبارەکان بەژێریاندا ئەڕۆن نەمرن تیایا هەتاهەتایە، خوا لێیـان ڕازییـە وە لێى ڕازین، ئـەوە بردنـەوەى مەزنـە (١١٩) مـوڵکى ئاسمانـەکان و زەوى و ئەوەى تیایانە هى خوایە، وە ئەو بەسەر هەموو شـتێکدا بەتوانایـە (١٢٠) ﴾.

+ ﴿ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ (١٩) حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (٢٠) وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ (٢١) وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَتِرُونَ أَن يَشۡهَدَ عَلَيۡكُمۡ سَمۡعُكُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُكُمۡ وَلَا جُلُودُكُمۡ وَلَٰكِن ظَنَنتُمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعۡلَمُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَعۡمَلُونَ (٢٢) وَذَٰلِكُمۡ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمۡ أَرۡدَىٰكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٢٣) فَإِن يَصۡبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡۖ وَإِن يَسۡتَعۡتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلۡمُعۡتَبِينَ (٢٤) وَقَيَّضۡنَا لَهُمۡ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ (٢٥) وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ (٢٦) فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابٗا شَدِيدٗا وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (٢٧) ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعۡدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُۖ لَهُمۡ فِيهَا دَارُ ٱلۡخُلۡدِ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ (٢٨) وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ نَجۡعَلۡهُمَا تَحۡتَ

أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ (٢٩) إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ (٣٠) نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ (٣١) نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ (٣٢) (فصلت) وە لە قیامەتدا دوژمنەکانی خوا بەرەو ئاگر ئەبرێن و کۆئەکرێنەوە (١٩) هەتا کاتێ دێنە لای گوێچکە و چاوەکان و پێستیان شایەتییان لەسەر ئەدەن بەوەی ئەیانکرد (٢٠) وە بە پێستیان وت بۆچی شایەتیتان لەسەر داین، وتیان ئەو خوایە هێنایینییە قسە کە هەموو شتێکی هێناوەتە قسە وە ئەو یەکەم جار دروستیکردوون وە بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە (٢١) وە کردەوەتان نەئەشاردەوە و نەتانئەزانی کە بیستن و بینین و پێستتان شایەتیتان لەسەر ئەدەن، بەڵام واتانزانی کە خوا زۆرێك لەوەی ئەیکەن نایزانێت (٢٢) وە ئەوە گومانتان بوو بە پەروەردگارتان برد لەناویبردن، جا چوونە ڕیزی دۆڕاوەکانەوە (٢٣) جا گەر سەبربگرن ئەوا ئاگر جێیانە، وە گەر عوزر بێننەوە ئەوا لێیان قبوڵناکرێت (٢٤) وە شەیتانەکانیشمان کرد بە هاوەڵیان جا کارەکانیان بۆ ڕازاندنەوە و وتیان قیامەت نییە، وە سزای خوایان بەسەردا جێبەجێ بوو وەك بەسەر قەومەکانی پێشیاندا جێبەجێ بوو لە ئینس و جن، ئەوان زەرەرمەند بوون (٢٥) وە ئەوانەی کوفریانکرد وتیان

گوێ لەم قورئانە مەگرن و دەنگەدەنگی تیا بکەن بەڵکو ئێوە زاڵبن (٢٦) جا ئەوانەی کوفریانکرد سزایەکی سەختیان پێ ئەچێژین وە بە خراپترین پاداشتیان ئەدەینەوە بەوەی ئەیانکرد (٢٧) ئەوە پاداشتی دوژمنانی خوایە کە ئاگرە، تیای جێی مانەوەی هەتاهەتاییانە، وەك پاداشت لە بەرامبەر ئەوەی نکوڵی ئایەتەکانمانیان ئەکرد (٢٨) وە کافرەکان وتیان پەروەردگارمان ئەو دووانەمان پێ نیشان بە کە گومڕایان کردین لە ئینس و جن با بیانخەینە ژێر پێمانەوە تا لە ژێرەوە بن (٢٩) ئەوانەی وتیان خوامان الله یە پاشان ڕێك و دامەزراو بوون مەلائیکەت لەسەریان دائەبەزن کە مەترسن و خەفەت مەخۆن وە مژدەی بەهەشتتان لێبێت کە وەعدتان پێدرا (٣٠) ئێمە پشتیوانتانین لە ژیانی دنیا وە لە قیامەتدا، وە بۆتان هەیە تیایا هەرچی نەفستان حەزی پێیە وە تیایدایە بۆتان ئەوەی داوای بکەن (٣١) جێگەیەکە لە خوای لێبووردە و بەرەحمەوە (٣٢) ﴾.

+ ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُواْ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ (٢١) وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ

مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢٢) وَأُدۡخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡۖ تَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٌ (٢٣) (إبراهيم) وە هەموویان ئاشکرابوون بۆ خوا، جا لاواز و شوێنکەوتەکان بە گەورەکانیان وت ئێمە شوێنکەوتەی ئێوە بووین ئایا ئێوە هیچ سزای خوامان لەسەر لائەبەن، وتیان گەر خوا هیدایەتی بداینایە هیدایەتمان ئەدان، وەك یەکە لەسەرمان هاوار بکەین یان سەبربگرین هیچ جێ و پەنایەکمان نییە (٢١) وە کاتێك کە حساب تەواوبوو شەیتان وتی خوا وەعدی حەقی دانێ و من وەعدم دانێ و ڕاستگۆ نەبووم لەگەڵتان، وە هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو بەسەرتانەوە تەنها بانگمکردن و وەڵامتاندامەوە، جا لۆمەم مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن، من فریاتان ناکەوم و ئێوەش فریام ناکەون، من بەریم لەوەی منتان کرد بە شەریکی خوا پێشتر، بێگومان ستەمکاران سزای بەئێشیان هەیە (٢٢) وە ئەوانەی ئیمانیان هێنا و کاری چاکیانکرد خرانە باخاتێکەوە کە ڕووبارەکان بە بنیانا ئەڕۆن نەمرن تیایا بە ئیزنی پەروەردگاریان، سڵاوکردنیان تیایا سەلامە (٢٣) ﴾.

+ ﴿ هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ (٤٩) جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ (٥٠) مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ (٥١) وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ أَتۡرَابٌ (٥٢) هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ

(٥٣) إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ (٥٤) هَٰذَاۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ
(٥٥) جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ (٥٦) هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ
(٥٧) وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ (٥٨) هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ لَا مَرْحَبًۢا
بِهِمْۚ إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ (٥٩) قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَاۖ
فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ (٦٠) قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي ٱلنَّارِ
(٦١) وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ (٦٢) أَتَّخَذْنَٰهُمْ
سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ (٦٣) إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ
(٦٤) (ص) ئەمە یادخستنەوەیە، وە بۆ تەقواکاران گەڕانەوەی باش هەیە (٤٩) بەهەشتی عەدن دەرگاکانی کراوەیە بۆیان (٥٠) پاڵئەدەنەوە تیایا داوای میوەی زۆر و شەراب ئەکەن تیایا (٥١) وە لەلایان ئافرەت هەیە کە چاویان لەسەر مێردەکانیانە و هاوتەمەنیانن (٥٢) ئەمەتان پێ بەڵێن ئەدرێت بۆ ڕۆژی قیامەت (٥٣) ئەمە رزقی ئێمەیە تەواوبوونی نییە (٥٤) ئەمە وە بۆ سنوربەزێنەکان گەڕانەوەی خراپ هەیە (٥٥) ئەگەن بە جەهەننەم جا خراپترین جێی مانەوەیە (٥٦) ئەمە جا با بیچێژن ئاوی کوڵاو و کێماو (٥٧) وە سزای تریشیان هەیە هاوشێوە (٥٨) ئەمە کۆمەڵێکە دەخرێنە جەهەننەمەوە لەگەڵتان، ئەی بەخێر نەیەن، ئەوان ئەگەن بە ئاگر (٥٩) وتیان بەڵکو ئێوە بەخێر نەیەن، ئێوە ئەمەتان بۆ ئێمە پێشخست و

بۆی بانگتانکردین، کە خراپترین جێی مانەوەیە (٦٠) وتیان خوایە کێ هۆکاری ئەم سزایەمانە ئەوا سزای بۆ دووقات زیادکە لە ئاگرا (٦١) وە وتیان ئەوە چیمانە نابینین پیاوانێك کە بە خراپەکارمان ئەزانین (٦٢) ئایا بەگاڵتە گرتبوومانن یان لێرە چاومان لێیان نییە (٦٣) ئائەوە حەقە مشتومڕی هاوەڵانی ئاگر (٦٤) ﴾.

+ ﴿ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ (محمد - ١٥) سیفەتی ئەو بەهەشتەی بەڵێن دراوە بە تەقواکاران، چەند ڕووبارێکی تیایە لە ئاوی تێکنەچوو، وە چەند ڕووبارێك لە شیر کە تامەکەی نەگۆڕاوە، وە چەند ڕووبارێك لە مەی چێژە بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوە، وە چەند ڕووبارێك لە هەنگوینی پاڵفتەکراو، وە بۆیان تیایەتی لە هەموو بەر و بوومێك وە لێبووردن لە پەروەردگاریانەوە، ئایا وەك کەسێك وایە کە نەمرە لە ئاگردا وە پێیان ئەدرێت بیخۆنەوە ئاوێکی کوڵاو کە ناو سکیان ئەپچڕێت ﴾.

+ ﴿ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ (محمد - ١٨) ئایا چاوەڕێی شتێکن غەیری قیامەت کە

بە ناکاو دێت، جا ئەوە نیشانەکانی هاتوون، جا ئەو کاتەی دێت بیرکردنەوە لە کردەوەکانیان و تۆبە چی سوودێکی بۆیان هەیە ﴾.

قورئانی پیرۆز هەموو هەنگاوەکانی ژیان و مردن و زیندووبوونەوەی باسکردووە و ئاماژەی بە وردەکاری زۆر داوە. وە وەڵامی پرسیاری مرۆڤەکانی داوەتەوە و، گومانەکانیانی ڕەواندووەتەوە. وە وردەکاری داوە بە بابەتە گرنگەکان.

قورئانی پیرۆز باسی لە سەرەتا و ئەسڵی مرۆڤەکان کردووە کە لە نێر و مێیەکەوەیە پاشان زۆربوون و بڵاوبوونەتەوە و بوون بە چەندین هۆز و گەلەوە. وە هیچ ڕەگەزپەرستییەك نییە، وە هیچ جیاکارییەك نییە مەگەر بە تەقوا. وە باوکی مرۆڤ ناوی ئادەمە علیە السلام و خوای گەورە دروستیکردووە لە گڵ و ڕۆحی بەبەردا کردووە. وە نەوەکانی هەر لە گڵن و بە چەند هەنگاوێکدا ئەڕۆن لە تۆوەوە تا کۆرپە. وە دوای لەدایك بوونیش بە چەند هەنگاوێکدا ئەڕۆن تا پیربوون و مردن. وە مرۆڤ لەسەر زەوی لە تاقیکردنەوەدایە و گەر گوێرایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت و نەچێت بەلای قەدەغەکراوەکاندا پاداشت وەرئەگرێت، وە گەر وانەبێت سزا ئەدرێت. وە پێشوەختە ئەم بابەتەی خراوەتە بەردەم و دوای ئەوەی ڕازی بووە پێی هاتووەتە ناو تاقیکردنەوەکەوە[٧]، وە هەمان بابەت خراوەتە بەردەم

مەخلوقەکانی تر و ئەوان ڕەتیانکردووەتەوە و تەنها مرۆڤ بەم ئەرکە ڕازی بووە[٧]. وە هەموو مرۆڤێك لەسەر فیترەت لەدایك ئەبێت و باوەڕی بە خوای گەورە هەیە، وە ئەم فیترەتەی شایەتە بەسەریەوە و گەر لێی نەشێوێت یارمەتی ئەدات شوێن ڕێی حەقی یەکخواپەرستی بکەوێت[١٦]. وە مەبەستی سەرەکی لە بوونی مرۆڤ و جن لەسەر زەوی پەرستنی خوای گەورەیە بەتەنها، وە لەم دنیایەدا ئامانجی گەورەی مرۆڤ کارکردنە بۆ بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتایی بەهەشت، وە لەهەمان کاتدا مرۆڤ ئەبێت ئەم دنیاشی بیرنەچێت و بەشی خۆی بە حەڵاڵی بەکاربێنێت. وە هەموو نەفسێکی دروستکراو مردن ئەچێژێت و هیچ مرۆڤێك نەمر نییە لەسەر زەوی. وە ئەم مردنە کۆتایی ژیانە لەسەر زەوی و دەستپێکی ژیانێکی ترە لەناو گۆڕدا، کە یان ئیسراحەتە تیایدا یان سزائەدرێت. وە خوای گەورە مردووەکان زیندووئەکاتەوە وە لە گۆڕەکانیان دەریانئەهێنێت و کۆیانئەکاتەوە و لێیانئەپرسێتەوە وە کردەوەکانیان نیشانئەدات. وە باوەڕداران ئەچنە بەهەشتەوە و لە نیعمەت و ئیسراحەتدان بۆ هەتاهەتایە، وە کافران لە جەهەننەم و سزا و ئازار و سوکایەتییان بۆ هەتاهەتایە. وە قسە و موناقەشەی خەڵکی ناو جەهەننەم و یەکتر تۆمەتبارکردنیان، وە قسەی خوای گەورە لەگەڵیان، وە تەنانەت وتار و قسەی شەیتانیش باسکراوە. وە لە قورئاندا وەڵامی پرسیار و گومانی کافرانیش بە ڕوونی

دراوەتـــەوە لەســـەر زیندووبوونـــەوە و لێپرســـینەوە. وە قیامـــەت نـــەك خـــۆی و ڕووداوەکانی بەڵکو نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ئەو ڕۆژەش باسکراوە.

## بابەتی چوارەم

## دەقەکان دەربارەی بیروباوەڕی تر

لە کتێبی گاور و جولەکەکاندا هەندێك بابەت باسکراون کە لە واقیعدا بوونیان نییە و نەبووە، بەڵکو لە خورافەوە نزیکترن وەك لە قسەی خوای گەورەوە. وە تیایدا هەندێك دەق هەن کە هیچ فیترەتێکی پاك قبوڵی ناکات بدرێنە پاڵ خوای گەورە و بوترێت ئەمانە قسەی خوان و پیرۆزن. وە زۆرێك دەق هەن تیایدا کە دژیەکن و ناگونجێت لەلایەن خوای گەورەوە هاتبن.

جیاواز لە قورئانی پیرۆز کە هەر بابەتێکی باسکردبێت واقیعییە و، فیترەتێکی پاك وە عەقڵێکی ساغ وە زانستێکی دروست پشتڕاستییان ئەکاتەوە. وە دەقەکانی قورئانی پیرۆز لە بەرزترین ئاستی ڕەوشتان و هەمووی لایەق و شایستەن بدرێنە پاڵ خوای گەورە و بە قسەی خوای گەورە دابنرێن. وە دەقەکانی قورئانی پیرۆز هیچ دژیەکییەکیان تیا نییە و یەکتر بەدرۆ ناخەنەوە.

یەکەم/ خورافە و ڕاستی.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

- وإن رجلا من بني الأنبياء قال لصاحبه بأمر الرب: ((اضربني )). فأبى الرجل ان يضربه (٣٥) فقال له: ((بما انك لم تسمع لصوت الرب، فانك، عند انصرافك من عندي، يقتلك أسد)). فلما انصرف من عنده، لقيه أسد فقتله (٣٦) ثم لقي رجلا آخر فقال له: (( اضربني ))، فضربه ذلك الرجل ضربة فجرحه (٣٧) (الملوك الأول / ٢٠) وە پیاوێك لە کۆمەڵی پێغەمبەران بە هاوەڵێکی وت: (بە فەرمانی خوا لێمبدە). جا ڕەتیکردەوە لێیبدات (٣٥) جا پێی وت: (لەبەرئەوەی گوێبیستی فەرمانی خوا نەبوویت، جا تۆ کاتێك لەلای من ئەڕۆیت شێرێك ئەتکوژێت). جا کاتێك لەلای ڕۆشت، شێرێك پێی گەشت و کوشتی (٣٦) پاشان بە پیاوێکی تر گەشت و پێی وت: (لێمبدە)، جا لێیدا لێدانێك کە برینداریکرد (٣٧).

- بەپێی ئەم دەقە بێت خوا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرێکی کە بەیەکێك بڵێت لێی بدات. وە گەر کەسەکە لە پێغەمبەرەکە نەدات سزا ئەدرێت و خوا غەزەبی لێ ئەگرێت. جا ئایا حیکمەت چییە لەم لێدان و تەعەدایە؟ وە ئایا کەسێك ڕەتی بکاتەوە لە پێغەمبەرێك یان

هەر کەسێك بدات بەبێ هۆیەکی ڕوون و دروست تاوانی کردووە و شایەنی سزایەکی لەو جۆرەیە؟

– وقال للمرأة: لأكثرن مشقات حملك تكثيرا. فبالمشقة تلدين البنين وإلى رجلك تنقاد أشواقك وهو يسودك (تكوين ٣/ ١٦) وە خوا بە ئافرەتی وت: نارەحەتییەکانی سکپڕیت زۆرئەکەم. جا بە نارەحەتی منالّت ئەبێت وە بۆ مێردەکەت سۆزت ئەبێت و ئەو بەسەرتدا زاڵئەبێت.

– فقال الرب الإله للحية: (( لأنك صنعت هذا فأنت ملعونة من بين جميع البهائم وجميع وحوش الحقل. على بطنك تسلكين وترابا تأكلين طوال ايام حياتك (تكوين ٣/ ١٤) جا پەروەردگاری خوا بە مارەکەی وت: (لەبەرئەوەی ئەمەت کرد ئەوا تۆ مەلعونیت لەنێوان هەموو ئاژەڵەکاندا وە هەموو دڕندەکانی ناو بێستانەکە. لەسەر سکت ئەخشێیت وە هەموو ڕۆژانی ژیانت خۆڵ ئەخۆیت.

- بەگوێرەی ئەم دەقانە بێت خوا خێزانی ئادەم سزا ئەدات بە نارەحەتی و ئازاری سکپڕی و منالّبوون، وە بەوەی سۆزی بۆ مێردەکەی هەبێت، وە مێردەکەی دەسەلاّتی بەسەریا هەبێت. وە سزای ماری دا بەوەی لەسەر سك بخشێ، وە هەموو ژیانی خۆڵ ئەخوات. جا گەر وایە بۆچی خوای گەورە ئادەم و ژنەکەی فێری تۆبەکردن ناکات و نایانبورێت؟

ئایا لێبوردن باشتر نییە لە سزادانیان لەکاتێکا بە فێڵلێکردن کەوتنە ئەو تاوانەوە؟ وە گەر ئادەم و ژنەکەی و مارەکە تاوانەکەیان کردبێت بۆچی نەوەکانیشیان هەمان سزا بدرێن و تا ئێستاش ئافرەت هەر ئازاری سکپڕی و لەدایکبوونی هەبێت؟ وە گەر ئازاری سکپڕی و منداڵبوون سزایە بۆچی ئاژەڵەکانیش هەمان ئازاریان هەیە؟ (أیوب ٣٩/ ٣) وە ئایا گەر ئافرەت ئارەزووی بۆ مێردەکەی هەبێت خراپە؟ وە ئایا پیاو ئارەزووی نییە بۆ ژنەکەی؟ وە گەر هەیەتی ئایا ئەویش سزایە لەسەری؟ وە ئایا گەر مرۆڤ ئارەزووی شتێك بکات ئەوا واتای ئەوەیە پێشتر تاوانێکی کردووە و ئەوە سزاکەیەتی؟ وە ئایا ئەسڵ ئەوەیە هاوسەرەکان ئارەزووی یەکتر ناکەن و گەر کردیان پێچەوانەی فیترەت و ئەسڵن؟ وە گەر پیاو دەسەڵاتی هەبێت بەسەر ژنەکەیدا خراپە؟ وە گەر ئەمانە ڕاستن ئەی بۆچی تا ئێستاش لەناو جولەکە و گاورەکاندا ئەم سزایە هەر بەردەوامە؟ خۆ جولەکە بەخۆی ئەڵێت گەلی هەڵبژێردراوی خوا و تاکە گەلی بەهەشت. ئەی بۆچی خوای گەورە تائێستا سزایان ئەدات وەك گەلەکانی تر؟ وە گاورەکانیش ئەڵێن گەر باوەڕ بە لەخاچدانی مەسیح بێنیت و باوەڕبێنیت کە لەبەر تاوانەکانی تۆ جولەکە لەخاچیدا، ئەوا لێت ئەبووردرێت و سزات

لەسەر لائەچێت. ئەی بۆچی ئەو سزایانە هێشتا لەسەریان ماوە و لانەچووە؟ وە گەر لەسەرسك خشانی مار سزایە ئەی ئەو خشۆکانەی تر کە لەسەر سك ئەخشێن تاوانیان چییە وا بەو جۆرە سزا دراون؟ وە ئایا مار خۆڵ ئەخوات؟ وە بۆچی تا ئێستا ئەو سزایانە لەسەر مار لانەچوون؟ وە گەر خۆڵخواردنەکە لاچووە بۆچی لاچووە؟ وە سزاکانی تر بۆ لانەچوون؟

– كانت كلمة الرب إلى حزقيال بن بوزي الكاهن، في أرض الكلدانيين، على نهر كبار، وكانت عليه هناك يد الرب (٣) فنظرت فإذا بريح عاصف مقبلة من الشمال، وغمام عظيم ونار متواصلة، وللغمام ضياء من حوله، ومن وسطها ما يشبه اللمعان القرمزي من وسط النار (٤) ومن وسطها شبه أربعة حيوانات، وهذا منظرها: لها هيئة بشر (٥) ولكل واحد أربعة وجوه، ولكل واحد أربعة أجنحة (٦) وأرجلها أرجل مستقيمة. وأقدام أرجلها كقدم رجل العجل، وهي تبرق مثل النحاس الصقيل (٧) ومن تحت أجنحتها أيدي بشر على أربعة جوانبها، وكذلك وجوهها وأجنحتها لأربعتها (٨) أجنحتها متصلة واحد بالآخر. والحيوانات لا تعطف حين تسير، فكل واحد منها يسير أمام وجهه (٩) أما هيئة وجوهها فهو وجه بشر ووجه أسد عن اليمين لأربعتها، ووجه ثور عن الشمال لأربعتها، ووجه عقاب لأربعتها (١٠)

وجوهها وأجنحتها منفصلة من فوق، لكل واحد جناحان متصلان أحدهما بالآخر، وجناحان يستران أجسامها (١١) وكانت تسير كل واحد منها أمام وجهه، وإلى حيث الروح يوجه السير كانت تسير، ولا تعطف حين تسير (١٢) أما هيئة الحيوانات فمنظرها كجمرات نار متقدة، كمنظر مشاعل وهي تسير بين الحيوانات، وللنار ضياء، ومن النار يخرج برق (١٣) والحيوانات تجري وترجع ومنظرها كالبرق (١٤) وبينما أنا أنظر إلى هذه الكائنات الحية رأيت دولابا واحدا على الأرض بجانب كل واحد منها (١٥) (حزقيال / ١) وتەی یەزدان بۆ حزقیالی کوڕی بوزی کاهین هات، لە زەوی کلدانییەکان لەسەر نۆکەندی کەبار، وە لەوێ دەستی خوای لەسەر بوو (٣) جا سەیرمکرد بایەکی توند لە باکورەوە هات وە هەورێکی گەورە و ئاگرێکی بەردەوام، وە هەورەکە ڕووناکییەك لە دەوری بوو، وە لە ناوەڕاستیدا شێوەی درەوشانەوەی مۆر لە ناوەڕاستی ئاگرەکەوە (٤) وە لە ناوەڕاستیدا شێوەی چوار ئاژەڵ هەبوو، کە ئەمە شێوەیانە: شێوەی مرۆڤی هەیە (٥) وە هەر یەکێکیان چوار ڕووخساری هەبوو، وە هەر یەکێکیان چوار باڵ (٦) وە قاچەکانی قاچی ڕێکن وە پێیەکانی وەك پێی گوێرەکەیە، وە دەبریقایەوە وەك برۆنزی سافکراو (٧) وە لە ژێر باڵەکانییەوە لە هەر چوار لاوە دەستی مرۆڤ هەیە، هەر چواریان ڕووخسار و باڵیان هەیە (٨) باڵەکانیان هەریەکە بەویترەوە نوساوە. وە

ئاژەڵەکان لەکاتی ڕۆشتندا لاینەدەدا و لەبەر ڕوخسارییەوە دەڕۆشت (٩) ئەمما شێوەی ڕوخساریان ئەوا ڕوخساری مرۆڤ بوو لە پێشەوە، وە ڕوخساری شێر بوو لە ڕاستەوە، وە ڕوخساری گا بوو لە چەپەوە، وە ڕوخساری هەڵۆ بوو لە پشتەوە (١٠) ڕوخسار و باڵیان جیابوو لە سەرەوە، هەریەکە بە دوو باڵ بەوی ترەوە بەسترابوو، وە بە دوو باڵەکەی تریش لەشی خۆیان دائەپۆشی (١١) وە هەریەکێکیان بەرەو پێشەوە ئەڕۆشت، وە رۆح بەرەو کوێی ببدرنایە دەڕۆشتن، لە ڕۆشتنیش لایاننەدەدا (١٢) ئەمما دیمەنی گیانلەبەرەکان وەك پشکۆی ئاگری داگیرساو یان وەك چەند مەشخەڵێك بوون، ئاگر لەنێوانیاندا هاتووچۆی ئەکرد، وە ئاگرەکە ڕووناکی هەبوو وە لە ئاگرەکەوە بروسکە دەردەچوو (١٣) ئاژەڵەکانیش وەك بروسکە دهاتن و دەچوون (١٤) وە کاتێك من تەماشای ئەم گیانلەبەرە زیندووانەم ئەکرد لەلای هەریەکێکیان لەسەر زەوی چەرخێك هەبوو (١٥).

- ئایا بەڕاستی خوای گەورە شتێکی لەو جۆرەی دروستکردووە لەسەر زەوی؟ یان خورافەیە و کتێب لە چیرۆك و ئەفسانەکانەوە وەریگرتووە؟ یان خەوێکە و کەسێك بینیویەتی و نوسیویێتییەوە و داوێتییە پاڵ خوای گەورە؟ وە حیکمەت و سوود لەم دەقە چییە بۆ مرۆڤایەتی؟

– وانطلق شمشون وقبض على ثلاث مئة ثعلب، وأخذ مشاعل، فجعل الثعالب ذنبا إلى ذنب، وجعل بين كل ذنبين مشعلا (٤) وأوقد المشاعل وأرسلها في زرع الفلسطينيين، وأحرق الحزم والزرع، حتى الكروم والزيتون (٥) (القضاة / ١٥) وە شەمشون دەرچوو وە سێ سەد ڕێوی گرت، وە مەشخەڵی برد، جا دوو دوو ڕێوییەکانی بەستەوە بە کلك، وە لە نێوان هەر دوو ڕێویدا مەشخەڵێکی دانا (٤) وە مەشخەڵەکانی گڕدا و ناردنی بۆ ناو کێڵگەکانی فەلەستینییەکان، وە کۆکراوە و چێنراوی سووتاند، تەنانەت مێو و زەیتوونەکانیش (٥).

- ئایا کەسێك بەتەنیا ئەو هەموو ڕێوییەی پێ ئەگیرێت؟ وە ئایا ئەتوانێت بە کلك بەیەکیانەوە ببەستێت؟

– وظهرت في السماء آية أخرى تنين كبير أشقر له سبعة رؤوس وعشرة قرون، وعلى رؤوسه سبعة تيجان (٣) وذنبه يجر ثلث كواكب السماء، فألقاها إلى الأرض. ووقف أمام المرأة التي توشك أن تلد، حتى إذا وضعت ولدها ابتلعه (٤) (رؤيا يوحنا / ١٢) وە لە ئاسماندا نیشانەیەکی تر دەرکەوت ئەژدیهایەکی گەورەی سوور حەوت سەر و دە شاخی هەبوو، وە لەسەر سەری حەوت تاج هەبوون (٣) وە کلکی سێیەکی ئەستێرەکانی ئاسمانی ڕائەکێشا،

جا فڕێیدایە سەر زەوی. وە لەبەردەم ئافرەتەكەدا وەستا كە خەریك بوو منداڵی ئەبوو، هەتا كە منداڵەكەی بوو قووتی دا (٤).

– ورأيت وحشا خارجا من البحر، له سبعة رؤوس وعشرة قرون، وعلى قرونه عشرة تيجان وعلى رؤوسه اسم تجديف (١) وكان الوحش الذي رأيته أشبه بالفهد، وقوائمه مثل قوائم الدب، وفمه مثل فم الأسد. فأولاه التنين قدرته وعرشه وسلطانا عظيما (٢) وكان أحد رؤوسه كأنه ذبح ذبحا مميتا. فشفي جرحه المميت، فتعجبت الدنيا كلها وتبعت الوحش (٣) وسجدوا للتنين لأنه أولى الوحش السلطان، وسجدوا للوحش وقالوا: ((من مثل الوحش؟ ومن يستطيع محاربته؟)) (٤) فأعطي فما يتكلم بالكبرياء والتجديف، وأولي سلطانا على العمل اثنين وأربعين شهرا (٥) ففتح فاه للتجديف على الله، فجدف على اسمه ومسكنه وعلى سكان السماء (٦) وأولي أن يحارب القديسين ويغلبهم، وأولي سلطانا على كل قبيلة وشعب ولسان وأمة (٧) وسيسجد له أهل الأرض جميعا، أولئك الذين لم تكتب أسماؤهم منذ إنشاء العالم في سفر الحياة، سفر الحمل الذبيح (٨) (رؤيا يوحنا / ١٣) وە دڕندەیەكم بینی لە دەریاوە هاتە دەرەوە، حەوت سەر و دە شاخی هەبوو، وە لەسەر شاخەكانی دە تاج هەبوو وە لەسەر سەرەكانی ناوی كفركردن هەبوو (١) وە ئەو دڕندەیەی من بینیم لە پڵنگ ئەچوو، پێیەكانی وەك پێی ورچ بوون، وە

دەمــی وەك دەمــی شــێر بــوو. جـا ئەژدیهاکــە توانـا و تــەختی خـۆی وە دەسەڵاتێکی مەزنی دایە (٢) وە سەرێکی وەك ئەوە بوو بۆ مردن بڕدرابێت. جا بڕینە کوشندەکەی ساڕێژ بوو، جا هــەموو دنیـا سەرسـام بــوو وە شــوێن دڕندەکە کەوتن (٣) وە سوجدەیان بۆ ئەژدیهاکە برد چونکە ئــەو دەســەڵاتی دایە دڕندەکە، وە سوجدەیان بۆ دڕندەکە برد و وتیان: (کێ وەك دڕندەیــە؟ وە کێ ئەتوانێت شەڕی بکات؟) (٤) جا دەمێکی درایــە قســەی لووتبــەرزی و کوفری ئەکرد، وە دەسەڵاتی درایە تا چل و دوو مانگ کـار بکـات (٥) جـا دەمی کردەوە تا کوفر بکات بــە خـوا، جـا کــوفری بــە نـاو و جێیەکــەی و دانیشتووانی ئاسمان کرد (٦) وە ڕێگای درا شەڕی گـەلی خـوا بکـات و زاڵ بێت بەسەریاندا، وە دەســەڵاتی درا بەســەر هــەموو هــۆز و گــەل و زمــان و نەتەوەیەکدا (٧) وە هەموو خەڵکی زەوی سوجدەی بۆ ئەبەن، ئەوانەی ناویان نەنوسراوە لەوەتەی دروستبوونی ژیان لە سفری ژیــان لــە پــەرتووکی ژیــانی بەرخە سەربڕدراوەکەدا (٨).

- ئایا ئەژدیهای حەوتسەر بوونی هەیە؟ یان خەو و خورافە و ئەفســانەی کتێبە؟ وە سوودی ئەم دەقانە چییە بۆ مرۆڤایەتی؟

— ذهبت الأشجار ذهابا ليمسحن عليهن ملكـة. فقلـن لشـجرة الزيتـون: كـوني علينا ملكة (٨) فقالت لهن الزيتونة: أأتخلى عن زيتي الذي بواسـطتي يكـرم

به الآلهة والناس فأذهب لأترنح فوق الأشجار؟ (٩) فقالت الأشجار للتينة: تعالي أنت فكوني علينا ملكة (١٠) فقالت لهن التينة: أأتخلى عن حلاوتي وثمرتي الطيبة فأذهب لأترنح فوق الأشجار؟ (١١) فقالت الأشجار للكرمة: تعالي أنت فكوفي علينا ملكة (١٢) فقالت لهن الكرمة: أأتخلى عن نبيذي الذي يفرح الآلهة والبشر فأذهب لأترنح فوق الأشجار؟ (١٣) فقالت الأشجار كلها للعوسجة: تعالي أنت فكوفي علينا ملكة (١٤) فقالت العوسجة للأشجار: إن كنتن حقا تمسحنني ملكة عليكن فتعالين استظللن بظلي وإلا فلتخرج نار من العوسجة وتأكل أرز لبنان (١٥) (القضاة / ٩) درەختەکان ڕۆشتن تا پاشایەك بۆخۆیان هەڵبژێرن. جا بە داری زەیتونیان وت: تۆ ببە بە پاشامان (٨) جا زەیتونەکە پێی وتن: ئایا واز لە زەیتەکەم بێنم کە بەهۆیەوە خواکان و خەڵك ڕێزیان ئەگیرێت وە بچم فەرمانڕەوایی درەختەکان بکەم؟ (٩) جا درەختەکان بە هەنجیریان وت: وەرە تۆ ببە بە پاشا بەسەرمانەوە (١٠) جا هەنجیرەکە پێی وتن: ئایا واز لە شیرینییەکەم و بەرە پاکەکەم بێنم و بچم ببم بە پاشای درەختەکان؟ (١١) جا درەختەکان بە مێویان وت: وەرە ببە بە پاشا بەسەرمانەوە (١٢) جا مێو پێی وتن: ئایا واز لە شەرابەکەم بێنم کە خواکان و خەڵك دڵخۆش ئەکات وە بچم ببم بە پاشای درەختەکان؟ (١٣) جا هەموو درەختەکان بە دڕك و داڵیان وت: تۆ وەرە ببە

بە پاشامان (١٤) جا دڕك و داڵیش بە درەختەكانی وت: گەر بەڕاستی من ئەكەن بە پاشا بەسەرتانەوە دەی وەرن لەژێر سێبەرەكەمدا خۆتان پەنا بدەن گەر نا ئەوا با ئاگرێك لە دڕكەكەوە دەرچێت و داری ئورزی لوبنان بسوتێنێت (١٥).

- ئەم چیرۆكە گەر خوای گەورە دایبەزاندووە سوود و حیكمەت لێی چییە و بۆچی بیزانین؟ وە ئایا چیرۆكی پێغەمبەران بەو جۆرەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە بەسوودترە و لە وەحییەوە نزیكترە یان چیرۆكی هەڵبژاردنی پاشای درەختەكان؟

– والأرنب، فإنها تجتر، ولكنها غير مشقوقة الحافر، فهي نجسة لكم (اللاويين ١١/ ٦) وە كەروێشكیش چونكە كاوێژ ئەكات، بەڵام سمەكەی لەت نییە، ئەو گڵاوە بۆتان.

- ئایا كەروێشك كاوێژ ئەكات؟ یان ئەوە تەنها خورافەی كتێبە؟

– وأخذ يعقوب عصي حور رطبة ولوز ودلب، وقشر فيها خطوطا بيضاء، كاشطا عن البياض الذي على العصي (٣٧) وجعل العصي التي قشرها تجاه الغنم في الحياض في مساقي الماء حيث كانت ترد الغنم، لكي توحم عليها إذا جاءت لتشرب (٣٨) فكانت توحم الضأن على العصي فتلد صغارا مخططة ورقطاء وبلقاء (٣٩) وفرز يعقوب الضأن فوجه الغنم نحو كل مخطط

وأسود من مواشي لابان، وبذلك جعل لنفسه قطعانا على حدة، ولم يجعلها مع مواشي لابان (٤٠) وكان يعقوب، كلما وحمت الغنم القوية، يضع العصي تجاهها في الحياض لتوحم عليها (٤١) وإذا كانت الغنم ضعيفة، لا يضع العصي تجاهها، فتكون الضعيفة للابان والقوية ليعقوب (٤٢) (تكوين / ٣٠) وە یەعقوب چڵی بی تەڕی برد وە بادەم و چنار، وە تیایا هێڵی سپی لەسەر کێشان، بە هەڵکۆڵێن و پاککردنی سپیایی سەر چڵەکان (٣٧) وە ئەو چڵانەی پاکی کردبوون ڕووەو مەڕەکان دانا لە ئاخوڕەکەدا لە جێی ئاوی خواردنیان کە مەڕەکان ئەهاتن بۆی، تا بێنە سەری کاتێك دێن بخۆنەوە (٣٨) جا مەڕەکان ئەهاتنە سەر چڵەکان و بەرخی خەتدار و خاڵدار و بەڵەکیان بوو (٣٩) جا یەعقوب بەرخەکانی جیاکردنەوە و ڕووی مەڕەکانی کردە هەموو خەتخەت و ڕەشێك لە ماڵاتەکەی لابان، وە بەوە مێگەلی بۆ خۆی دانا، وە لەگەڵ ئەوانەی لابان تێکەڵی نەکردن (٤٠) وە یەعقوب هەر جارێك مەڕە بەهێزەکان بهاتنایە بەران بگرن چڵەکانی دائەنا لە ڕوویان لە ئاخوڕەکانا تا بێنە سەری (٤١) وە گەر مەڕەکان لاواز بوونایە، چڵەکانی ڕوویان دانەئەنا، جا لاوازەکان بۆ لابان ئەبوون وە بەهێزەکان بۆ یەعقوب (٤٢).

- ئەم دەقانەی پێشوو بریتین لە چۆنییەتی بەرهەمهێنانی مەڕی خەتخەت و ڕەنگاوڕەنگ. کێش باوەڕی پێیان هەیە با بچێت تاقیبکاتەوە و دواتر سوودەکانی کە لێوەی وەرگرتووە بۆمان باسبکات.

– ووجد فك حمار طريئا، فمد يده وتناوله وقتل به ألف رجل (القضاة ١٥/ ١٥) وە شەویلگەی کەرێکی دۆزییەوە کە تەڕبوو، جا دەستی برد و هەڵیگرت وە هەزار پیاوی پێ کوشت.

- ئایا ئەشێ کەسێك ژمارەیەك کەسی زۆر تەنها بە شەویلگەی کەرێك بکوژێت؟ یان خورافەیەکی تری کتێبە؟ وە گەر کەسێك بڵێت: ئەمە موعجیزەیە، وە توانا و پشتیوانی خوا دەرئەخات بۆ باوەڕدارەکانی. ئەڵێین: ئایا خوا لەو نموونەیە باشتری لانەبوو توانای خۆی نیشانبات؟ بەوەی لەبری شەویلگەی کەر بدات بە عەبدێکی شمشێرێك یان ڕمێك یان تیرێکی بداتێ. وە ئایا ئەولاتر نەبوو خوا لە زۆرانبازییەکەیدا لەگەڵ یەعقوبدا توانای خۆی دەرخات؟ یان ئەو کاتەی عەبدێکی شەڕی ئەو قەومەی کرد کە گالیسکەی ئاسنیان هەبوو؟

– وهم يقولون للجبال والصخور: (( أسقطي علينا وغطينا عن وجه الجالس على العرش وعن غضب الحمل (١٦) فقد جاء اليوم العظيم، يوم غضبهما، فمن يقوى على الثبات؟ )) (١٧) (الرؤيا / ٦) وە ئەوان بە شاخەکان و

بەردیان ئەوت: (بەسەرماندا بڕوخێ و دامانپۆشە لە ڕووی ئەوەدا کە لەسەر تەخت دانیشتووە وە لە تووڕەیی بەرخەکە (١٦) چونکە ڕۆژە مەزنەکە هات، ڕۆژی تووڕەبوونی، جا کێ توانای خۆڕاگری هەیە؟) (١٧).

- وهم يصيحون بأعلى أصواتهم فيقولون: (( الخلاص لإلهنا الجالس على العرش وللحمل! )) (الرؤيا ٧/ ١٠) وە ئەوان بە بەرزترین دەنگیان هاوارئەکەن و ئەڵێن: (ڕزگاری بۆ خوامان دانیشتوو لەسەر تەخت وە بۆ بەرخەکە).

- وقال لي الملاك: (( أكتب: طوبى للمدعوين إلى وليمة عرس الحمل )) . وقال لي: (( هذا الكلام كلام الله حق )) (الرؤيا ١٩/ ٩) وە فریشتەکە پێی وتم: (بنووسە: خۆشی بۆ ئەوانەی بانگهێشت کراون بۆ زەماوەندی هاوسەرگیری بەرخەکە). وە پێی وتم: (ئەم قسەیە قسەی خوای حەقە).

- وجاء أحد الملائكة السبعة، أصحاب الأكواب السبعة الممتلئة بالنكبات السبع الأخيرة، فخاطبني قال: (( تعال أرك العروس امرأة الحمل )) (الرؤيا ٢١/ ٩) وە یەکێك لە حەوت فریشتەکە هات، خاوەن حەوت کوپە پڕەکە بە دوایین حەوت دەردەکە، وە دواندمی و وتی: (وەرە بووکەکەت نیشان بدەم ژنی بەرخەکە).

– وسور المدينة له اثنا عشر أساسا، عليها الأسماء الاثنا عشر لرسل الحمل الاثني عشر (الرؤيا ٢١/ ١٤) وە شوورای شارەکە دوانزە بناغەی هەیە، دوانزە ناوی لەسەرە هی دوانزە پێغەمبەرەکەی بەرخەکەیە.

– ولم أر فيها هيكلا، لأن الرب الإله القدير هو هيكلها، وكذلك الحمل (٢٢) والمدينة لا تحتاج إلى الشمس ولا إلى القمر ليضيئا لها، لأن مجد الله أضاءها، وسراجها هو الحمل (٢٣) (الرؤيا / ٢١) وە تیایا هیچ پەرستگایەکم نەبینی، چونکە خوای یەزدانی بەتوانا ئەو پەرستگایەتی لەگەڵ بەرخەکەدا (٢٢) وە شارەکە پێویستی بە خۆر نییە وە بە مانگ نییە تا ڕووناکی بۆ بدەن، چونکە شکۆی خوا ڕووناکی کردووەتەوە، وە چراکەی بەرخەکەیە (٢٣).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت مەڕێك یان بەرخێك لەگەڵ خوادا یەکسانن لە توانا و توڕەبوون و سزاداندا. وە ئەم مەڕە وەك خوا تەمجید و زیکر ئەکرێت. وە ئەم مەڕە زەواج ئەکات و حەفلەی بۆ ئەکات. وە ئەم مەڕە پێغەمبەری هەیە.

– ولما ابتدأ الناس يكثرون على وجه الأرض، وولد لهم بنات (١) استحسن بنو الله بنات الناس. فاتخذوا لهم نساء من جميع من اختاروا (٢) فقال الرب: (( لا تثبت روحي في الإنسان للأبد، لأنه بشر، فتكون أيامه مئة وعشرين سنة

)) (٣) وكان على الأرض جبابرة في تلك الأيام، وبعد ذلـك أيضـا حـين دخـل بنو الله على بنات الناس فولدن لهم أولادا، هم الأبطال المعروفون منـذ القـدم (٤) (تكـوين / ٦) وە کاتێك خەڵكەکە دەستیانکرد بە زۆربوون لەسەر ڕووی زەویدا، وە کچیان بوو (١) کوڕانی خوا کچانی مرۆڤیان بە جوان بـینی. جـا بۆخۆیان ژنیان برد لە هەموو ئەوانەی هەڵیانبژارد (٢) جا خوا وتی: (ڕۆحـم لە ئینساندا تا هەتایە نامێنێتەوە، چونکە بەشـەرە، جـا ڕۆژەکـانی سـەد و بیست ساڵ ئەبێت) (٣) وە لەسەر زەویدا زەبەلاح هەبوون لـەو ڕۆژانـەدا، وە لەدوای ئەوەش کاتێك کوڕانی خوا چوونە لای کچانی مرۆڤ جا منداڵیان لێیان بوو، ئەوان پاڵەوانە ناسراوەکانن لە کۆنەوە (٤).

- بەپێی ڕواڵەتی ئەم دەقانە بێت خوای گەورە چەندین کـوڕی هەیـە. وە فریشتەکان لەگەڵ ئافرەتی مرۆڤ جووت بوون و منـاڵیان لێیان بـوو[٣]. وە ئەم منـاڵانەیان زۆر زەبەلاح دەرچوون و پاڵەوانە مێژوویيـەکانن. وە مرۆڤەکان تەمەنیان سەد و بیست ساڵ تێناپەڕێت.

– فقالت له: ((كيف تقول: إني أحبك، وقلبك ليس معـي، وهـذه ثـلاث مـرات وأنت تخدعـني ولم تخبرني أين تكمن قوتك العظيمة)) (١٥) ولما كانت تضـايقه بكلامها كل يوم وتزعجه، ضاقت نفسه حتى الموت (١٦) فأطلعها على كـل ما في قلبه وقال لها: ((لم يعل رأسي موسى، لأني نذير لله من بطن أمي. فإن

حلق رأسي، فـارقتني قـوتي وضـعفت وصـرت كواحـد مـن النـاس )) (١٧) (القضاة / ١٦) جا پێی وت: (چۆن ئەڵێیت: من تـۆم خۆشـئەوێت، وە دڵـت لەگەڵمدا نییە، وە ئەمە سێ جـارە و تـۆ ئەمخەڵـەتێنیت وە پێتنـەوتم هێـزە مەزنەکەت لە چیدایە) (١٥) وە کاتێك بێزاری ئەکرد بـە قسـەکەی هـەموو ڕۆژێك و وەڕسی ئەکرد، دەروونی تەنگ بوو هەتا مردن (١٦) جا هەرچی لە دڵیدا بوو بۆی دەرخست و پێی وت: (سەرم موسی بەرنەکەوتووە، چونکە من نەزری خوا کراوم لە سکی دایکمەوە. جا گەر سەرم بتاشرێت، هێزەکـەم لـێم جیائەبێتەوە و لاوازئەبم و ئەبم بە یەکێك لە خەڵك) (١٧).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت یەکێك لە پاڵەوانە مەزنـەکانی مێـژوو نهـێنی هێز و توانای لە قژی درێژیدا بووە، کە لە منالّییـەوە نەیتاشـیوە. وە ئـەم پاڵەوانـە ئافرەتێـك تـوانی بیخەڵـەتێنێت و نهێنییەکـەی پـێ بدرکێنێت، وە پاڵەوانەکە نەیتوانی بەرگـەی قسـە و زۆرلێکردنـەکانی ئەو ئافرەتە بگرێت.

– كان شاول ابن سنة حين صار ملكا، وملـك سـنتين علـى إسـرائيل (صـموئيل الأول ١٣/ ١) شاول تەمەنی یەك ساڵ بوو کاتێك کە بوو بـە پاشـا، وە دوو ساڵ پاشای ئیسرائیل بوو.

- بەپێى ئەم دەقە بێت ساوایەك لە یەك ساڵیدا بوو بە پاشا، وە بـۆ دوو ساڵ حوكمى كرد.

– وهرب داود ونجا وأتـى إلى صـموئيل في الرامـة، وأخـبره بكـل مـا صـنع بـه شاول، ومضى هو وصموئيل وأقاما بنايوت (١٨) فأخبر شـاول وقيـل لـه: " هوذا داود في بنايوت الرامة " (١٩) فأرسل شاول رسلا يقبضون علـى داود. فرأى رسله جماعة الأنبياء وهم يتنبـأون و وصـموئيل واقـف رئيسـا علـيهم. فحل روح الرب على رسل شاول فتنبأوا هم أيضا (٢٠) فأخبر شـاول فأرسـل رسلا آخرين، فتنبأوا هم أيضا. وعاد شاول فأرسل رسلا مرة ثالثـة، فتنبـأوا أيضا (٢١) فذهب هو بنفسـه إلى الرامـة، وانتهـى إلى البئـر الكـبيرة الـتي عند سيكو، وسأل قائلا: " أين صموئيل وداود؟ " فقالوا لـه: " في نـايودت في الرامة " (٢٢) فذهب شاول إلى هناك إلى نايوت في الرامـة، فحـل عليـه أيضا روح الله، فجعل يسير ويتنبأ حتى انتهـى إلى نـايوت في الرامـة (٢٣) ونزع هو أيضا ثيابه وتنبأ هو أيضـا أمـام صـموئيل، وانطـرح عريانـا نهـاره ذلـك وليلـه كلـه. لـذلك يقولـون: " أشـاول أيضـا مـن الأنبيـاء؟ " (٢٤) (صـموئيل الأول / ١٩) وە داود ڕایكـرد و ڕزگـاریبوو وە هـات بـۆ لاى صاموئیل لە رامـە، وە هـەموو ئـەوەى شـاول پێیكـرد پێیـوت، وە ئـەو و صاموئیل ڕۆشتن و لە نایۆت نیشتەجێ بوون (١٨) جا بە شاول ڕاگەیـەنرا و

وترا: "ئەوە داودە لە نایۆتە لە رامە" (١٩) جا شاول چەند نێردراوێکی نارد تا داود بگرن. جا نێردراوەکانی کۆمەڵی پێغەمبەرانیان بینی حاڵ گرتوونی و صاموئیل وەستاوە بەسەریانەوە. جا رۆحی خوا چووە سەر نێردراوەکانی شاول و ئەوانیش حاڵیان لێهات (٢٠) جا بە شاول وترا ئەویش نێردراوی تری نارد جا ئەوانیش حاڵیان لێهات، جا هەمدیس شاول نێردراوی نارد بۆ جاری سێیەم و ئەوانیش حاڵیان لێهات (٢١) جا ئەو خۆی چووە رامە، وە گەشتە بیرە گەورەکە لای سیکو، وە پرسیاری کرد وتی: "صاموئیل و داود لەکوێن؟" پێیان وت: "لە نایوتن لە رامە" (٢٢) جا شاول چووە ئەوێ بۆ نایۆت لە رامە، جا رۆحی خوا چووە سەر ئەویش، جا ئەڕۆشت و حاڵ گرتبووی تا گەشتە نایوت لە رامە (٢٣) وە ئەویش جلەکانی داکەند و لەبەردەم ساموئیلدا حاڵ گرتی، وە بە ڕووتی کەوت تەواوی ڕۆژ و شەوەکە. بۆیە ئەڵێن: "ئایا شاولیش لە پێغەمبەرانە؟" (٢٤).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت کەسێکی زاڵم و پیاو کوژ ئەیەوێت پێغەمبەرێك بکوژێت، وە جارێك و دووان و سیان خەڵك ئەنێرێت بۆ گرتنی ئەو پێغەمبەرە، بەڵام هەموو جارێك کەسەکان لەبری ئەوەی لەناو بچن ئەبن بە پێغەمبەر. تەنانەت پیاو کوژەکەش کە ئەچێت بۆ

ئەو جێیە ئەویش ئەبێت بە پێغەمبەر. وە نیشانەی پێغەمبەرێتی ئەوەیە خۆی ڕووتبکاتەوە.

- وخاطب الرب موسى وهارون قائلا: (٢٠) ((انفردا عن هذه الجماعة لأني سأفنيها في لحظة)) (٢١) فسقطا على وجهيهما وقالا: ((اللهم، يا إله أرواح كل بشر، رجل واحد يخطأ وعلى الجماعة كلها تغضب؟)) (٢٢) (العدد / ١٦) وە خوا قسەی لەگەڵ موسا و هارون کرد و وتی: (٢٠) (لەم کۆمەڵەیە جیاببنەوە چونکە من لە ساتێکدا لەناویان ئەبەم) (٢١) جا بەسەر ڕوویاندا کەوتن و وتیان: (یا الله ئەی خوای ڕۆحی هەموو مرۆڤ، یەك پیاو هەڵە ئەکات و لەسەر هەموو کۆمەڵەکە توورە ئەبیت؟) (٢٢).
- فقال داود لناتأن: ((قد خطئت إلى الرب )). فقال ناتأن لداود: ((أن الرب أيضا قد نقل خطيئتك عنك، فلا تموت (١٣) ولكن، إذ أنك بهذا الأمر أهنت الرب إهأنة شديدة، فالآبن الذي يولد لك يموت موتا )) (١٤) (صموئيل الثاني / ١٢) جا داود بە ناتانی وت: (من هەڵەم بەرامبەر خوا کرد). جا ناتان بە داودی وت: (خوا هەڵەکەتی لەسەرت هەڵگرت، جا نامریت (١٣) بەڵام، چونکە بەم کارە سووکایەتییەکی توندت بە خوا کرد، ئەو کوڕەی تۆ کە لەدایکئەبێت مردنێك ئەمرێت) (١٤).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت خوا سزای کەسانێکی بێ تاوان ئەدات بەهۆی تاوانی یەکێکی ترەوە. وە پێغەمبەرەکانی هەڵەکانی بۆ ڕاست ئەکەنەوە و نەسیحەتی ئەکەن.

— وكانت مجاعة في أيام داود ثلاث سنين، سنة بعد سنة. فسأل داود وجه الرب. فقال الرب: ((على شاول وعلى بيته دم، لأنه قتل الجبعونيين)) (١) فدعا الملك الجبعونيين وكلمهم (ولم يكن الجبعونيون من بني إسرائيل، بل من بقية الأموريين، وكان بنو إسرائيل قد حلفوا لهم، فطلب شاول قتلهم غيرة على بني إسرائيل ويهوذا) (٢) وقال داود للجبعونيين: ((ما الذي أصنع لكم وبماذا أكفر فتباركوا ميراث الرب؟ )) (٣) فقال له الجبعونيون: ((ليس لنا على شاول وأهل بيته فضة ولا ذهب، ولا لنا أحد نهلكه في إسرائيل )). فقال لهم: (( ما الذي تقولونه فأفعله لكم؟ )) (٤) فقالوا للملك: (( الرجل الذي أهلكنا والذي عزم على إبادتنا حتى لا نقيم في جميع أراضي إسرائيل (٥) يعطى لنا سبعة رجال من بنيه فنشنقهم للرب في جبع شاول مختار الرب )). فقال لهم الملك: ((أعطي )) (٦) وأبقى الملك على مفيبعل بن يوناتان بن شاول، من أجل يمين الرب التي بينهما، أي بين داود ويوناتان بن شاول (٧) فأخذ الملك آبني رصفة، بنت أية، اللذين ولدتهما لشاول، وهما أرموني ومفيبوشت وبني ميكال آبنة شاول الخمسة الذين ولدتهم لعدريئيل بن برزلاي

المحولي (٨) فأسلمهم إلى يد الجبعونيين، فشنقوهم على الجبل أمام الرب، فهلكوا سبعتهم جميعا، وكان مقتلهم في الأيام الأولى للحصاد، في آبتداء حصاد الشعير (٩) فأخذت رصفة، بنت أية، مسحا وفرشته لنفسها على الصخرة، منذ آبتداء الحصاد حتى سقط عليهم الماء من السماء، ولم تدع طيور السماء تحط عليهم نهارا ولا وحوش البرية ليلا (١٠) فأخبر داود بما صنعت رصفة، بنت أية، سرية شاول (١١) فمضى داود وأخذ عظام شاول وعظام يوناتان ابنه من عند أهل يابيش جلعاد الذين سرقوها من ساحة بيت شان، من حيث علقهما الفلسطينيون يوم كسر الفلسطينيون شاول في الجلبوع (١٢) وأصعد من هناك عظام شاول وعظام يوناتأن آبنه، وجمعوا عظام المشنوتين (١٣) ودفنوا عظام شاول ويوناتان آبنه في أرض بنيامين بصيلع، في مقبرة قيس أبيه، وعملوا بكل ما أمر به الملك ، وعطف الله على تلك الأرض بعد ذلك (١٤) (صموئيل الثاني / ٢١) لە سەردەمی داوددا برسێتییەك بوو سێ ساڵی خایاند، ساڵ لەدوای ساڵ. جا داود لە خوای پرسی. جا خوا وتی: (لەسەر شاول و ماڵەکەی خوێنێك هەیە، چونکە لە جەبعونییەکانی کوشت) (١) جا پاشا جەبعونییەکانی بانگکرد و قسەی لەگەڵ کردن، وە جبعونییەکان لە بەنی ئیسرائیل نەبوون، بەڵکو لە پاشماوەی ئەمورییەکان بوون، وە بەنی ئیسرائیل سوێندیان بۆ خواردبوون کە ئاشت بن

لەگەڵیان، جا شاول فەرمانی بە کوشتنیان کرد بەهۆی دڵگەرمی بۆ بەنی ئیسرائیل و یەهوزا (٢) وە داود بە جبعونییەکانی وت: (چیتان بۆ بکەم و بەچی کەفارەتەکە بدەم تا میراتی یەزدان بەرەکەتدار بکەن؟) (٣) جبعونییەکان پێیان وت: (لە ماڵی شاول زیو و ئاڵتوونمان بۆ نییە، وە کەسمان بۆ نییە لە ئیسرائیلدا بیکوژین). جا پێی وتن: (چی ئەڵێن بۆتان بکەم؟) (٤) جا بە پاشایان وت: (ئەو پیاوەی لێی کوشتین وە سوور بوو لەسەر لەناوبردنمان هەتا لە هەموو زەوی ئیسرائیلدا نەژین (٥) حەوت پیاومان بداتێ لە نەوەکانی جا لە پەتیان بدەین بۆ خوا لە جبعی شاول هەڵبژێردراوی خوا). جا پاشا پێیانی وت: (ئەیدەم) (٦) وە پاشا مەفیبەعلی کوڕی یۆناتانی کوڕی شاولی هێشتەوە لەبەر ئەو سوێندەی یەزدان کە لە نێوانیاندا هەبوو، واتە لەنێوان داود و یۆناتانی کوڕی شاول (٧) جا پاشا دوو کوڕەکەی رەصفەی کچی ئەییەی برد کە لە شاول بووبوونی، کە ئەرمونی و مەفیبوشت بوون، وە پێنج کوڕەکەی میکالی کچی شاولیش کە لە عەدریئیلی کوڕی بەرزیلای مەحۆلی بووبوونی (٨) جا ڕادەستی جەبعونییەکانی کردن، جا هەڵیانواسین لە بەردەم یەزدان لەسەر شاخەکە، جا هەر حەوتیان مردن، وە کوشتنیان لە ئەوەڵ ڕۆژەکانی دروێنەدا بوو، لە سەرەتای دروێنەی جۆ (٩) جا رەسفەی کچی ئەییە بەرگی ماتەمی برد و

لەسەر بەردێك ڕایخست بۆ خۆی لە سەرەتای دروێنەوە تا باران بەسەریاندا باری لە ئاسمانەوە، وە نەیهێشت باڵندەی ئاسمان بە ڕۆژ بێنە سەر تەرمەکان نە دڕندەی کێویش بە شەو (١٠) جا بە داود وترا ڕەسفەی کچی ئەییە کەنیزەی شاول چی کردووە (١١) داودیش ڕۆشت ئێسقانەکانی شاول و ئێسقانەکانی یۆناتانی کوڕی لەلای دانیشتووانی یابیش جلعاد هێنا کە دزیبوویان لە گۆڕەپانی بەیت شان، لەو شوێنەی کە فەلەستینییەکان هەڵیانواسیبوون ئەو ڕۆژەی فەلەستینییەکان شاولیان شکاند لە جلبوع (١٢) وە لەوێوە ئێسقانەکانی شاول و ئێسقانەکانی یۆناتانی هەڵگرتەوە، وە ئێسقانی هەڵواسراوەکانیشی کۆکردەوە (١٣) وە ئێسقانەکانی شاول و یۆناتانی کوڕی ناشت لە زەوی بنیامین لە سیلەع لە قەبرسانی قەیسی باوکی، وە هەموو ئەوەیان کرد کە پاشا فەرمانی پێکردبوو، وە خوا دوای ئەوە وەڵامی داواکەی دانەوە لەسەر زەوییەکە (١٤).

- بەگوێرەی ئەم دەقانە بێت خوا بارانی نەباراند تا هەندێك بێتاوان کوژران. وە ئاساییە کەسێك تاوانی کردبێت و خەڵکێکی تر کە دوای ئەو هاتوونەتە دنیاوە سزا بدرێن لەبری. وە خوا و پێغەمبەرەکەی بە مرۆڤەکان ناڵێن چۆن کێشەکانیان چارەسەر بکەن.

– وكان ان الملك داود شاخ وطعن في السن، وكانوا يغطونه بالثياب فلا يدفأ (١) فقال له خدمه: (( ليبحث لسيدنا الملك عن فتاة عذراء تقوم أمام الملك، فتعنى به وتضجع في حضنك ، فيدفأ سيدنا الملك )) (٢) فبحثوا عن فتاة جميلة في جميع أراضي إسرائيل، فوجدوا أبيشاج الشونمية، فاتوا بها الملك (٣) (الملوك الأول / ١) وە داودی پاشا پیربوو وە تەمەنی زۆربوو، وە بە جل دایانئەپۆشی و گەرم نەئەبووەوە (١) جا خزمەتکارەکانی پێیان وت: (با بۆ پاشامان بگەڕێین بۆ کچێکی عازەب لەبەردەم پاشا دانیشێت، جا خزمەتی بکات و لە باوەشت پاڵبکەوێت، ئەوکات پاشای سەرۆکمان گەرمی ئەبێتەوە) (٢) جا بەدوای کچێکی جواندا گەڕان لە هەموو زەوی ئیسرائیلدا، جا ئەبیشاجی شونێمیان دۆزییەوە، وە هێنایان بۆ پاشا (٣).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت چارەسەری لەرز و تا ئەوەیە کچێکی نامەحرەمی جوان بهێنیت و بیخەیتە باوەشتەوە.

– فإن الإنسان مولود لمعاناة المتاعب، كما ولدت الجوارح لتحلق بأجنحتها (أيوب ٥ / ٧) چونکە مرۆڤ لەدایك ئەبێت بۆ چەرمەسەری، وەك چۆن باڵدارەکان لەدایك بوون بۆئەوەی بفرن بە باڵەکانیان.

- بەپێی ئەم دەقە بێت هۆی دروستکردنی مرۆڤ لەلایەن خواوە ئەوەیە کە بچەوسێتەوە و ئازار بچێژێت.

– أمرين لا تفعل بي فحينئذ لا أتوارى عن وجهك (٢٠) أبعد عني يدك ولا يروعني رعبك (٢١) أدع فأجيب أو فلأخاطبك أنا فتجاوبني (٢٢) ما الذي لي من الآثام والخطايا؟ أعلمني معصيتي وخطيئتي (٢٣) لم تواري وجهك وتعدني عدوا لك؟ (٢٤) أتروغ ورقة منثورة وتطارد قشة يابسة؟ (٢٥) فإنك تكتب علي أمورا مريرة وتلحق بي آثام صبائي (٢٦) وتجعل رجلي في مقطرة وتراقب جميع طرقي وتخط حول باطن قدمي (٢٧) وهذا الرجل يبلى كشيء مسوس وكثوب قد أكله العث (٢٨) (أيوب / ١٣) دوو شت هەیە پێم مەکە ئیتر لەبەر ڕوخسارت ون نابم (٢٠) دەستتم لێ دوورخەرەوە وە با سامت نەمتۆقێنێ (٢١) ئینجا بانگم بکە و وەڵامت ئەدەمەوە یان با من بتدوێنم و تۆ وەڵامم بدەرەوە (٢٢) چی تاوان و گوناحێکم هەیە؟ تاوان و گوناحەکەمم پێ بڵێ (٢٣) بۆچی ڕووت ئەشاریتەوە وە بە دوژمنتم ئەزانیت؟ (٢٤) ئایا گەڵایەکی هەڵوەریو پانئەکەیتەوە و بەدوای پوشێکی وشکا ڕائەکەیت؟ (٢٥) چونکە تۆ شتانێکی تاڵم لەسەر ئەنوسیت وە تاوانی گەنجێتیم پێوە ئەلکێنیت (٢٦) وە پێم ئەخەیتە کۆتەوە وە چاودێری هەموو ڕێیەکم ئەکەیت وە ناوەوەی قاچم دەپشکنیت (٢٧) وە ئەم پیاوە بەڵا ئەیگرێت وەك شتێکی کلۆر وە وەك جلێك کە مۆرانە خواردبێتی (٢٨).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت بەڵا و نارەحەتی تەنها یەك هۆکاری هەیە ئەویش تاوانکردنە. جا گەر بەڵایەکت تووش بوو ئەوا بزانە کە تاوانباریت. وە هەروەها خوا سزای عەبدێکی ئەدات لە دنیادا و ئیهمالیشی ئەکات و وەڵامی ناداتەوە، هەرچەندە عەبدەکە هاوار ئەکات و داوای ڕێی تۆبەی لێئەکات. وە خوا بەدوای پوشا ئەگەڕێت و خۆی بە گەڵاوە مەشغوڵ ئەکات، وە خەریکی شتی بێ سوود و پووچە لەبری ئەوەی بێت بەلای هاواری عەبدەکانیدا. وە گەر خوا بە شتێکەوە مەشغوڵ بێت ئاگای لە شتێکی تر نییە، وە لە هەمان کاتدا ناتوانێت چەند کارێك بکات و چەند شتێك ببات بەڕێوە.

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ (المائدة - ٦٧) ئەی پێغەمبەر ئەوە بگەیەنە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت دابەزیوە، وە گەر وانەکەیت ئەوا پەیامەکەیت نەگەیاندووە، وە خوا ئەتپارێزێت لە خەڵك ﴾.

+ ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (التوبة - ٤٠) گەر پێغەمبەر سەرنەخەن ئەوا خوا سەریخست کاتێك کافران دەریانکرد یەکێك بوو لە دووانەکە، کاتێك لە ئەشکەوتەکەدا بوون بە هاوەڵەکەی وت خەفەت مەخۆ خوا لەگەڵمانە، جا خوا ئارامی دابەزاندە سەری، وە پشتیوانیکرد بە سەربازانێك نەبینران، وە قسەی کافرانی ژێرخست وە قسەی خوای بڵند کرد، وە خوا بە عیززەت و کاربەجێیە ﴾.

+ ﴿ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآۚ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ (القصص - ٣٥) وتی بە براکەت بەهێزت ئەکەین، وە بەڵگەی بەهێزتان ئەدەینێ وە ناگەن بە ئێوە، بەهۆی ئایەتەکانمان هەردووکتان و ئەوەی شوێنتان بکەوێت سەرکەوتوون ﴾.

+ ﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيْكَ (هود - ٨١) وتیان ئەی لوط ئێمە نێردراوی پەروەردگارتین ئەوان ناگەن بە ئازاردانی تۆ ﴾.

+ ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا (١٥٧) بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِۚ وَكَانَ

ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٥٨) (النساء) وە قسەكەیان كە ئێمە مەسیح عیسای كوڕی مەریەممان كوشت پێغەمبەری خوا، وە نەیانكوشت وە لە خاچیان نەدا بەڵكو لێیان تێكچوو، وە ئەوانەی تیای ڕاجیا بوون لە شكدان تیای زانستیان نییە پێی تەنها شوێن گومان كەوتوون، وە بە دڵنیاییەوە نەیانكوشت (١٥٧) بەڵكو خوا بۆ لای خۆی بەرزیكردەوە، وە خوا باڵادەست و كاربەجێیە (١٥٨) ﴾.

+ ﴿ قُلۡ فَلِمَ تَقۡتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبۡلُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (البقرة - ٩١) بڵێ ئەی بۆچی پێغەمبەرانی خواتان ئەكوشت پێشتر گەر ئیماندار بوون ﴾.

+ ﴿ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَ (الزمر - ٧) گەر كوفر بكەن ئەوا خوا پێویستی پێتان نییە، وە بە كوفر ڕازی نییە بۆ عەبدەكانی ﴾.

● لەم دەقانەی قورئانی پیرۆزەوە ئەزانین كە خوای گەورە پێغەمبەران علیهم السلام ئەپارێزێت. وە گەر پێغەمبەرێكیش لەلایەن قەومەكەیەوە ئازار درابێت یان كوژرابێت، ئەوا خوای گەورە بەو كوفرە ڕازی نەبووە و قەومەكەی بە تاوانبار داناوە. جیاواز لەو خورافەیەی كتێب كە خوا وەحی ئەنێرێت لە پێغەمبەرێكی بدرێت.

+ ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا
مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ
أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ (٣٠) وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى
ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٣١) قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ
لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم
بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ (٣٣) وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ
ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ (٣٤)
وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا
تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا
فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي
ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ (٣٦) فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ
عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (٣٧) قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم
مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (٣٨)
وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٣٩)

(البقرة) وە كە پەروەردگارت بە مەلائیكەتەكانی وت من لە زەویدا جێنشین دائەنێم، وتیان ئایا ئەوە تیایا دائەنێیت كە خراپە ئەكات و خوێن ئەڕژێت وە ئێمە تەسبیحاتت ئەكەین و تۆ پاك ڕائەگرین لە كەموكورتی، وتی من

ئەوە ئەزانم کە ئێوە نایزانن (٣٠) وە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، پاشان خستنییە بەردەم فریشتەکان جا وتی ناوی ئەوانەم پێ بڵێن گەر ڕاستگۆن (٣١) وتیان پاکی بۆ تۆ ئێمە زانستمان نییە مەگەر ئەوەی خۆت فێرتکردووین، تەنها تۆ زانا و دانایت (٣٢) وتی ئەی ئادەم ناوەکانیان پێ بڵێ، جا کاتێك ناوەکانی پێ وتن وتی ئەی پێم نەوتن من شاردراوەکانی ئاسمانەکان و زەوی ئەزانم وە ئەزانم چی دەرئەخەن و چی ئەشارنەوە (٣٣) وە کاتێك بە فریشتەکانمان وت کڕنوش بۆ ئادەم ببەن هەموو کڕنوشیان برد ئیبلیس نەبێت نەیبرد و لوتبەرز بوو وە لە کافران بوو (٣٤) وە وتمان ئەی ئادەم تۆ و ژنەکەت بچنە بەهەشتەوە، وە تیایا بخۆن بێ ماندووبوون چیتان بوێت، وە نزیك ئەم دارە مەکەونەوە ئەگینا لە ستەمکاران ئەبن (٣٥) جا شەیتان پێی خلیسکاندن لێی جا دەریهێنان لەوەی تیایبوون، وە وتمان دابەزن هەنێکتان بۆ ئەوی تر دوژمنە، وە لە زەویدا نیشتەجێ بن و پێداویستیتان هەیە تا قیامەت (٣٦) جا ئادەم لە پەروەردگارییەوە چەند وشەیەکی وەرگرت و ئەویش لێی خۆشبوو، هەر ئەوە لێبووردە و بەرەحم (٣٧) وتمان هەمووتان دابەزنە سەر زەوی، جا لە منەوە هیدایەتتان بۆ دێت جا هەرکەس شوێن هیدایەتەکەم بکەوێت ئەوا ترسیان لەسەر نییە و خەفەتیش ناخۆن

(٣٨) وە ئەوانەی کوفریان کرد و ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە ئائەوانە هاوەڵانی ئاگرن ئەوان تیایا ئەمێننەوە بە نەمری (٣٩) ﴾.

+ ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا (٦١) قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا (٦٢) قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا (٦٣) وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا (٦٤) إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا (٦٥) (الإسراء) وە کە بە فریشتەکانمان وت سوجدە بۆ ئادەم ببەن سوجدەیان برد ئیبلیس نەبێت وتی ئایا سوجدە بۆ شتێك ببەم کە لە قوڕ دروستتکردووە (٦١) وتی ئەمەت دیوە کە بەسەر منا ڕێزت داوەتیٚ گەر تا قیامەت مۆڵەتم بدەیت ئەوا نەوەکانی گومڕا ئەکەم کەمێکیان نەبێت (٦٢) وتی بڕۆ جا هەرکەس شوێنت بکەوێت لەوان ئەوا جەهەننەم پاداشتتانە کە پاداشتێکی تەواوە (٦٣) وە گومڕایان بکە هەرکێیان بتوانیت بە وەسوەسە و گۆرانیت، وە بە سواری و پیادە زاڵ بە بەسەریاندا وە بەشدارییان بکە لە سامان و منداڵدا وە بەڵێنیان بدەریٚ، وە شەیتان هیچ وەعدێکیان ناداتیٚ مەگەر لەخشتەبردنە (٦٤) بەندەکانم هیچ

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ (٢٣) وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ (٢٤) وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢٥) قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ (٢٦) وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ (٢٧) فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ (٢٨) يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ (٢٩) وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ (٣٠) فَلَمَّا سَمِعَتۡ بِمَكۡرِهِنَّ أَرۡسَلَتۡ إِلَيۡهِنَّ وَأَعۡتَدَتۡ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا وَءَاتَتۡ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنۡهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيۡنَهُۥٓ أَكۡبَرۡنَهُۥ وَقَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّ وَقُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ (٣١) قَالَتۡ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمۡتُنَّنِي فِيهِۖ وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَۖ وَلَئِن لَّمۡ يَفۡعَلۡ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسۡجَنَنَّ وَلَيَكُونٗا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ (٣٢) قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا

تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ (٣٣) فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (٣٤) ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ (٣٥) (يوسف) وە ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵیدا بوو داوای لێکرد کاری خراپی لەگەڵ بکات وە دەرگاکانی داخست و وتی وەرە پێشەوە، یوسف وتی پەنا بە خوا، هاوسەرەکەت جێ و ڕێی باشی پێداوم، ستەمکاران سەرفراز نابن (٢٣) وە ئافرەتەکە ویستی لێی بوو، وە ئەویش ویستی هەبوو بەڵام نیشانەی بینی لە پەروەردگارییەوە، بەو شێوەیە بۆئەوەی خراپە و داوێنپیسی لێ دوورخەینەوە، ئەو لە بەندە دڵسۆزەکانمانە (٢٤) وە گەشتنە دەرگاکە و ئافرەتەکە کراسەکەی یوسفی لە دواوە دڕاند، وە مێردەکەیان بینی لای دەرگاکە، ژنەکە وتی سزای ئەوە چییە کە خراپەی بە خێزانەکەت ئەوێت جگە لە سجنکردن یان سزایەکی بەئێش (٢٥) یوسف وتی ئەو داوای لێکردم، وە شایەتێك لە کەسوکاری ئافرەتەکە وتی گەر کراسەکەی لە پێشەوە دڕابێت ئەوا ئافرەتەکە ڕاستئەکات وە ئەو لە درۆزنەکانە (٢٦) وە گەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕابێت ئەوا ئافرەتەکە درۆیکرد و ئەو لە ڕاستگۆکانە (٢٧) جا کاتێك کراسەکەی بینی لە دواوە دڕاوە وتی ئەوە لە فێڵی ئێوەی ژنانە، بەڕاستی فێڵتان گەورەیە (٢٨) یوسف لەم باسە بێدەنگ بە، وە تۆش ئافرەت تۆبە بکە لە تاوانەکەت، تۆ لە

تاوانباران بوویت (٢٩) وە ئافرەتانێك لە نـاو شـار وتیـان ژنەكـەی عـەزیز داوای كاری خراپی لە گەنجەكەی ماڵیان كردووە، خۆشەویستییەكەی چووەتە پەردەی دڵییەوە، ئێمە بەڕاستی لە گومڕاییەكی ڕووندا ئـەیبینین (٣٠) جـا كاتێك بە قسەكانیانی زانی ناردی بە شوێنیاندا و جێ و خوانی بۆ دانان، وە چەقۆیەكی دایە هەریەكەیان وە وتی دەی یوسف دەرچۆ بۆ لایان، جـا كـاتێ بینییان زۆر بە گەورەیان بینی و دەستیان بڕی، وە وتیان پـەنا بـەخوا ئەمـە مرۆڤ نییە ئەمە تەنها مەلائیكەتێكی بەڕێزە (٣١) وتـی ئائەمەیـە لۆمـەم ئەكەن تیایا، وە من داوام لێكرد و ئەو خۆی پاراست، وە گەر ئـەوە نـەكات كە فەرمانی پێئەكەم سجن ئەكرێت و ڕسوا ئەكرێت (٣٢) وتی خوایە سـجن خۆشترە بۆم لەوەی بانگم ئەكەن بـۆی، وە گـەر فێڵیـانم لـێ دوورنەخەیتـەوە مەیلم بەلایاندا ئەچێت و لە نەفامەكان ئەبم (٣٣) جا پەروەردگاری وەڵامـی دایەوە و فێڵەكەیانی لێ دوورخستەوە ئەو زۆر بیسەر و زانایـە (٣٤) پاشـان وایان بۆ دەركەوت دوای ئەوەی نیشانەكانیان بینی سجنی بكەن تا كـاتێكی نادیار (٣٥) ﴾.

- گەر دیقەت بدەین قورئانی پیرۆز بەكورتی واتای چـیرۆكەكە ئـەدات و وردەكاری پووچ و بێ نرخ باس ناكات، بۆ نموونە: ئافرەتەكە چۆن خۆی بۆ پیاوەكە حازر كردبوو، چ جلێكی لەبـەرا بـوو، بـە چ شـێوە و خـۆ

ناسککردنەوەیەکەوە قسەی ئەکرد. بەڵکو سەرنج ئەخاتە سەر بابەتە سەرەکییەکە. وە وەسفی داوێنپاکی و باسی سەرخستنی عەبدە چاك و پاکەکان ئەکات وەك لەوەی فێرت بکات چۆن داوێنپیسی بکەیت.

+ ﴿ سُورَةٌ أَنزَلۡنَٰهَا وَفَرَضۡنَٰهَا وَأَنزَلۡنَا فِيهَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لَّعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ (١)
ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢) ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٣) وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ (٤) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٥) (النور) ئەمە سورەتێکە دامانبەزاندووە و پێویستمان کردووە، وە تیایا ئایەتی ڕوونمان دابەزاندووە بەڵکو بیربکەنەوە (١) داوێنپیسی مێ و نێر هەریەکەیان جەلد بکەن سەد قامچی، وە لە دینی خوادا بەزەییتان پیایانا نەیەتەوە، گەر ئیمانتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، وە با سزاکەیان کۆمەڵێك لە ئیمانداران ببینێت (٢) داوێنپیسی نێر مارە ناکات ئیللا ئافرەتی داوێنپیس یان موشریك، وە داوێنپیسی مێ مارەی ناکات ئیللا داوێنپیس یان موشریکی نێر، وە ئەوە حەرامکراوە لە ئیمانداران (٣) وە ئەوانەی داوێنپاکەکان تۆمەتبار ئەکەن بە

داوێنپیسی پاشان چوار شایەت نـاهێنن ئـەوا هەشـتا قامچـییان لێـدەن وە هەرگیز شایەتییان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانەن لـەڕێ دەرچـووەکان (٤) جگـە لەوانەی تۆبە ئەکەن دوای ئەوە وە چاکسازی ئەکەن، ئـەوا خـوا لێبـووردە و بەرەحمە (٥) ﴾.

- ئەم ئایەتە پیرۆزانە بە کورتی بـاس لـە حـوکمی داوێنپـیس ئەکـەن، بێئەوەی وێنەی داوێنپیسییەکە بێننە بەر چاو و خەیاڵی پێـوە بگـرن. جیاواز لە کتێب کـە باسـی چـۆنییەتی داوێنپیسـییەکە ئـەکات کـە ئافرەتەکە چۆن بووە و پیاوەکان چـییان لـێ کـردووە. وە جـاری واش هەیە تاوانبارەکە لە چیرۆکەکەدا بەبێ سزا بۆیدەرچووە.

+ ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا (١٦)
فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا
(١٧) قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا (١٨) قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠
رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا (١٩) قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ
يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا (٢٠) قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ
وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا (٢١) فَحَمَلَتۡهُ
فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا (٢٢) فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ
يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا (٢٣) فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا

تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا (٢٤) وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ
عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا (٢٥) فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ
أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا (٢٦) فَأَتَتۡ
بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا (٢٧) يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا
كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا (٢٨) فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ
نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا (٢٩) قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ
وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا (٣١) وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا (٣٢)
وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا (٣٣) ذَٰلِكَ عِيسَى
ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ (٣٤) مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ
سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (٣٥) وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي
وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ (٣٦) (مريم) وه لـه کتێبـدا باسـی
مەریەم بکە کاتێك لە کەسوکاری دوورکەوتەوە بۆ عیبادەت لای ڕۆژهـەڵاتی
بیت المقدس (١٦) جا لەویٚ پەردەی هەڵواسی تا نەیبینن، وە روحی خۆمـان
بۆ نارد و خۆی خستە شێوەی مرۆڤێکی تەواو (١٧) مەریەم وتـی پـەنا بـە
خوا ئەگرم لە تـۆ گـەر لـە خـوا ئەترسـیت دوورکـەوەرەوە (١٨) وتـی مـن
نێردراوی پەروەردگارتم تا منداڵێکی پاکت پیٚ ببەخشم (١٩) وتی چۆن منداڵم

ئەبێت و هیچ مرۆڤێك نـەهاتووە بەلامـدا و داوێنپیسـیش نـیم (٢٠) وتـی ئاوها پەروەردگارت فەرموویەتی ئەوە لەسەر من ئاسانە، وە تا بیکـەین بـە نیشانەیەك بۆ خەڵك و ڕەحمەتێك لە ئێمەوە، وە ئەوە شتێکە بڕیاری لەسـەر دراوە (٢١) جا سکی هـەڵگرت و ڕۆشـت دوورکەوتـەوە بـۆ جێیـەکی دوور (٢٢) جا ژان گرتی و بردی بەرەو دار خورماکە، وتی بریا بەر لەمە بمردمایە و لەبیرکراو بوومایە (٢٣) جا عیسا لە ژێریەوە بانگیکرد کە خەفەت مەخۆ پەروەردگارت کانیاوێکی دەرکردووە لەژێرتەوە (٢٤) وە قەدی دارخورماکـە ڕابوەشـێنە خورمـای تـەڕت بـۆ بەرئەبێتـەوە (٢٥) جـا بخـۆ و بخـۆرەوە و چاوڕۆشنبە پێی، جا گەر بەشەرێکت بینی بڵێ من نـەزرم بـۆ خـوا کـردووە بەڕۆژووم لە قسەکردن جا قسە لەگەڵ هیچ ئینسانێك ناکەم (٢٦) جا بەوەوە هات بۆ ناو قەومەکەی، وتیان ئەی مەریەم کارێکی گەورەت کـردووە (٢٧) ئەی خوشکی هارون باوکت پیاوێکی خراپ نـەبوو وە دایکیشـت داوێنپـیس نەبوو (٢٨) جا ئاماژەی بۆ مناڵەکە کرد، وتیـان چـۆن ئێمـە قسـە لەگـەڵ مناڵـە سـاوایەك بکـەین (٢٩) مناڵەکـە وتـی مـن عەبـدی الله م کتـێبی داومەتێ و کردوومی بە پێغەمبـەر (٣٠) وە موبـارەکی کـردووم لـە هـەر جێیەك بم و فەرمانی پێکردووم بە نوێژ و زەکات تا زیندووبم (٣١) وە باشبم لەگەڵ دایکم وە نەیکردووم بـە لوتبـەرز و سەرپێچـیکەری دایکـم (٣٢) وە

سەلامی خوا لەسەر منە ئەو ڕۆژەی لەدایك بووم و ئەو ڕۆژەی ئەمرم و ئـەو
ڕۆژەی زیندووئەبمـەوە (٣٣) ئـەوە عیسـای کـوڕی مەریەمـە قسـەی حـەق
دەربارەی کە تیایا ڕاجیاییان هەیە (٣٤) خوا منـاڵ بـۆ خـۆی بڕیارنـادات،
پاکی بۆ ئەو، گەر بڕیاری شتێك بدات ئەوا پێی ئەڵێت ببـە و ئـەبێت (٣٥)
وە الله پەروەردگاری من و ئێوەیە جا بیپەرستن، ئـەوە ڕێگـای ڕاسـتە (٣٦)
.

+ ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا (٤١) إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ
لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا (٤٢) يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ
جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا (٤٣) يَٰٓأَبَتِ لَا
تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا (٤٤) يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن
يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا (٤٥) قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ
عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا (٤٦) قَالَ سَلَٰمٌ
عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا (٤٧) وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا (٤٨) فَلَمَّا
ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا
نَبِيّٗا (٤٩) وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا (٥٠)
وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا (٥١)

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا (٥٢) وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا (٥٣) وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا (٥٤) وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا (٥٥) وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا (٥٦) وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا (٥٧) أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا (٥٨) فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا (٥٩) إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا (٦٠) جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا (٦١) لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا (٦٢) تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا (٦٣) (مريم) وه له قورئاندا باسی ئیبراهیم بکه، ئەو بەڕاستی ڕاستگۆ و پێغەمبەر بوو (٤١) کاتێك بە باوکی وت ئەی باوکە بۆ شتێك ئەپەرستیت نابیستیٚ و نابینیٚ و هیچ بەکەڵکت نایەت (٤٢) ئەی باوکە من لە زانستم بۆ هاتووە کە بۆ تۆ نەهاتووە، جا شوێنم بکەوە هیدایەتت ئەدەم بۆ ڕێیەکی ڕاست (٤٣) ئەی باوکە شەیتان مەپەرستە،

شەیتان سەرپێچی خوای کرد (٤٤) ئەی باوکە من ئەترسم کە سزایەك لە خوای بەرەحمەوە بەرتبکەوێت و ئەوسا ئەبیت بە خۆشەویستی شەیتان (٤٥) وتی ئایا تۆ ڕوو وەرئەگێڕی لە خواکانم ئەی ئیبراهیم، گەر واز نەهێنی بەردبارانت ئەکەم، وە ماوەیەکی زۆر لێم دووركەوەرەوە (٤٦) وتی سەلامەت ئەبیت لە منەوە، وە داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم لە پەروەردگارم، خوا زۆر چاکەکارە لەگەڵم (٤٧) وە لێتان و لەوانەی هاواریان ئەکەن جگە لە خوا دوورئەکەومەوە، وە لە پەروەردگارم ئەپاڕێمەوە، وە بێئومێد نابم لە پاڕانەوە لە پەروەردگارم (٤٨) جا کاتێ لێیان و لەوانەی هاواریان ئەکرد جگە لە خوا دووركەوتەوە ئیسحاق و یەعقوبمان پێبەخشی، وە هەموویانمان کرد بە پێغەمبەر (٤٩) وە لە ڕەحمەتی خۆمان پێبەخشین، وە زمانی ڕاستگۆی بەرزمان پێبەخشین (٥٠) وە لە کتێبدا باسی موسا بکە ئەو بەڕاستی دڵسۆز بوو وە نێردراو و پێغەمبەر بووە (٥١) وە لەلای شاخی طورەوە بانگمانکرد وە نزیکمانکردەوە بە قسەکردن (٥٢) وە بە ڕەحمەتی خۆمان هاروونی برایمان بۆی کرد بە پێغەمبەر (٥٣) وە لە کتێبدا باسی ئیسماعیل بکە، ئەو بەڕاستی خاوەن بەڵێنی ڕاست بوو، وە نێردراو و پێغەمبەر بوو (٥٤) وە فەرمانی بە خێزانەکەی ئەکرد نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە لەلای پەروەردگاری جێی ڕەزامەندی بوو (٥٥) وە لە کتێبدا باسی ئیدریس بکە،

ئەو بەڕاستی زۆر ڕاستگۆ و پێغەمبەر بوو (٥٦) وە بەرزمانکردەوە بۆ جێیەکی بەرز (٥٧) ئائەوانە ئەوانەن خوا نیعمەتی بەسەردا داون لە پێغەمبەران لە نەوەی ئادەم وە لەوانەی هەڵمانگرتن لەگەڵ نوحدا، وە لە نەوەی ئیبراهیم و ئیسرائیل وە لەوانەی هیدایەتماندان و هەڵمانبژاردوون، کاتێك ئایەتەکانی ڕەحمانیان بەسەردا ئەخوێنرێتەوە ئەکەون بە سوجدەدا و ئەگرین (٥٨) جا لەدوایان کەسانێك هاتن نوێژیان ونکرد و شوێن ئارەزوو کەوتن، جا پاش ماوەیەك زەرەر ئەکەن (٥٩) ئیللا ئەوەی تۆبەی کرد وە ئیمانی هێنا وە چاکەی کرد، جا ئەوانە ئەچنە بەهەشتەوە وە هیچ زوڵمیان لێناکرێت (٦٠) بەهەشتی نەبڕاوە کە ڕەحمان وەعدی داوە و نەبینراوە، وەعدی ئەو هەر دێتە دی (٦١) هیچ قسەیەکی پووچ نابیستن تیایا تەنها سەلامکردنە، وە تیایا رزقیان هەیە هەموو بەیانیان و ئێوارانێك (٦٢) ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە بەندەکانمان ئەکەین بە میراتگری هەر کەس تەقواکار بێت (٦٣) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ (٥١) إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ (٥٢) قَالُواْ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ (٥٣) قَالَ لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ (٥٤) قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ (٥٥) قَالَ بَل رَّبُّكُمۡ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ

وَٱلۡأَرۡضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ (٥٦) وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ
أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ (٥٧) فَجَعَلَهُمۡ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمۡ لَعَلَّهُمۡ
إِلَيۡهِ يَرۡجِعُونَ (٥٨) قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥٩)
قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتًى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ (٦٠) قَالُواْ فَأۡتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ
أَعۡيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡهَدُونَ (٦١) قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ
(٦٢) قَالَ بَلۡ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمۡ هَٰذَا فَسۡـَٔلُوهُمۡ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ (٦٣)
فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ (٦٤) ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ
رُءُوسِهِمۡ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ (٦٥) قَالَ أَفَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَنفَعُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يَضُرُّكُمۡ (٦٦) أُفّٖ لَّكُمۡ وَلِمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ
أَفَلَا تَعۡقِلُونَ (٦٧) قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمۡ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ (٦٨)
قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ (٦٩) وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ
ٱلۡأَخۡسَرِينَ (٧٠) وَنَجَّيۡنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا لِلۡعَٰلَمِينَ
(٧١) وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ نَافِلَةٗۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا صَٰلِحِينَ (٧٢)
وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ
وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ (٧٣) (الأنبياء) وە لە پێشدا ڕێگای
ڕاستمان بە ئیبراهیم بەخشی وە زانا بووین پێی (٥١) كاتێك بە باوكی وت
ئەم بتانە چین ئێوە بەدیاریانەوە دانیشتوون (٥٢) وتیان ئێمە باوانمان دیوە

ئەیانپەرستن (٥٣) وتی ئێوە و باوانتان لە گومڕاییەکی ئاشکرایا بوون (٥٤) وتیان ئایا بە حەق بۆمان هاتوویت یان گاڵتەمان لەگەڵ ئەکەیت (٥٥) وتی بەڵکو پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە کە دروستیکردوون، وە من لەسەر ئەوە شایەتم (٥٦) وە سوێند بە الله بتەکانتان ئەشکێنم دوای ئەوەی جێیان ئەهێڵن (٥٧) جا هەموویانی شکاند گەورەکەیان نەبێت تا بەڵکو بۆلای بگەڕێنەوە (٥٨) وتیان کێ وای لە خواکانمان کردووە بەڕاستی لە ستەمکارانە (٥٩) وتیان گوێمان لە گەنجێك بوو باسی ئەکردن ئیبراهیمی پێ ئەوترێت (٦٠) وتیان دەی بیهێنن لەپێش چاوی خەڵکا تا هەموو بیبینن (٦١) وتیان ئایا تۆ وات لە خواکانمان کردووە ئەی ئیبراهیم (٦٢) وتی بەڵکو ئەم گەورەیەیان وای کردووە جا لێیان بپرسن گەر قسە ئەکەن (٦٣) جا چوونەوە بەخۆیانا و وتیان بەڕاستی ئێوە ستەمکارن (٦٤) پاشان سەریان کزکرد بەدڵنیایی زانیوتە کە ئەمانە قسە ناکەن (٦٥) وتی ئایا جگە لە خوا شتێك ئەپەرستن کە هیچ سوودتان پێ ناگەیەنێ و زەرەریشتان لێ نادات (٦٦) ئۆف بۆتان وە بۆ ئەوانەی کە جگە لە خوا ئەیانپەرستن، ئەرێ بۆ عاقڵ نابن (٦٧) وتیان بیسووتێنن وە خواکانتان سەرخەن گەر تۆڵە ئەسەنن (٦٨) وتمان ئەی ئاگر سارد و سەلامەتی بە لەسەر ئیبراهیم (٦٩) وە نەخشەیان بۆ دانا جا کردمانن بە دۆڕاو (٧٠) وە ئەو و لوطمان ڕزگارکرد بۆ

ئـەو زەوییـەی بەرەکـەتما تێکـردووە بـۆ جیهانیـان (٧١) وە ئیسـحاق و یەعقوبیشمان پێ بەخشی زیاتر لەوەی داوایکرد، وە هەریەکـەمان کـرد بـە پێغەمبەر (٧٢) وە کردمانن بە پێشەوا بە فەرمانی ئێمە هیدایـەت ئـەدەن وە وەحیمان بۆ کردن کاری چاك بکەن وە نوێـژ بکـەن وە زەکـات بـدەن، وە عیبادەتی ئێمەیان ئەکرد (٧٣) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (١٢) وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ (١٣) وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِي وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَاۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًاۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (١٥) يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ (١٦) يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ (١٧) وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (١٨) وَٱقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ (١٩) (لقمان) وە داناییمان بـە لوقمـان بەخشـی

کە سوپاسی خوا بکە، وە ئـەوەی سـوپاس بکـات ئـەوە بـۆ خـۆی سـوپاس ئەکات، وە هەرکەس ناشکور بێت ئـەوا خـوا بـێ پێویسـت و سوپاسـکراوە (١٢) وە کە لوقمان بە کوڕەکەی وت وە ئامۆژگاری ئەکرد ئەی کوڕم شەریك بـۆ خـوا دامـەنێ، بـەدڵنیایی شـیرك سـتەمێکی زۆر گەورەیـە (١٣) وە نەسیحەتی مرۆڤمان کرد بە دایـك و بـاوکی کـە سوپاسـی مـن وە دایـك و باوکت بکە گەڕانەوە بۆ لای منە (١٤) وە گەر کۆششیان کردیت کە هـاوەڵم بۆ دابنێیت کە زانستت نییە بەو شەریکە ئەوا گوێرایـەڵییان مەکـە، وە لـە دنیادا بە چاکە هاوەڵێتییان بکە، وە شوێن ڕێگەی ئەوە بکـەوە کـە بـۆ لای من گەڕاوەتەوە، پاشان گەڕانەوەتان بـۆ لای منـە جـا پێتـان ئـەڵێم بـەوەی ئەتانکرد (١٥) ئەی کوڕم ئەوە گەر پارچە دەنکێك بێت لـە تۆوێـك جـا لـە بەردێکدا بێت یان لە ئاسمانەکاندا یان لە زەوی خوا ئەیهێنێت، بەڕاستی خوا بەبەزەیی و بەئاگایە (١٦) ئەی کوڕم نوێژەکانت بکە وە فـەرمان بـە چـاکە بکە وە ڕێ لە خراپە بگرە وە ئـارام بگـرە لەسـەر ئـەوەی تووشـت ئـەبێت، بەڕاستی ئەوە لە شتە گرنگەکانە (١٧) وە ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵك وە لە زەویـدا بـە لووتبەرزییـەوە مـەڕۆ، بێگومـان خـوا ئەوانـەی خۆشـناوێت خۆهەڵکێش و فەخرکەرن (١٨) وە هێواش بکە لە ڕۆشتنتدا وە نـزم بـە لـە قسەکردنتدا، بێگومان ناخۆشترین دەنگ دەنگی کەرەکانە (١٩) ﴾.

+ ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا
بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا (٣٢) كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ
شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا (٣٣) وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ
يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا (٣٤) وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ
لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا (٣٥) وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ
وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا (٣٦) قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ
وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ
رَجُلٗا (٣٧) لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا (٣٨) وَلَوۡلَآ إِذۡ
دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا
وَوَلَدٗا (٣٩) فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا (٤٠) أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن
تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا (٤١) وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ
فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا
(٤٢) وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا (٤٣)
هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا (٤٤) (الكهف) وه

نموونەی دوو پیاویان بۆ بێنەرەوە دوو باخ ترێمان دابوو بە یەکێکیان وە بە دار خورما دەورمان دابوو وە لە بەینی باخەکاندا ڕوواوی تریش هەبوو (٣٢) هەردوو باخەکە بەرهەمی خۆی دا و هیچ کەموکورتی نەبوو، وه

لەنێوانیشیاندا ئاومان هەڵقوڵاند (٣٣) وە بەرهەمی تریشی هەبوو جا بە هاوەڵەکەی وت و گفتوگۆی ئەکرد من لە تۆ زیاتر سامانم هەیە و نەفەری زۆرتر لە دەورمن (٣٤) وە چووە باخەکەیەوە و ستەمی لە خۆی کرد وتی وانازنم ئەمە هەرگیز لەناوبچێت (٣٥) وە واشنازانم قیامەت بێت وە گەر بشگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم ئەوا لەمە باشترم دەستئەکەوێت (٣٦) هاوەڵەکەی پێی وت و گفتوگۆی کرد ئەوە کافربوویت بەوەی دروستیکردوویت لە خۆڵ پاشان لە دڵۆپە تۆو پاشان کردووتی بە پیاو (٣٧) بەڵام الله خوای منە وە کەس ناکەم بە شەریکی پەروەردگارم (٣٨) وە کاتێك کە هاتیتە باخەکەتەوە بتوتایە ئەمە بە ویستی خوایە هیچ هێزێك نییە ئیللا بەهۆی خواوە، گەر ئەبینیت من سامان و منالّم لە تۆ کەمترە (٣٩) جا بەڵکو پەروەردگارم لە باخەکەت باشترم بداتێ وە بۆ سەر باخەکەت زریانێك لە ئاسمانەوە بنێرێت جا ببێت بە تەختاییەکی خلیسك (٤٠) یان ئاوەکەی کوێر ببێتەوە و نەتوانی دەستت بیگاتێ (٤١) وە بەرهەمەکەی لەناوچوو جا دەستی ئەمدیو دیو ئەکرد لەسەر ئەوەی تیایا سەرفیکردبوو، وە باخەکەش چۆڵ بوو لە ڕووەك و ماڵ، وە ئەیوت بریا کەسم نەکردایە بە شەریکی پەروەردگارم (٤٢) وە هیچ کۆمەڵێك نەبوو سەریخەن لە سزای خوا

وه سەركەوتوو نەبوو (٤٣) لەو جێیەدا سەرخستن هەر بۆ خوای حەقە، ئەو

باشترین پاداشتی هەیە وە باشترین سەرئەنجامیش (٤٤) ﴾.

+ ﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ

دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ (٢٦) وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ

بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ (٢٧) وَقَالَ رَجُلٞ

مُّؤۡمِنٞ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ

جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا

يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ (٢٨)

يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن

جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ

(٢٩) وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ (٣٠)

مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا

لِّلۡعِبَادِ (٣١) وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ (٣٢) يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ

مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ (٣٣) وَلَقَدۡ

جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ

إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ

مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ (٣٤) ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ

كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ

مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ (٣٥) وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ

ٱلۡأَسۡبَٰبَ (٣٦) أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ
وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ
إِلَّا فِي تَبَابٖ (٣٧) وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ
(٣٨) يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ (٣٩)
مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ
وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ (٤٠)
وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ (٤١) تَدۡعُونَنِي
لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡغَفَّٰرِ (٤٢) لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي
ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ (٤٣)
فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ
(٤٤) فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ
(٤٥) ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ
فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ (٤٦) وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ
ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ (٤٧)
قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ (٤٨) وَقَالَ
ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ
(٤٩) قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا

دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ (٥٠) إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ (٥١) يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ (٥٢) (غافر) وە فیرعەون وتی لێمگەڕێن موسا بکوژم وە با هاواری خواکەی بکات، من ئەترسم دینەکەتان بگۆڕێت یان خراپە لە زەوییا دەرخات (٢٦) وە موسا وتی من پەنا ئەگرم بە خوای من و خوای ئێوە لە هەموو لووتبەرزێك ئیمانی بە ڕۆژی لێپرسینەوە نییە (٢٧) وە پیاوێکی ئیماندار لە خەڵکەکەی فیرعەون وتی کە ئیمانی شاردبووەوە ئایا پیاوێك ئەکوژن کە بڵێت خوام الله یە، وە بەڵگەشی بۆتان هێناوە لە پەروەردگارتانەوە، وە گەر درۆزن بێت ئەوا درۆکەی لەسەر خۆیەتی، وە گەر ڕاستگۆش بێت هەندێك لەوەی وەعدتان پێ ئەدات لە سزا تووشتان ئەبێت، خوا هیدایەتی ئەوە نادات کە زیادەڕەو و درۆزنە (٢٨) ئەی قەومەکەم ئەمڕۆ موڵکتان هەیە و دیارن لە زەوییا جا کێ سەرمان ئەخات لە سزای خوا گەر بۆمان بێت، فیرعەون وتی هیچتان نیشان نایەم ئیللا ئەوە نەبێت کە خۆشم ئەیبینم وە بۆ ڕێی ڕاست نەبێت هیدایەتتان نادەم (٢٩) وە ئەو کەسەی ئیمانی هێنابوو وتی ئەی قەومەکەم من لەسەرتان ئەترسم وەك ڕۆژی کۆمەڵەکان (٣٠) وەك داب و نەریتی قەومی نوح وە عاد وە ثەمود وە ئەوانەی دوای ئەوان، وە خوا زوڵمی بۆ عەبدەکان ناوێت (٣١) وە ئەی

قەومەکەم من لـە ڕۆژی بانگکردنەکـە ئەترسـم لەسـەرتان (٣٢) ئـەو ڕۆژە پشتهەڵئەکەن وە لە سزای خوا هیچ پارێزەرێکتان نییـە، وە هەرکـەس خـوا گومڕای بکات ئەوا هیدایەتدەری نییـە (٣٣) وە یوسـفیش پێشـتر بەڵگـەی بۆتان هێنا جا هێشتا لە شکان لەوەی بۆتانی هێنا، هەتا کاتێـك کـە مـرد وتتان ئیتر خـوا لـەدوای ئـەو پێغەمبـەر نانێرێـت، بـەو جـۆرە خـوا ئـەوە گومڕائەکات کە زیادەڕەو و بەگومانە (٣٤) ئەوانەی دەمـەقاڵێ ئەکـەن لـە ئایەتەکانی خوادا بەبێ بەڵگەیەك بۆیـان هاتبێـت، جێـی ڕقێکـی گەورەیـە لەلای خوا وە لەلای ئەوانەی ئیمانیان هەیە، بەو جۆرە خوا مۆر ئـەدات لـە دڵی هەموو لووتبەرزێکی عیناد (٣٥) وە فیرعەون وتی ئەی هامان کۆشکی بەرزم بۆ دروستبکە بەڵکو بگەمە دەرگاکـان (٣٦) دەرگاکـانی ئاسمـان جـا سەیری خواکەی موسا بکەم وە من دڵنیـام کـە درۆزنـە، وە بـەو جـۆرە بـۆ فیرعەون ڕازێنرایەوە کاری خراپی وە ڕێگری کرا لە ڕێی ڕاست، وە نەخشـەی فیرعەون تەنها لە تیاچووندایە (٣٧) وە ئەوەی ئیمـانی هێنـابوو وتـی ئـەی قەومەکەم شوێنم بکەون هیدایەتتان ئـەدەم بـۆ ڕێـی بەهەشـت (٣٨) ئـەی گەلەکەم ئەم ژیانی دنیایە ڕابواردنـە وە بـەدڵنیایی ژیـانی کۆتـایی شـوێنی مانەوەیە (٣٩) هەرکەس خراپەیەك بکات ئەوا تەنها بە هاوشێوەی پاداشـت ئەدرێت، وە هەرکەس چاکە بکات لە نێر و مێ وە ئیمانـدار بێـت ئائەوانـە

ئەچنە بەهەشتەوە بەبێ حساب رزقیان ئەدرێت (٤٠) وە ئەی قەوم چییە من بۆ ڕزگاربوون بانگتان ئەکەم وە ئێـوە بـۆ ئـاگر بـانگم ئەکـەن (٤١) بـانگم ئەکەن تا کوفر بە خوا بکەم وە شەریکی بۆ دابنێم کە زانستم پێی نییـە، وە من بانگتان ئەکەم بۆ لای بالآدەست و لێبـووردە (٤٢) بـێ گومـان ئـەوەی منی بۆ بانگ ئەکەن هیچ وەلآمـی نییـە نـە لـە دنیـا نـە لـە قیامـەت وە گەڕانەوەمان بۆ لای الله یـە وە زیـادەڕەوانن هـاوەڵی ئـاگر (٤٣) جـا بـەم نزیکانە ئەوەی پێتان ئەڵێم بیرتانئەکەوێتەوە، وە کارم ڕادەسـتی الله ئەکـەم، بەدڵنیایی الله بینەرە بە عەبدەکان (٤٤) جا خوا پاراستی لە فێڵی خراپیان، وە ئەشکەنجەی خراپ توشی ئالی فیرعەون بوو (٤٥) ئەخرێنە پێش ئاگر بـە بەیانیان و ئێواران، وە لە قیامەتیشدا ئالی فیرعەون بخەنە تونـدترین سـزاوە (٤٦) وە کە دەمەقاڵێ ئەکەن لە ئاگردا جا لاوازەکان بە خۆبەگەورەزانـەکان ئەڵێن ئێمە شوێنکەوتووتان بووین جا ئایا ئێوە بەشێك لە ئاگرمـان لەسـەر لائەبەن (٤٧) خۆبەگەورەزانەکان وتیان ئێمە هەموومان لە ئاگراین تازە خوا حوکمی کردووە لـە بـەینی عەبـدەکانا (٤٨) وە ئەوانـەی لـە ئـاگردان بـە دەرگاوانەکانی جەهەننەمیان وت بانگی پەروەردگارتان بکەن ڕۆژێك سزامان لەسەر سووك بکات (٤٩) وتیان ئەی پێغەمبەرانتان بەڵگەیان بۆتان نەهێنا، وتیـان بـەڵێ، وتیـان دەی خۆتـان داوا بکـەن، وە داوای کـافران تـەنها لـە

فەوتاندایە (٥٠) ئێمە پێغەمبەرانمان سەرئەخەین وە ئەوانەی ئیمانـدارن لـە ژیانی دنیا وە ڕۆژێك كە شایەتەكان هەڵئەستن (٥١) ئەو ڕۆژە عوزرهێنانەوە سوودی نییە بۆ ستەمكاران، وە دوورن لە ڕەحمەتی خوا وە خـراپترین جێیـان هەیە (٥٢) ﴾.

- ئەمانە نموونەیەکی چیرۆكەكانی قورئانی پـیرۆز بـوون. وە بـۆ هـەموو خاوەن عەقڵێك دیارە کـە لـە نێـوان چـیرۆكەكانی قورئـان و كتێبـدا كامەیان پیرۆزن و كامەشیان قسەی بەتاڵن.

سێیەم/ دژیەكی و ڕەوانیی.

کتێبی جولەکە و گاورەكان:

– ورأى الله جميع ما صنعه فاذا هو حسن جدا (تكوين ١/ ٣١) وە خوا هەموو ئەوەی بینی كە كردبووی جا زۆر چاكیش بوو.

– فندم الرب على أنه صنع الإنسان علـى الأرض وتأسـف في قلبـه (تكـوين ٦/ ٦) جا پەروەردگار پەشیمان بوو لەوەی مرۆڤی لەسەر زەوی دروستكردووە وە خەفەتبار بوو لە دڵیدا.

- کتێب جارێك وا وەسفی خوا ئەکات کە ئیشەکانی هەمووی زۆر باشن و هیچ هەڵە و کەم و کورتییەکییان تیا نییە. بەڵام لە شوێنێکی تردا وامان نیشان ئەیات خوا هەڵە ئەکات و مەرج نییە ئیشەکانی هەمووی باش بن. جا ئایا خوا ئیشەکانی هەمووی زۆر باش و تەواون؟ یان هەندێك ئیشی ئەوەندە خراپن کە خۆی لێیان پەشیمانە؟

— ليس الله إنسانا فيكذب ولا ابن بشر فيندم. أتراه يقول ولا يفعل أم يتكلم ولا ينجز؟ (العدد ٢٣/ ١٩) خوا مرۆڤ نییە تا درۆبکات وە کوڕی مرۆڤ نییە پەشیمان بێت. ئایا بینیوتە بڵێت و جێبەجێ نەکات یان قسە بکات و تەواوی نەکات؟

— فعدل الرب عن الإساءة التي قال إنه ينزلها بشعبه (خروج ٣٢/ ١٤) جا خوا پاشگەزبووەوە لەو خراپەیەی کە وتی دایئەبەزێنێت بەسەر گەلەکەیدا.

- کتێب لە شوێنێك ئەڵێت خوا درۆ ناکات و پەشیمان نییە. وە لە جێیەکی تر ئەڵێت خوا ڕای گۆڕی و پەشیمان بووەوە. جا لە نێوان ئەم دوو دەقەدا کامیان قسەی خوایە و کامیان بوختانە؟ وە گەر هەردووکیان قسەی خوان و ڕاستن، چۆن دژیەکی لەناو قسەکانی خوادا هەیە؟

– لا أنتهك عهدي ولا أغير ما خرج من شفتي (المزامير ٨٩/ ٣٤) پەیمانەکەم ناشکێنم وە ئەوەی لە لێوەکانمەوە دەرچووە نایگۆڕم.

– عن عهد عبدك أعرضت وتاجه في التراب دنست (المزامير ٨٩/ ٣٩) لە پەیمانی بەندەکەت ڕووت وەرگێڕا وە تاجەکەیت لە خۆڵ وەردا.

- کتێب جارێك ئەڵێت خوا پەیمان ناشکێنێت. وە چەند دێڕێك دواتر ئەڵێت خوا پەیمانی شکاند.

– وبنو شمعون: يموئيل ويامين وأوهد وياكين وصوحر وشاول ابن الكنعانية (تكوين ٤٦/ ١٠) وە نەوەکانی شەمعۆن: یاموئیل وە یامین وە ئەوهەد وە یاکین وە صوحەر وە شاول کوڕی ئافرەتە کەنعانییەکە.

– وبنو شمعون: نموئيل ويامين وياريب وزارح وشاول (أخبار الأيام الأولى ٤/ ٢٤) وە نەوەکانی شەمعون: نەموثیل وە یامین وە یاریب وە زارەح وە شاول.

- کتێب باسی مناڵەکانی شەمعون ناوێك ئەکات، جا لە شوێنێکدا شەش مناڵ ئەداتە پاڵی، وە لەجێیەکی تردا پێنج. وە لە هەرجێیەکدا ناوەکان جیان جگە لە دوو ناو کە دووبارەن لە هەردوو جێیەکە. جا ئایا شەمعون چەند مناڵی هەبوو؟ وە ناویان چی بوو؟

– فانهزم الأراميون من وجه إسرائيل، وأهلك داود من الأراميين سبع مئة مركبة وأربعين ألف فارس، وضرب شوباك قائد جيشه، فمات هناك

(صموئيل الثـاني ١٠/ ١٨) جا ئارامییەکان دۆڕان لـە ڕووی ئیسـرائیل، وە داود لە ئارامییەکان حەوت سەد گالیسکە و چل هەزار سواری لـەناوبرد، وە شۆباکی سەرلەشکری لێیدرا و لەوێ کوژرا.

– فانهزم الأراميون من وجه إسرائيل، وأهلك داود مـن الأرامـيين سـبعة آلاف مركبة وأربعين ألف راجل، وقتـل شـوفاك، قائـد الجيش (أخبـار الأيـام الأول ١٩/ ١٨) جـا ئارامییـەکان دۆڕان لـە ڕووی ئیسـرائیل، وە داود لـە ئارامییەکان حـەوت هـەزار گالیسـکە و چـل هـەزار پیـادەی لـەناوبرد، وە شۆفاکی سەرلەشکر کوژرا.

- کتێب ژمارەی ئەو گالیسکانەمان بۆ باس ئەکات کە داود تێکیشکاند لە شەڕێکدا. جا لە جێیـەك ئـەڵێت حـەوت سـەد دانـە بـوو، وە لـە جێیەکی تردا ئەڵێت حەوت هەزار بوو. وە جیاوازی ئەو دوو ژمارەیـە زۆرە و هی ئەوەش نییە بڵێیت بە نزیکەیی باسیکردووە.

– وهـذه أسمـاء أبطـال داود: إشـبعل الحكمـوني، رئـيس الثلاثـة، وهـو عـدينو العصني، قام على ثماني مئة فقتلهم بمرة واحدة (صموئيل الثاني ٢٣/ ٨) وە ئەمە ناوی پاڵەوانەکانی داودە: ئیشبەعلی حەکەمۆنی سـەرۆکی سـیانەکە، کە عەدینۆی عەصەنییە، هەستا دژی هەشت سـەد کـەس و بـە یـەك جـار کوشتنی.

– وهذه قائمة الأبطال الذين كانوا لداود: إشبعل بن حكموني، رئيس الثلاثين. وقد أشرع رمحه على ثلاث مئة فقتلهم بمرة واحدة (أخبار الأيام الأول ١١/ ١١) وە ئەمە ناوی پاڵەوانەکانی داودن: ئیشبەعل کوڕی حەکەمۆنی، سەرۆکی سییەکە. جا بە ڕمەکەی سێ سەد کەسی کوشت بە یەکجار.

- کتێب باسی کەسێك ئەکات کە پاڵەوان و ئازا بووە. بەڵام دڵنیا نییە چەند کەسی کوشتووە. ئایا هەشت سەد کەس بووە؟ یان سێ سەد؟

– ورحل بنو إسرائيل من آبار بني يعقان إلى موسير. هناك مات هارون ودفن هناك، فتولى الكهنوت مكانه ألعازار ابنه (التثنية ١٠/ ٦) وە نەوەی ئیسرائیل لە بیرەکانی بەنی یەعقان ڕۆشتن بۆ موسیر. لەوێ هاروون مرد وە لەوێ نێژرا، جا ئەلعازاری کوڕی لەجێی بوو بە کاهین.

– فصنع موسى كما أمره الرب، فصعدوا جبل هور على مرأى الجماعة كلها (٢٧) ونزع موسى ثياب هارون وألبسها ألعازار ابنه. ومات هارون هناك في رأس الجبل، ونزل موسى وألعازار من الجبل (٢٨) (العدد / ٢٠) جا موسا ئەوەی کرد کە خوا فەرمانی پێکردبوو، جا چوونە سەر شاخی هور لەبەر چاوی هەموو کۆمەڵەکە (٢٧) وە موسا جلەکانی هارونی داکەند و کردییە بەری ئەلعازاری کوڕی. وە هارون لەوێ مرد لە سەری شاخەکە، وە موسا و ئەلعازار لە شاخەکە دابەزین (٢٨).

- کتێب باس لەو جێیە ئەکات کە هارون تیایا مرد. بەڵام لە دوو دەقـدا ئاماژە بە دوو شوێنی جیاواز ئەکات. جارێك ئەڵێت لە موسـیر مـرد، جارێك ئەڵێت لەسەر شاخی هـور. وە ئـەو دوو شـوێنەش جیـاوازن و هەمان جێ نین.




(وێنەی شاخی هور و موسیر[٢١])

— وكان أحزيا ابن اثنتين وعشرين سنة حين ملك. وملك سنة واحدة في أورشليم. واسم أمه عتليا، بنت عمري، ملك إسرائيل (الملوك الثاني ٨/ ٢٦) وه ئەحزيا بيست و دوو ساڵ بوو كاتێك بوو بە پاشا. وه يەك ساڵ پاشای ئۆرشەليم بوو. وه ناوی دايكی عەتەلیایە كچی عیمری پاشای ئیسرائیل.

— وكان أحزيا ابن اثنتين وأربعين سنة حين ملك، وملك سنة واحدة في أورشليم، واسم أمه عتليا، بنت عمري (أخبار الأيام الثاني ٢٢/ ٢) وه ئەحەزيا چل و دوو ساڵ بوو كە بوو بە پاشا، وه يەك ساڵ پاشای ئۆرشەليم بوو، وه ناوی دايكی عەتەلیایە كچی عیمری.

- ئەحزيا ناوێك بوو بە پاشای ئورشەليم، بەڵام كتێب دڵنيا نييە لە تەمەنی چەند ساڵێدا بوو بە پاشا. ئايا لە بيستەكانيدا بوو يان لە چل ساڵێدا؟

— فأتى جاد إلى داود وأخبره وقال له: ((أتأتي عليك سبع سني مجاعة في أرضك، أم تهرب أمام أعدائك ثلاثة أشهر وهم في إثرك، أم يكون ثلاثة أيام طاعون في أرضك؟ ففكر الآن وأنظر فيما أجيب به مرسلي من الكلام )) (صموئيل الثاني ٢٤/ ١٣) جا جاد هاتە لای داود وه پێی وت: (ئايا حەوت ساڵ برسێتيت بەسەردا بێت لە زەوييەكەتدا، يان ڕائەكەيت لەبەردەم دوژمنەكانت سێ مانگ و ئەوانيش بەدواتەوەن، يان سێ ڕۆژ تاعون ئەبێت

لە زەوییەکەتدا؟ جا ئێستا بیربکەرەوە و بڕوانە چی وەڵامی خوا بدەمەوە کە منی ناردووە).

– فأتى جاد إلى داود وأخبره: ((كذا قال الرب: تخير (١١) إما ثلاث سنوات مجاعة، وإما ثلاثة أشهر تهرب فيها أمام أعدائك وسيف أعدائك يدركك، وإما ثلاثة أيام يكون فيها سيف الرب وطاعون في الأرض، وملاك الرب يدمر في جميع أراضي إسرائيل. فانظر الآن فيما أجيب به مرسلي من الكلام)) (١٢) (أخبار الأيام الأول / ٢١) جا جاد هاتە لای داود و پێی وت: (خوا ئاوای وت: هەڵبژێرە (١١) یان سێ ساڵ برسێتی، وە یان سێ مانگ ڕائەکەیت تیایا لەبەردەم دوژمنەکانت و شمشێری دوژمنەکانت ئەتگاتێ، وە یان سێ ڕۆژ تیایا شمشێری خوا و تاعونی تیا ئەبێت لە زەویدا، وە فریشتەی خوا لە هەموو زەوی ئیسرائیلدا وێرانکاری ئەکات. جا ئێستە سەیرکە چی وەڵامی خوا بدەمەوە کە منی ناردووە (١٢).

● بەگوێرەی دەقەکانی کتێب خوا سێ بژاردە ئەداتە داود. بەڵام بژاردەی یەکەمی بیرچووەتەوە چی بووە. ئایا حەوت ساڵ برسێتی بوو؟ یان سێ ساڵ؟

– وأخذ منه داود ألفا وسبع مئة فارس وعشرين ألف راجل، وعرقب داود خيل جميع المركبات، وأبقى منها مئة مركبة (صموئيل الثاني ٨/ ٤) وە داود

هەزار و حەوت سەد سوار و بیست هــەزار پیــادەی بــەدیل گــرت، جـا داود جومگە پێی ئەسپی هەموو گالیســکەکانی بڕییــەوە، وە ســەد گالیســکەی لێیان هێشتەوە.

– وأخذ منه داوود ألف مركبة وسبعة آلاف فارس وعشرين ألف راجل، وعرقب داود خيل جميع المركبات، وأبقى منها مئة مركبـة (أخبـار الأيـام الأول ١٨/ ٤) وە داود هەزار گالیسکە و حەوت هەزار سوار و بیست هەزار پیادەی لــێ گرت، وە داود جومگە پێی ئەسپی هەموو گالیسکەکانی بڕییــەوە، وە ســەد گالیسکەی لێیان هێشتەوە.

- کتێب باسی ژمارەی ئەو سوارانە ئەکات کە داود بە دیل گرتنی. بەڵام ئایا حەوت سەد بوون یان حەوت هەزار؟

– ووصلوا إلى ضيعة اسمها جتسـمانية، فقـال لتلاميـذه: ((أقعـدوا هنـا بينمـا أصلي)) (٣٢) .. وذهبوا بيسوع إلى عظيم الكهنة، فاجتمع عظماء الكهنة والشيوخ والكتبة كلهم (٥٣) (مـرقس / ١٤) وە گەشتنە جێیەك پێی دەوترا گەتسیمانی، جا بە تەلەبەکانی وت: (لێرە دانیشن تا من نوێژ ئەکەم) (٣٢) .. وە یەسوعیان برد بۆ لای گــەورەی کاهینــەکان، جـا کاهینــە گــەورەکان کۆبوونەوە وە پیرەکان وە نوسەرەکانی تەورات هەموویان (٥٣).

– ثم خرج فذهب على عادته إلى جبل الزيتون، وتبعه تلاميذه (٣٩) .. فقبضوا عليه وساقوه فدخلوا به دار عظيم الكهنة، وكان بطرس يتبع عن بعد (٥٤) (لوقا / ٢٢) پاشان دەرچوو وە چووە سەر شاخی زەیتوون وەك جارانی، وە تەلەبەکانی شوێنی کەوتن (٣٩) .. جا دەستگیریان کرد و بردیان و کردیانە ماڵی گەورەی کاهینەکان، وە پەترۆسیش لە دوورەوە دوایان کەوت (٥٤).

- پەیمانی نویێ لە دوو جێدا باسی ئەوە ئەکات مەسیح دەستگیرکرا. بەڵام جارێك ئەڵێت لە جێیەك گیرا کە ناوی گەتسیمانییە. وە جارێك ئەڵێت شوێنەکە شاخی زەیتوون بوو.

– لو كنت أشهد أنا لنفسي لما صحت شهادتي (٣١) هناك آخر يشهد لي وأنا أعلم أن الشهادة التي يشهدها لي صادقة (٣٢) (يوحنا / ٥) گەر من شایەتی بۆ خۆم بدەم شایەتییەکەم دروست نییە (٣١) یەکێکی تر هەیە شایەتیم بۆ ئەدات وە من ئەزانم ئەو شایەتییەی کە بۆم ئەدات ڕاستە (٣٢).

– أجابهم يسوع: إني، وإن شهدت لنفسي فشهادتي تصح فأنا أعلم من أين أتيت وإلى أين أذهب. أما أنتم فلا تعلمون من أين أتيت ولا إلى أين أذهب (يوحنا ٨/ ١٤) یەسوع وەڵامی دانەوە: من، گەر شایەتیش بۆ خۆم

بدەم ئەوا شایەتییەکەم دروستە چونکە ئەزانم لـەکوێوە هـاتووم وە بـۆ کـوێ ئەچم. ئەمما ئێوە نازانن لەکوێوە هاتووم و بۆ کوێ ئەچم.

- کتێب لە شوێنێکدا وا لەسەر زمانی مەسیحەوە ئەگێڕێتەوە کـە گـەر خۆی شایەتی بۆ خۆی بدات شایەتییەکەی بەتاڵە و قبوڵ نییە، بـەڵکو غەیری خۆی شایەتی بۆ ئەدات. وە لە جێیەکی تردا وا ئەگێڕێتەوە کە مەسیح خۆی شـایەتی بـۆ خـۆی ئـەدات و شایەتییەکەشـی حەقـە و وەرئەگیرێت و بەڵگەیە بۆی.

– فألقى الفضة عند المقدس وانصرف، ثم ذهب فشنق نفسه (متى ٢٧/ ٥) جـا زیوەکەی فڕێدا لەلای پەرستگاکە و ڕۆشت، پاشان چوو خۆی هەڵواسی.

– وقد تملك حقلا بالأجرة الحرام فوقع علـى رأسـه منكسـا وانشـق مـن وسـطه، واندلقت أمعاؤه كلها (أعمال الرسـل ١/ ١٨) وە بـاخێکی دەسـتکەوت بـە کرێی حەرام جا بەدەمدا کەوت بە سەر کزی وە لە ناوەڕاستییەوە لەت بـوو، وە هەموو هەناوی هاتە دەرەوە.

- کتێب باسی چۆنییەتی مردنی یەهوزا ئـەکات. بـەڵام جارێـك ئـەڵێت بەپەت خۆی هەڵواسی و خۆی خـۆی کوشـت. وە لـە شـوێنێکی تـردا ئەڵێت لە ناوەڕاستەوە لەت بـوو و بـە قـەدەری خـوا مـرد، نـەك بـە خۆهەڵواسین. جا ئایا یەهوزا چۆن مرد؟

– وكان اللصان المصلوبان معه هما أيضا يعيرانه مثل ذلك (متى ٢٧/ ٤٤) وە دوو دزە لەخاچدراوەکەی لەگەڵیا بوون ئەوانیش بەهەمان شێوە تانەیان لێ ئەدا.

– وأخذ أحد المجرمين المعلقين على الصليب يشتمه فيقول: (( ألست المسيح؟ فخلص نفسك وخلصنا! )) (٣٩) فانتهره الآخر قال: ((أوما تخاف الله وأنت تعاني العقاب نفسه! (٤٠) (لوقا / ٢٣) وە یەکێك لە دوو تاوانبارە هەڵواسراوەکە جنێوی پێدا و ئەیوت: (ئایا تۆ مەسیح نیت؟ دەی خۆت و ئێمەش ڕزگار بکە!) (٣٩) جا ئەوی تر چووەوە بەگژیا وتی: (ئەوە لە خوا ناترسیت وە تۆ هەمان سزای ئەو ئەچێژیت! (٤٠).

- کتێب باسی ئەوە ئەکات کاتێك مەسیحەکەیان بەسەر خاچەوە بوو، دوو کەسی تریش لەگەڵیا بەخاچەوە بوون. بەڵام جارێك ئەڵێت هەردووکیان دژی مەسیح بوون و گاڵتەیان پێئەکرد. جارێکیش ئەڵێت یەکێکیان لەسەری ئەهاتە جواب و گاڵتەی نەئەکرد.

– ونحو الساعة الثالثة صرخ يسوع صرخة شديدة قال: ((إيلي إيلي لما شبقتاني؟ ))أي: ((إلهي، إلهي، لماذا تركتني؟ )) (٤٦) .. فقال سائر الحاضرين: ((دعنا ننظر هل يأتي إيليا فيخلصه! )) (٤٩) وصرخ أيضا يسوع صرخة شديدة، ولفظ الروح (٥٠) (متى / ٢٧) وە نزیك کاتژمێر سێ یەسوع هاوارێکی

توندی کرد وتی: (ئیّلای ئیّلای لەما شەبەقتانی؟) واتە: (خـوای مـن خـوای من بۆچی وازت لیّهیّنام؟) (٤٦) .. جا هەموو ئامادەبووەکـان وتیـان: (بـا سـەیر بکـەین بـزانین ئیلیـا دیّـت و ڕزگـاری بکـات) (٤٩) وە یەسـوعیش هاوارێکی بەرزی کرد، وە گیانی سپارد (٥٠).

– وكانت الساعة نحو الظهر، فخيم الظلام على الأرض كلها حتى الثالثـة (٤٤) .. فصاح يسوع بأعلى صوته قال: (( يا أبت، في يديك أجعل روحي! (( قـال هذا ولفظ الروح (٤٦) (لوقا / ٢٣) وە نزیك کاتژمێر دوانـزە تـاریکی سـەر هەموو زەوی گرت هەتا کاتژمێر سیّ (٤٤) .. جا یەسوع بە هەموو دەنگی هاواری کرد وتی: (ئەی باوکە، ڕۆحم ئەخەمە دەسـتەکانتەوە) ئـەوەی وت و گیانی سپارد (٤٦).

- کتێب کۆتا قسەی مەسیحەکەیانمان بۆ ئەگێڕێتەوە لەسەر خاچەکە کـە ئیتر دوای ئەوە ڕۆحی دەرچوو. بەڵام جارێك ئەڵێت کۆتا حاڵی نـاڕازی بوو بەو حاڵەی و، بە سەرسوڕمان و نارەزاییەوە هاواری خوای کرد کە بۆ جێیهێشتووە بەو جۆرە بەسـەر خاچـەوە. وە لـە جێیـەکی تـردا وا نیشانی ئەدات کێشەی نەبووە لەگەڵ ئەو حاڵەیدا بەسـەر خاچـەکەوە، وە خوا جێینەهێشتووە، وە بە یەقین و ئارامییەوە ڕۆحی خۆی ئەداتـە دەست خوا. جا ئایا کامیان دوا قسـەی لەخاچـدراوەکەیە؟ ئایـا ڕازی

بووە بەو حاڵەی یان نا؟ ئایا خوا لەخاچدراوەکەی تەرك کردبوو یان لەگەڵیا بوو؟ ئایا لەخاچدراوەکە ئاگاداری ڕووداوەکان بوو وە ڕازی بوو پێیان؟ یان شتەکان بێ ویست و زانینی ئەو بوون؟

— ثم أخذ ابنا هارون ناداب وأبيهو كل واحد منهما مجمرتـه، فجعـل فيهـا نـارا ووضع عليها بخورا، وقربا أمام الرب نـارا غـير مقدسـة لم يأمرهمـا بهـا (١) فخرجت نار من أمام الرب فأكلتهما وماتا أمام الـرب (٢) (اللاويـين / ١٠) پاشان دوو کوڕەکەی هارون ناداب و ئەبیهۆ هەریەکە بخوردانەکـەی بـرد، وە ئاگری تیاکردەوە و بخوری لەسەر دانا، وە لەپێش خوا ئاگریان پێشکەش کرد کە پیرۆز نەبوو وە فەرمانی پێیان نەکردبوو (١) جا ئاگرێك دەرچوو لەلایـەن یەزدانەوە و هەردووکیانی هەڵلووشی وە لەبەردەم خوادا مردن (٢).

— إذا قام في وسطكم نبـي أو حالم أحلام فعرض عليكم آيـة أو خارقـة (١) ولـو تمت الآية أو الخارقة الـتي كلمـك عنهـا وقـال لـك: لنسـر وراء آلهـة أخـرى لم تعرفها فنعبدها (٢) فلا تسمع كلام هذا النبـي أو حالم الأحـلام، فـإن الـرب إلهكم ممتحنكم ليعلم هل أنتم تحبون الرب إلهكـم مـن كـل قلـوبكم ونفوسـكم (٣) (التثنيـة / ١٣) گەر لەناوتانا پێغەمبەرێك هات یـان خـەونبینێك جـا نیشانەیەك یان موعجیزەیەکی خسـتە ڕووتـان (١) ئەگەرچـی نیشـانە یـان موعجیزەکەش جێبەجێ ببێت کە پێـی وتـن و وتـی: بـا شـوێن خـوای تـر

بکەوین نەتناسیبێت جا بیپەرستین (٢) جا گوێ لە قسـەی ئـەم پێغەمبـەرە یان خەونبینە مەگرە، چونکە یەزدانی خواتان تاقیتانئەکاتەوە تا بزانێت ئایا ئێوە خوای خۆتان خۆشئەوێت لە هەموو دڵ و نەفستانەوە (٣).

– وكان الرب قد أشهد على إسرائيل ويهوذا، على ألسنة جميـع الأنبيـاء وكـل راء، قائلا: ((توبوا عن طرقكم السيئة، واحفظـوا وصـاياي وفرائضـي، علـى حسب كل الشريعة التي أوصيت بهـا آبـاءكم والـتي بلغـتكم إياهـا عـن يـد عـبيدي الأنبياء)) (١٣) فلم يسمعوا وصلبوا رقابهم مثل رقاب آبائهم الذين لم يؤمنـوا بـالرب إلههـم (١٤) (الملـوك الثـاني / ١٧) وە خـوا ئیسـرائیل و یـەهوزای ئاگـادارکردەوە لەسـەر زمـانی هـەموو پێغەمبـەران و هـەموو خەونبینێك وتی: (وازبێنن لە ڕێگە خراپەکانتان، وە وەسێتەکانم و فەرزەکانم بپارێزن بەپێی هەموو شـەریعەتەکەی کـە وەسـێتی باوانتـانم پێکـردووە وە ئەوەی پێم ڕاگەیانـدوون لەسـەر دەسـتی بەنـدە پێغەمبـەرەکانم) (١٣) جـا گوێیان نەگرت و کەللەڕەقییان کرد وەك باووباپیرانیان کە ئیمانیان نەهێنا بە یەزدانی پەروەردگاریان (١٤).

– ونذر يفتاح نذرا للرب وقال: ((إن أسـلمت بـني عمـون إلى يـدي (٣٠) فكـل خارج يخرج من باب بـيتي وإلى لقـائي، حـين عـودتي بسـلام مـن عنـد بـني عمـون، يكـون للـرب فأصـعده محرقـة)) (٣١) وعـبر يفتـاح إلى بـني عمـون

ليحاربهم، فأسلمهم الرب إلى يده (٣٢) .. وكان، عند نهاية الشهرين، أنها رجعت إلى أبيها، فأتم بها النذر الذي نذره، وهي لم تعرف رجلا. فجرت العادة بين بني إسرائيل (٣٩) أن بنات إسرائيل يمضين من سنة إلى سنة وينحن على ابنة يفتاح الجلعادي أربعة أيام في السنة (٤٠) (القضاة / ١١)

وە یەفتاح نەزرێکی کرد بۆ خوا و وتی: (گەر بەنی عەمۆنم تەسلیم بکەیت (٣٠) ئەوا هەرکەسێك کە لە ماڵەکەمەوە دەرئەچێت بۆ پێشوازیم لەکاتی گەڕانەوەمدا بە سەلامەتی لەلای بەنی عەمۆنەوە ئەوا بۆ یەزدان ئەبێت و وەك قوربانی ئەیسووتێنم) (٣١) وە یەفتاح پەڕییەوە بۆ بەنی عەمۆن تا شەڕیان بکات، جا خوا تەسلیمی کردن (٣٢) .. وە لە کۆتایی دوو مانگەکەدا بوو کچەکە گەڕایەوە بۆ لای باوکی جا ئەو نەزرەی پێ جێبەجێ کرد کە کردبووی، وە ئەو کچە لەگەڵ هیچ پیاوێك جووت نەببوو. جا بوو بە باو لەناو بەنی ئیسرائیلدا (٣٩) کە کچانی ئیسرائیل ساڵانە دەچن بۆئەوەی شیوەن بکەن بۆ کچەکەی یەفتاحی جلعادی چوار ڕۆژ لە ساڵێکدا (٤٠).

- کتێب لە بابەتی هەرتەقە و داهێنانی شتانێك لە دینی خوادا کە ڕێی نەداوە دوو وێنەمان نیشان ئەدات. یەکێکیان ئەوەیە کە هەرشتێك خوا پێی نەوتبووین بیکەین ئەوا لەخۆمانەوە نایکەین، وە گەر وابکەین تاوانبارین و شایەنی سزای خواین. وە تەنانەت گەر کەسێك

بەناوی پێغەمبەریشەوە هات و فەرمانی کرد شتێك بکەین پێچەوانەی فەرمانی خوابێت ئەوا بەقسەی ناکەین. بەڵام وێنەی دووەمیان ئەوەیە کە گەر شتێك بە مێشکتدا هات و بەباشت زانی بۆ خوای بکەیت، ئەوا بیکە ئەگەرچی پێچەوانەی فەرمانەکانی خواش بێت. وە خوا ئەوەت لێ قبوڵ ئەکات و وەڵامی داواکانت ئەداتەوە.

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا (النساء - ٨٢) ئایا بۆ لە قورئان ناڕوانن، وە گەر قورئان لەلای غەیری خواوە بوایە ئەوا دژیەکییەکی زۆریان تیا ئەبینی ﴾.
+ ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ (البقرة - ٧٩) جا دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە کتێب بە دەستی خۆیان ئەنووسن پاشان ئەیدەنە پاڵ خوا بۆئەوەی دنیایەکی کەمی پێ بکڕن، تیابچن بۆ شتێك کە بەدەستی خۆیان نووسیویانە وە تیابچن بۆ ئەو پارە کەمەی دنیا کە دەستیان ئەکەوێت ﴾.

+ ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا (٨٨) وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا (٨٩) (الإسراء)

بڵێ گەر هەموو مرۆڤ و جن کۆببنەوە لەسەر ئەوەی وەك ئەم قورئانە بێنن هاوشێوی ناهێنن گەرچی هەندێکیان یارمەتیدەری هەندێکیشیان بن (٨٨) وە لەم قورئانەدا بۆ خەڵك لە هەموو پەندێکمان هێناوەتەوە جا زۆربەی خەڵك تەنها کوفرانەبژێرییان هەڵبژاردووە (٨٩) ﴾.

+ ﴿ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٢٣) فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ (٢٤) (البقرة) وە گەر لە گوماندان لەوەی دامانبەزاندووە بۆ سەر بەندەکەمان دەی سورەتێك لە هاوشێوەی بێنن وە پشتیوانەکانتان بێنن جگە لە خوا گەر ڕاستگۆن (٢٣) جا گەر وانەکەن وە واش ناکەن دەی خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە، ئامادەکراوە بۆ کافران (٢٤) ﴾.

+ ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ أَن يُفۡتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٣٧) أَمۡ يَقُولُونَ

ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٣٨) (يونس) وه ئەم قورئانە هەڵنەبەستراوە و قسەی غەیری خوا نییە بەڵام بەڕاستدانەری ئەوانەی پێش خۆیەتی وە ڕوونکردنەوەی ئەحکامەکانی قورئانە هیچ گومانی تیا نییە لە پەروەردگاری جیهانیانەوەیە (٣٧) یان ئەڵێن هەڵیبەستووە بڵێ دەی سورەتێکی هاوشێوەی بێنن وە بانگی ئەوە بکەن کە ئەتوانن جگە لە خوا گەر ڕاستئەکەن (٣٨) ﴾.

لەم دەقە پیرۆزانەی قورئانەوە تێئەگەین کە هەر کتێبێك و هەر قسەیەك لەلایەن خوای گەورەوە بێت، ئەوا هیچ دژیەکییەکی تیا نییە بەڵکو ڕاست و ڕەوانە. وە دژیەکی و تێکەڵ و پێکەڵی لە قسەی غەیری خوادایە. وە هەر قسەیەك دژیەك بوو ئەوا بزانە کە قسەی خوا نییە. وە قورئانی پیرۆز یەکێك لەو نیشانانەی کە پیایدا ئەزانین کە قسەی خوای گەورەیە و نوسراوی ئینسان نییە، ئەوەیە کە دژیەکی تیا نییە. وە هەرکەس گومانی لە قورئانی پیرۆز هەیە با وەك ئەو بێنێت، وە کێش ئەهێنێت یارمەتی بدەن لەو کارەیا با بیهێنێت. چونکە گەر قورئان مرۆڤ نوسیبێتی، ئەوا مرۆڤێکی تر ئەتوانێت هاوشێوەی بنوسێتەوە گەر باشتریش نەنوسێت و بیداتە پاڵ خوای گەورە.

وە ئەشیٚ یەکێك بڵێت لە قورئانیشدا دژیەکی هەیە، وە چەند ئایەتێك بێنێتەوە بە نموونە. بەڵام لە ڕاستیدا وانییە، بەڵکو گەر بەجوانی وردبینەوە لە ئایەتەکان ئەبینین هیچ دژیەك نین. بۆنموونە:

+ ﴿ وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥۚ وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ (الحج - ٤٧) وە پەلەی سزات لێئەکەن وە خوا پەیمانی ناشکێنێت، وە ڕۆژێك لای پەروەردگارت وەك هەزار ساڵە لەوەی ئێوە ئەیژمێرن ﴾.
+ ﴿ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ (السجدة - ٥) کاروبارەکان بەڕێوەئەبات لە ئاسمانەوە بۆ زەوی پاشان بۆی بەرزئەبنەوە لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی هەزار ساڵە لەوەی ئێوە ئەیژمێرن ﴾.
+ ﴿ سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ (١) لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ (٢) مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ (٣) تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ (٤) فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا (٥) إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا (٦) وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا (٧) (المعارج) داواکەرێك داوای کرد بە سزایەك داببەزێت (١) بۆ کافران کە گێڕەرەوەی نییە (٢) لە خوای خاوەن پلەی بەرزبوونەوەکانەوە (٣)

مەلائیکەتەکان و ڕۆح بۆ لای بەرزئەبنەوە لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە (٤) جا سەبربگرە سەبرێکی جوان بێ ناشکوری (٥) ئەوان قیامەت بە دوور ئەبینن (٦) وە ئێمە بە نزیکی ئەبینین (٧) ﴾.

- گەر یەکێك بۆ یەکەم جار و بێ وردبوونەوە سەیری ئەم دەقانە بکات، لەوانەیە واتێبگات کە خوای گەورە جارێك ئەڵێت ڕۆژێك لای خوا هەزار ساڵی مرۆڤەکانە، وە جارێك ئەڵێت ڕۆژێك لای خوا وەك پەنجا هەزاری مرۆڤەکانە. یان جارێك ئەڵێت کاروباری بوونەوەرەکان لە ڕۆژێکدا بەڕێوە ئەبات و ئەم ڕۆژەش هەزار ساڵی مرۆڤەکانە، وە جارێك ئەڵێت ئەو ڕۆژە پەنجا هەزارە. بەڵام لەڕاستیدا وانییە و هەر ئایەتێك لەو سێ ئایەتە باس لە بابەتێکی جیا لەوی تر ئەکات. جا لە ئایەتی یەکەمدا خوای گەورە ئەوەمان پێئەڵێت کە ماوەی یەك ڕۆژ لای ئەو هەزار ساڵی ئێمەیە و، کات لای خوای گەورە جیایە لە کات لای مەخلوقەکانی، وە ئەم زانیارییەی نەبەستووەتەوە بە هیچ بابەتێکەوە و تەنها ئێمەی لێ ئاگادارکردووەتەوە. وە ئایەتی دووەم باسی ئەوە ئەکات کە خوای گەورە کاروباری بوونەوەرەکان بەڕێوە ئەبات و دایئەبەزێنێت و دواتر بۆ لای بەرزئەبنەوە و، هەموو ئەمانە لە یەك ڕۆژدا ڕوودەدەن کە ماوەکەی هەزار ساڵە. وە ئایەتی سێیەم

باس لە بەرزبوونەوەی مەلائیکەتەکان و جبریل ئەکات علیه السلام بۆ لای خوا لە ڕۆژێکدا کە بۆ غەیری ئەوان لە مەخلوقەکان پەنجا هەزار ساڵە.

+ ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ (٥٢) صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلۡأُمُورُ (٥٣) (الشورى) وە بەو شێوەیە قورئانمان بۆ ناردوویت، نەتئەزانی کتێب چییە وە نە ئیمانیش بەڵام کردوومانە بە ڕووناکییەك هەرکەسمان بوێت لە بەندەکانمان پێی هیدایەت ئەدەین، وە تۆ ڕێنوێنی ئەکەیت بۆ ڕێگەیەکی ڕاست (٥٢) ڕێگەی خوا کە هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوییە هی ئەوە، بەدڵنیاییی سەرئەنجامی کارەکان بۆ لای خوایە (٥٣) ﴾.

+ ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ (٥٦) وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ (٥٧) (القصص) تۆ هیدایەتی ئەو کەسە نادەیت کە خۆشتئەوێت بەڵام خوا هیدایەتی هەرکەس ئەدات کە بیەوێت، وە ئەو زاناترە

بە هیدایەتدراوەکان (٥٦) وە وتیان گەر شوێن هیدایەت بکەوین لەگەڵتا ئەوا لە زەوی خۆمان دەرئەکرێین، ئایا حەرەمێکی بێ ترسمان پێ نەبەخشیون بەروبوومی هەموو شتێکی بۆ دێت رزقێکە لە ئێمەوە بەڵام زۆربەیان نازانن (٥٧) ﴾.

- ئەوەی ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە لەوانەیە بڵێت: چۆن لە یەکێکیاندا ئەڵێت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هیدایەتی خەڵك ئەدات؟ وە لە یەکێکی تریاندا ئەڵێت پێغەمبەر هیدایەتی خەڵك نادات؟ لە وەڵامیدا ئەڵێین: لە ئایەتی یەکەمدا هیدایەت بە واتای ڕێنیشاندان دێت[٧] [٩]، واتا پێغەمبەری خوا ڕێگای ڕاست بۆ خەڵك ڕوونئەکاتەوە و ڕێنیشاندەریانە بۆی. بەڵام هیدایەت لە ئایەتی دووەمدا بە واتای شوێنکەوتنی ڕێگای ڕاستی ئیسلام دێت دوای ناسینی[٧]، واتا پێغەمبەری خوا توانای نییە دوای ئەوەی ڕێی ڕاستی بۆ خەڵك ڕوونکردەوە وایان لێبکات شوێنی بکەون، چونکە هەم زۆرکردن نییە لە ئیسلامدا، هەم دڵی خەڵکەکە بەدەست خوای گەورەیە نەوەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

+ ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ

مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ (البقرة - ١٣٦)
بڵێن ئیمانمان بە خوا هێنا وە بەوەی بۆمان دابەزیوە وە بەوەی بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب دابەزیوە، وە بەوەش دراوە بە موسا و عیسا وە بەوەش دراوە بە پێغەمبەران لە پەروەردگاریانەوە، هیچ جیاوازییەك ناکەین لەنێوانیان، وە ئێمە بۆ خوا موسوڵمانین ﴾.

+ ﴿ تِلۡكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۘ مِّنۡهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُۖ وَرَفَعَ بَعۡضَهُمۡ دَرَجَٰتٖ (البقرة - ٢٥٣) ئەم پێغەمبەرانە فەزڵی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا تیایانە قسەی لەگەڵ خوا کردووە، وە پلەی هەندێکیانی بەرزکردووەتەوە ﴾.

- گەر کەسێك بە سادەیی سەیری ئەم دوو دەقە بکات ئەڵێت: بۆچی لە یەکێکیاندا پێغەمبەران وەك یەکن و جیا نین؟ وە لەوی تریان جیان و پلەیان جیایە؟ لە وەڵامیدا ئەڵێین: ئایەتی یەکەم باس لە باوەڕی موسوڵمانان ئەکات بە پێغەمبەران علیهم السلام، وە ئەڵێت کە موسوڵمانان وەك یەك باوەڕیان بە هەموو پێغەمبەران هەیە و هیچیان جیا ناکەنەوە لەوانی تر لەوەیا، وە باوەڕیان بە یەکێکیان نییە زیاتر لەوانی تر. وە ئایەتی دووەم باس لە پلەی پێغەمبەران ئەکات علیهم

السلام لای خوای گەورە نەوەك لای موسوڵمانان، وە ئەڵێت پێغەمبەران لای خوای گەورە فەزڵ و پلەیان جیایە سەرەڕای ئەوەی بەگشتی لە سەروو هەموو مرۆڤەکانیشەوەن.

+ ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوب (ق - ٣٨) وە بێگومان ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیانە لە شەش ڕۆژدا دروستمانکرد و هیچ ماندووییەکمان تووشنەبوو ﴾.

+ ﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِيٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ (١٠) ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهٗا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ (١١) فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ (١٢) (فصلت) بڵێ ئەوە ئێوە بەوە کافرن کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروستکردووە وە شەریکی بۆ دائەنێن، ئەوە پەروەردگاری جیهانیانە (٩) وە تیایا شاخی دانا لەسەری وە بەرەکەتی تێکرد وە قووتەکانی دیاریکرد تیایا لە چوار ڕۆژدا، ئەمە وەڵامە بۆ پرسیارکەرەکان (١٠) پاشان ویستی ئاسمانی بوو وە ئاسمان دووکەڵ بوو جا بە ئاسمان و زەوی وت بە گوێرایەڵی یان بە پێناخۆشی

فەرمانم جێبەجێ بکەن، وتیان بە گوێرایەڵی جێبەجێی ئەکەین (١١) جا کردنی بە حەوت ئاسمان لە دوو ڕۆژدا وە فەرمانی خۆی لە هەموو ئاسمانێکدا جێگیرکرد، وە ئاسمانی دنیامان ڕازاندەوە بە ئەستێرەکان وە پارێزەریشن، ئەوە دانانی خوای بەعیززەت و زانایە (١٢) ﴾.

- لەوانەیە کەسێك بڵێت: لەنێوانی ئەم دوو ئایەتەدا دژیەکی هەیە، چونکە لە یەکەمیاندا ئەڵێت بە شەش ڕۆژ خوا ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد، وە لەوی تریاندا بە هەشت ڕۆژ دروستبوون چونکە زەوی دوو ڕۆژی ویست و شاخەکان و قوتی سەر زەوی چوار و ئاسمانەکانیش دوو ڕۆژ و، گەر ئەمانە کۆبکەینەوە هەشت ڕۆژ ئەکات. لە وەڵامدا ئەڵێین: لە ئایەتی یەکەمدا خوای گەورە بە گشتی باسی ئەو ماوەیە ئەکات کە ئاسمانەکان و زەوی تیایان دروستکردووە کە شەش ڕۆژە. وە لە ئایەتەکانی تردا بەشێك لە وردەکاری ئەو شەش ڕۆژە باسئەکات و پێمان ئەڵێت کە هەر شتێك چەند ڕۆژی پێچووە تا تەواو بووە. وە هەڵەیە ڕۆژەکان کۆبکەینەوە چونکە کاتی ڕووداوەکان هەمان کاتە و هەندێك ڕووداو لە هەمان کاتدا ڕوویانداوە نەوەك لە دوو کاتی جیاوازدا و دوابەدوای یەك. جا دوو ڕۆژی یەکەمی ئەم شەش ڕۆژە هەم زەوی تیا دروستبووە هەم شاخەکان و قوتی سەر زەوی بە

هاوبەشــی[٧]، وە لــە دوو ڕۆژی دووەمــدا دروســتبوونی شــاخەکان و قوتەکان بەردەوام بوو، وە دوو ڕۆژی کۆتاییش ئاسمانەکان دروستبوون.




(هێڵکاری دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژ)

- وە بۆ نموونە گەر کەسێك ئیش لە باخێکدا بکات و دواتر پێمان بڵێت:

شەش ڕۆژ ئیشم لەم باخەدا کرد. دوو ڕۆژ زەویم کێڵا، وە چوار ڕۆژیش

خەریکی تۆو چاندن بووم، دوو ڕۆژیش پەرژینی باخەکەم کرد. لێرەدا مەرج نییە ئەو ئیشانەی بەدوای یەکترا کردبێت لە ڕۆژی جیاوازدا، بەڵکو ئەشێ لە یەك ڕۆژدا دووان لەو ئیشانەی کردبێت و، دوو ئیش یەك ڕۆژی هاوبەشیان هەبێت. بۆنموونە دوو ڕۆژی یەکەم هەم زەوی کێڵابێت هەم تۆویشی چاندبێت لەگەڵیا، وە دوو ڕۆژی دواتر تەنها تۆوی چاندبێت، وە دوو ڕۆژی کۆتاییش پەرژینی کردبێت. وە گەر لە وردەکارییەکەدا ماوەی ئیشەکان کۆبکەینەوە، ئەوا بە هەڵە ڕۆژەکانی ئیشکردن حساب ئەکەین و دوو ڕۆژ زیاتر ئەخەینە سەر ڕۆژەکان. یان بۆنموونە تەلەبەیەك سێ ڕۆژ سەعی بکات، ڕۆژی یەکەم لە زمانی کوردی و عەرەبیدا، وە ڕۆژی دووەم تەنها لە عەرەبیدا، وە ڕۆژی کۆتایی تەنها لە ئینگلیزیدا. کۆی ڕۆژەکان سێیە. بەڵام لە وردەکاریدا کوردی یەك ڕۆژی ویست، وە عەرەبی دوو ڕۆژ، وە ئینگلیزی یەك ڕۆژ.

+ ﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴾ (النساء - ٣) وە گەر ترسان کە دادپەروەر نەبن لە کچە هەتیوەکاندا ئەوا مارەی بکەن لەو ئافرەتانەی بەدڵتانن دووان وە سیان وە

چوار، جا گەر ترسان دادپەروەر نەبن ئەوا یەك دانە یان کەنیزەکەکانتان، ئەوە نزیکترە کە زوڵم نەکەن ﴾.

+ ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا (النساء - ١٢٩) وە ناتوانن دادپەروەر بن لەنێوان ئافرەتاندا گەرچی هەوڵیش بدەن، جا با مەیلتان هەمووی نەچێت بەلای یەکێکیاندا و ئەوانی تر وەك هەڵواسراویان لێبێت، وە گەر چاکسازی بکەن و تەقوای خوا بکەن ئەوا خوا لێبووردە و بەرەحمە ﴾.

- لەوانەیە یەکێك دوای خوێندنەوەی ئەم دوو ئایەتە بڵێت: دژیەکی هەیە لەنێوانیاندا. چونکە یەکێکیان ئەو واتایە ئەدات کە پیاو ئەتوانێت دادپەروەر بێت لەنێوان ژنەکانیدا، بۆیە بۆی هەیە زیاتر لە ژنێك بێنێت. وە ئەوی تریان ئەڵێت پیاو ناتوانێت دادپەروەر بێت. جا ئایا پیاو دادپەروەرە؟ وە گەر نا ئیتر بۆچی ژنی تر بێنێت؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: ئایەتی یەکەم باس لە دادپەروەری ئەکات لە دانی مافی هەریەکێك لە ژنەکاندا لە شتە دیار و کردارەکاندا. وەك: نەفەقە، مامەڵەی جوان، مارەیی، بەشکردنی شەوەکان. وە گەر پیاو توانای دادپەروەری نەبێت لەو ڕووەوە ئەوا نابێت ژنی تر بێنێت. بەڵام ئایەتی

دووەم باس لـە دادپـەروەری ئـەكات لـە خۆشویسـتنی دڵـەوە[٧]. وە ئەمەی ئەخیر مەرج نییە لەسەر پیـاو بۆئـەوەی ژنـی تـر بێنێـت كـە هەموویانی وەك یەك خۆشبوێت[١٨] [٣١]. وە گەر یـەكێكیانی لـەوانی تر خۆشتربوێت و لە دڵەوە دادپەروەر نەبێت، ئەوا هێشتا ئەتوانێت لـە بابەتە ڕووكەش و دیارەكاندا دادپەروەربێت. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زیاتر لە ژنێكی هـەبوو، وە دادپـەروەر بـوو لـە بابەتە دیار و دەرەكییەكاندا[١٥]، وە لەگەڵ ئەوەشدا عائیشەی لـەوانی تر خۆشترئەویست ڕەزای خوای لێبێت ﴿ مَـن كانـت لَـهُ امرأتـانِ فمـالَ إلى إحداهما، جاءَ يومَ القيامـةِ وشـقُّهُ مائـلٌ (تحفة المحتاج ٢/ ٣٨٩) هەركەس دوو ئافرەتی هەبێت وە لاربێتەوە بۆ یەكێكیان لە قیامەتـدا دێت و لایەكی خوارە ﴾، ﴿ أنَّ رَسولَ اللَّهِ صَـلَّى اللهُ عليـه وسـلَّمَ، لَمَّـا كانَ في مَرَضِهِ، جَعَلَ يَدُورُ في نِسَائِهِ، ويقولُ: أيْنَ أنَا غَدًا؟ أيْنَ أنَا غَدًا؟ حِرْصًا علَى بَيْتِ عَائِشَةَ قالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمَّا كانَ يَومِي سَـكَنَ (صـحيح البخاري - ٣٧٧٤) پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وسـلم كـە لـە نەخۆشییەكەیدا بوو هەستا بەسەر خێزانەكانیدا ئەگەڕا و ئەیوت: مـن سبەی لەلای كێم؟ من سبەی لەلای كێم؟ ویستی لـە مـاڵی عائیشـە بوو. عـائیشە وتی: جا ئەو ڕۆژەی سەرەی من بوو ئارامی گـرت ﴾، ﴿

أنَّ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ بَعَثَ عَمْرَو بنَ العَاصِ علَى جَيْشِ ذَاتِ السُّلَاسِلِ، قالَ: فأتَيْتُهُ فَقُلتُ: أيُّ النَّاسِ أحَبُّ إلَيْكَ؟ قالَ: عَائِشَةُ. قُلتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قالَ: أبُوهَا. قُلتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: عُمَرُ. فَعَدَّ رِجَالًا، فَسَكَتُّ مَخَافَةَ أنْ يَجْعَلَنِي في آخِرِهِمْ (صحيح البخاري - ٤٣٥٨)

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم عەمری کوڕی عاصی نارد بەسەر سوپای ذات السلاسل، وتی: جا هاتمەوە بۆ لای و وتم: کێ خۆشەویستترینە لەلات؟ وتی: عائیشە. وتم: لە پیاوان؟ وتی: باوکی. وتم: پاشان کێ؟ وتی: عومەر. جا چەند پیاوێکی ناو برد و منیش بێدەنگ بووم ترسام بمخاتە کۆتاییەوە ﴾.

+ ﴿ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (الروم - ٣١) بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و تەقوای بکەن و نوێژ بکەن وە لە موشریکەکان مەبن ﴾.

+ ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ (٤) ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ (٥) ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ (٦) وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ (٧) (الماعون) جا وەیل بۆ نوێژخوێنان (٤) ئەوانەی کە لە نوێژەکانیانا تەمەڵ و بێ ئاگان (٥) ئەوانەی ریابازی ئەکەن (٦) وە ڕێ لە زەکات ئەگرن (٧) ﴾.

- گەر بە ناتەواوی کەسێك ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە ئەڵێت: بۆچی ئایەتێك بە خەڵك ئەڵێت نوێژ بکەن و یەکێکی تر ئەڵێت ئەوانەی نوێژ ئەکەن سزا ئەدرێن؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: ئایەتی یەکەم فەرمان ئەکات بە نوێژکردن و نەهی ئەکات لە موشریکەکان بین بە نوێژنەکردن. وە ئایەتی دووەم بە تەنیا وەرناگیرێت جیا لە ئایەتەکانی دواتری سورەتەکە. بەڵکو لە سیاقەکەیدا واتا دروستەکەی ئەدات. ئەویش ئەوەیە ئەو کەسانەی نوێژەکانیان درەنگ ئەخەن لە کاتی خۆی یان خۆیانی لێ غافڵ ئەکەن وە ریابازن تیایا، ئەوانە سزائەدرێن لەسەر ئەو ئیهمالی و ریائەیان[٧]، نەوەك لەسەر نوێژکردنەکەیان. وە گەر ئایەتی چوارەمی سورەتی ماعون بەتەنیا وەرگرین و جیایبکەینەوە لە ئایەتەکانی تر، ئەوا هەم ئایەتەکە مەعنای دروست نادات، هەم ئایەتەکانی دواتر مەعنایان نابێت. بەڵکو هەموویان بەیەکەوە واتایەکی دروست ئەدەن، بۆیە بەیەکەوە ئەیانخوێنینەوە و تەفسیریان ئەکەین.

## بابەتی یەکەم

## دەقەکان دەربارەی بڵاوکردنەوەی دین

قورئانی پیرۆز و کتێب باس لەوە ئەکەن کە دینی خوای گەورە ئەبێت بڵاوببێتەوە و بگات بە خەڵك، وە خەڵك شوێنی بکەوێت، وە گەر شوێن دینەکە نەکەون ئەوا ئەچنە جەهەننەمەوە و خوای گەورە سزایان ئەدات (النحل - ١٢٥)، (آل عمران - ٦١، ٦٤)، (طە - ١٢٤)، (الأنفال - ٣٩)، (یوحنا ١٢/ ٤٦ - ٤٨)، (متی ٢٨/ ١٩)، (یوحنا ٣/ ٣٦)، (یوحنا ٦/ ٥٣، ٥٤). چونکە دینی خوا حەقە و خەڵك بەشوێنکەوتنی لە نەفامی و زوڵم ڕزگاریان ئەبێت. وە واجبە بەندەکان فەرمانەکانی خوای گەورە جێبەجێبکەن کە بۆیانی ناردووە. هەربۆیە ئەبێت ئەم حەقە بڵاوببێتەوە وە نابێت بشاردرێتەوە، وە نابێت ڕەتبکرێتەوە و پشتگوێبخرێت. جا با بزانین قورئانی پیرۆز و کتێب چۆن فێری بڵاوکردنەوەی دینمان ئەکەن؟ وە چۆن هانی شوێنکەوتووەکانیان ئەدەن بۆ ئەو کارە؟ وە کام ڕێگایەیان باش و گونجاوە و فەرمانی خوای گەورەیە؟

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– وجاء العمالقة فحاربوا إسرائيل في رفيديم (٨) فقال موسى ليشوع: (( اختر لنا رجالا واخرج لمحاربة العمالقة، وغدا أنا أقف على رأس التل وعصا الله في يدي )) (٩) ففعل يشوع كما قال له موسى في أمر محاربة العمالقة. أما موسى وهارون وحور فصعدوا إلى رأس التل (١٠) فكان، إذا رفع موسى يده، يغلب بنو إسرائيل، وإذا حطها، تغلب العمالقة (١١) ولما ثقلت يدا موسى، اخذا حجرا وجعلاه تحته. فجلس عليه وأسند هارون وحور يديه، أحدهما من هنا والآخر من هناك. فكانت يداه ثابتتين إلى مغيب الشمس (١٢) فهزم يشوع عماليق وقومه بحد السيف (١٣) وقال الرب لموسى: (( أكتب هذا ذكرا في كتاب وضع في أذني يشوع أني سأمحو ذكر عماليق محوا من تحت السماء )) (١٤) وبنى موسى مذبحا وسماه (( الرب رايتي )) (١٥) فقد قال: (( إن يدا قد ارتفعت على عرش الرب: فالحرب قائمة بين الرب وعماليق من جيل إلى جيل )) (١٦) (خروج / ١٧) وە عەمالیق هاتن و شەڕی ئیسرائیلیان کرد لە ڕێفیدیم (٨) جا موسا بە یەشوعی وت: (پیاوانێکمان بۆ هەڵبژێرە و دەرچۆ بۆ شەڕی عەمالیق، وە سبەینێ من لەسەر گردەکە ئەوەستم و گۆچانی خوا بەدەستمەوە ئەبێت) (٩) جا یەشوع

وەك ئەوەی کرد موسا پێی وت لە فەرمانی شەڕی عەمالیق. ئەمما موسا و هارون و حور چوونە سەر گردەکە (١٠) جا گەر موسا دەستی بەرزبکردایەتەوە بەنو ئیسرائیل ئەیانبردەوە، وە گەر دایبنایە عەمالیق ئەیانبردەوە (١١) وە کاتێك دەستەکانی موسا قورس بوون بەردێکیان برد و خستیانە ژێری. جا پاڵی پێوەدا و هارون و حوریش هەریەکە لەملاو لایەوە دەستیان گرت. جا دەستەکانی جێگیربوون تا خۆرئاوا (١٢) جا یەشوع عەمالیق و لەشکرەکەی کوشت بە هێزی شمشێر (١٣) وە خوا بە موسای وت: (ئەمە بنووسە وەك یاداشتێك لە پەڕاوێکدا و بۆ یەشوعی بخوێنەوە کە من ناوی عەمالیق لە ژێر ئاسمان ئەسڕمەوە) (١٤) وە موسا قوربانگایەکی دروستکرد و ناوی نا (یەزدان ئاڵامە) (١٥) جا وتی: (چونکە دەستێك بەرزبووەوە بۆ سەر عەرشی خوا، ئەوا شەڕ بەردەوامە لەنێوان خوا و عەمالیق نەوە دوای نەوە) (١٦).

- وكلم الرب موسى قائلا: (١) ((انتقم انتقام بني إسرائيل من المدينيين، وبعد ذلك تنضم إلى أجدادك )) (٢) فكلم موسى الشعب قائلا: ((ليجهز بعضكم أنفسهم للقتال وليخرجوا على مدين ليحلوا بهم انتقام الرب (٣) من كل سبط من أسباط إسرائيل ترسلون ألفا إلى القتال )) (٤) فجند من ألوف إسرائيل، من كل سبط ألف، أي اثنا عشر ألفا مجهزون للقتال (٥) فأرسلهم

موسى من كل سبط ألفا إلى القتال، ومعهم فنحاس بن ألعازار الكاهن وفي يده أمتعة القدس وأبواق الهتاف (٦) فقاتلوا مدين كما أمر الرب موسى، وقتلوا كل ذكر (٧) وقتلوا أيضا، زيادة على قتلاهم، ملوك مدين وهم خمسة: أوي وراقم وصور وحور ورابع. وأما بلعام بن بعور، فقتلوه بالسيف (٨) وسبى بنو إسرائيل نساء مدين وأطفالهم، وغنموا جميع بهائمهم ومواشيهم وأموالهم (٩) وأحرقوا بالنار جميع مدنهم مع مساكنهم ومخيماتهم (١٠) وأخذوا الغنيمة كلها والنهب من بشر وبهائم (١١) وأتوا إلى موسى وألعازار الكاهن وجماعة بني إسرائيل بالأسرى والنهب والغنيمة إلى المخيم، في عربة موآب التي على أردن أريحا (١٢) فخرج موسى وألعازار الكاهن وكل رؤساء الجماعة لملاقاتهم إلى خارج المخيم (١٣) فغضب موسى على ضباط الجيش، أي رؤساء الألوف ورؤساء المئات، القادمين من قتال الحرب (١٤) وقال لهم موسى: ((هل استبقيتم الإناث كلهن؟ (١٥) إن هؤلاء هن اللواتي حملن بني إسرائيل، بمشورة بلعام، على أن يخونوا الرب في أمر فغور، فحلت الضربة في جماعة الرب (١٦) والآن فاقتلوا كل ذكر من الأطفال، واقتلوا كل امرأة عرفت مضاجعة رجل (١٧) وأما إناث الأطفال اللواتي لم يعرفن مضاجعة الرجال، فاستبقوهن لكم (١٨) (العدد / ٣١) وە خوا قسەی لەگەڵ موسا کرد و وتی: (١) (تۆڵەی ئیسرائیل لە مەدیەنییەکان بکەرەوە،

وە دوای ئەوە ئەچیتە پاڵ باوانت) (٢) جا موسا قسەی لەگەڵ گەلەکە کرد و وتی: (با هەندێکتان خۆتان بۆ شەڕ ئامادە بکەن وە با دەرچن بۆ سەر مەدیەن تا تۆڵەی خوایان بەسەر بێنن (٣) لە هەموو هۆزێك لە هۆزەکانی ئیسرائیل هەزار ئەنێرن بۆ شەڕ) (٤) جا لە هۆزەکانی ئیسرائیل هەزار کەسی لە هەر هۆزێك کۆکردەوە، واتە دوانزە هەزار ئامادەکراو بۆ شەڕ (٥) جا موسا لە هەر هۆزێك هەزاری ناردن بۆ شەڕ، وە لەگەڵیان فنحاسی کوڕی ئەلعازاری کاهین و لە دەستیدا کەلوپەلی پیرۆز و کەڕەنای هاوارکردن (٦) جا شەڕی مەدیەنیان کرد وەك خوا فەرمانی بە موسا کرد، وە هەموو نێرینەکانیان کوشت (٧) وە هەروەها لەسەروو کوژراوەکانەوە پاشاکانی مەدیەنیشیان کوشت کە پێنج بوون: ئەوی و راقیم و صور و حور و رابیع. بەڵام بلعامی کوڕی باعور ئەوا بە شمشێر کوشتیان (٨) وە بەنو ئیسرائیل ژن و منداڵی مەدیەنیان بە کۆیلە کرد، وە هەموو ئاژەڵ و مەڕ و مانگاکانیان بۆ خۆیان برد (٩) وە هەموو شارەکەیان بە ئاگر سووتاند لەگەڵ ماڵ و چادرەکانیان (١٠) وە هەموو دەستکەوتەکانیان برد و تاڵانییەکەش لە مرۆڤ و ئاژەڵ (١١) وە هاتن بۆ لای موسا و ئەلعازاری کاهین و کۆمەڵەی بەنی ئیسرائیل بە گیراوەکان و تاڵانی و دەستکەوتەکەوە بۆ چادرگاکە، لە دەشتی موئاب کە لەسەر ئوردون ئەریحا بوو (١٢) جا موسا و ئەلعازاری کاهین و

هەموو سەرۆکی کۆمەڵەکە چوون بەرەو پیریانەوە بۆ دەرەوەی چادرگەکە (١٣) جا موسا تووڕە بوو لە سەرکردەکانی سوپاکە، واتە سەرۆکی هەزارانەکە و سەدانەکە کە لە شەڕی جەنگەکەوە هاتبوون (١٤) وە موسا پێی وتن: (ئایا هەموو ئافرەتەکانتان هێشتووەتەوە؟ (١٥) ئەوانە ئەوانەن کە بەنی ئیسرائیلیان هەڵگرت بە ڕێنمایی بەلعام کە خیانەت لە خوا بکەن لە بابەتەکەی فەغور، جا دەرد بڵاوبووەوە لەناو کۆمەڵی یەزدان (١٦) جا ئێستە هەموو نێرینەیەك بکوژن لە منداڵەکان، وە هەموو ئافرەتێك بکوژن لەگەڵ پیاوان جووت بووبێت (١٧) وە ئەمما منداڵە مێینەکان کە لەگەڵ پیاوان جووت نەبوون ئەوا بۆ خۆتانیان بهێڵنەوە (١٨).

- فهتف الشعب ونفخ في الأبواق، فكان عند سماع الشعب صوت البوق أن الشعب هتف هتافا شديدا، فسقط السور في مكانه، فصعد الشعب إلى المدينة، كل واحد على وجهه، واستولوا على المدينة (٢٠) وحرموا كل ما في المدينة من الرجل وحتى المرأة، ومن الشاب وحتى الشيخ، حتى البقر والغنم والحمير، فقتلوهم بحد السيف (٢١) (يشوع / ٦) جا خەڵکەکە هاواری کرد و فوو کرا بە کەڕەنادا، جا لەو کاتەدا کە خەڵکەکە گوێی لە کەڕەناکە بوو هاوارێکی بەرزی کرد، جا شووراکە ڕووخا لە جێی خۆیدا، جا خەڵکەکە چوونە شارەکەوە، هەریەکە لەلای خۆیەوە چووە ژوورەوە و دەستیان گرت

بەسەر شارەکەدا (٢٠) وە هەموو ئەوەی لە شارەکەدا بوو قڕیانکرد لە پیاو و تەنانەت ژن، لە گەنج و تەنانەت پیر، تەنانەت مانگا و مەڕ و کەر، جا بە حوکمی شمشێر کوشتیانن (٢١).

– ولما رأى يشوع وكل إسرائيل أن الكامنين قد استولوا على المدينة، وقد ارتفع دخانها، عادوا وضربوا رجال العي (٢١) وخرج الكامنون من المدينة للقائهم، فصار القوم في وسط إسرائيل، هؤلاء من هنا وأولئك من هناك. فضربوهم حتى لم يبق مهم باق ولا شريد (٢٢) وقبضوا على ملك العي حيا وقادوه إلى يشوع (٢٣) ولما انتهى بنو إسرائيل من قتل جميع سكان العي في الحقول وفي البرية حيث طاردوهم، وسقطوا جميعهم بحد السيف عن آخرهم، رجع كل إسرائيل إلى العي وضربوها بحد السيف (٢٤) وكان جملة من سقط في ذلك اليوم من رجل وامرأة اثني عشر ألفا، جميع أهل العي (٢٥) ولم يردد يشوع يده التي مدها بالحربة، حتى حرم جميع سكان العي (٢٦) ولم يغنم إسرائيل لنفسه سوى البهائم وأسلاب تلك المدينة، على حسب أمر الرب الذي أمر به يشوع (٢٧) وأحرق يشوع العي وجعلها ركاما للأبد، خرابا إلى هذا اليوم (٢٨) وأما ملك العي فقد علقه على شجرة حتى المساء، وعند غروب الشمس، أمر يشوع فأنزلوا جثته عن الشجرة، وألقوها عند مدخل باب المدينة، وجعلوا عليه كومة كبيرة من الحجارة إلى هذا اليوم

(٢٩) (یشوع / ٨) وە کاتێك یەشوع و هەموو ئیسرائیل بینییان بۆسەکە شارەکەی گرتووە و دووکەڵی بەرزبووەتەوە، گەڕانەوە و لە پیاوەکانی عەییان دا (٢١) وە ئەوانەی لە بۆسەکەدا بوون دەرچوون بۆ بینینیان، جا خەڵکەکە کەوتنە ناو ئیسرائیلەوە، ئەمان لەملاوە و ئەوان لەولاوە. جا لێیاندان هەتا کەسیان لێ نەمان دەربازبن (٢٢) وە پاشای عەییان بە زیندوویی گرت و بردیان بۆ یەشوع (٢٣) وە کە بەنو ئیسرائیل تەواوبوون لە کوشتنی هەموو خەڵکی عەی لە بێستانەکان و لە چۆڵەوانی کە ڕاویاننابوون، وە هەموویان کەوتن بە حوکمی شمشێر تا کۆتاییان، هەموو ئیسرائیل گەڕانەوە بۆ عەی و لێیاندا بە حوکمی شمشێر (٢٤) وە لەوانەی کەوتن لەو ڕۆژەدا لە پیاو و ئافرەت دوانزە هەزار بوون، هەموو خەڵکی عەی (٢٥) وە یەشوع ئەو دەستەی کە بە ڕمەوە درێژیکردبوو نەیگێڕایەوە هەتا هەموو خەڵکی عەی کوشت (٢٦) وە ئیسرائیل جگە لە ئاژەڵ و دەستکەوتی ئەو شارە هیچیان بۆ خۆیان نەبرد، بەپێی فەرمانی خوا کە فەرمانی بە یەشوع کردبوو (٢٧) وە یەشوع عەی سووتاند و کردی بە خۆڵەمێش بۆ هەتا هەتایە، وێرانەیە تا ئەمڕۆ (٢٨) ئەمما پاشای عەی ئەوا بە درەختێکدا هەڵیواسی هەتا ئێوارە، وە لەکاتی خۆرئاوابووندا یەشوع فەرمانی کرد کە دایبگرن بە درەختەکەوە،

وە لە دەروازەی شارەکە فڕێیاندا، وە بڕێکی زۆر بەردیان خستە سەری تا ئەمڕۆ (٢٩).

— واستولى يشوع في ذلك أليوم على مقيدة، وضربها بحد السيف، وحرم ملكها وجميع الأنفس التي فيها، ولم يبق باقيا. وصنع بملك مقيدة كما صفع بملك أريحا (٢٨) ثم اجتاز يشوع و كل إسرائيل معه من مقيدة إلى لبنة و حارب بها (٢٩) فأسلمها الرب أيضا إلى أيدي إسرائيل، هي وملكها. فضربها بحد السيف وقتل كل نفس فيها، ولم يبق فيها باقيا، وفعل بملكها كما فعل بملك أريحا (٣٠) واجتاز يشوع و كل إسرائيل معه من لبنة إلى لاكيش! وعسكر عليها وحاربها (٣١) فأسلم الرب لاكيش إلى أيدي إسرائيل، فأستولى عليها في اليوم الثاني وضربها بحد السيف، وقتل كل نفس فيها، كما فعل بلبنة (٣٢) حينئذ صعد هورام، ملك جازر، لنجدة لاكيش، فضربه يشوع هو وقومه، حتى لم يبق منهم باقيا (٣٣) واجتاز يشوع وكل إسرائيل معه من لاكيش إلى عجلون، وعسكروا عليها، وحاربوها (٣٤) واستولوا عليها في ذلك اليوم، وضربوها بحد السيف وحرم كل نفس فيها في ذلك اليوم عينه كما فعل بلاكيش (٣٥) وصعد يشوع وكل إسرائيل معه من عجلون إلى حبرون وحاربوها (٣٦) واستولوا عليها وضربوها بحد السيف هي وملكها وجميع مدنها كل نفس فيها، ولم يبق منهم باقيا، كما فعل يعجلون وحرمها، هي

وكل نفس فيها (٣٧) وعاد يشوع وكل إسرائيل معه إلى دبير، وحاربها (٣٨) واستولى عليها وعلى ملكها وسائر مدنها، وضربوهم بحد السيف، وحرموا كل نفس فيها، ولم يبق باقيا. كما صنع بحبرون، صنع بدبير وملكها، وكما صنع بلبنة وملكها (٣٩) وضرب يشوع المنطقة كلها: الجبل والنقب والسهل والسفوح، وجميع ملوكها، ولم يبق باقيا، بل حرم كل نسمة، كما أمر الرب، إله إسرائيل (٤٠) (يشوع / ١٠) وە یەشوع لەو ڕۆژەدا دەستیگرت بەسەر مەقیدەدا وە بە حوكمی شمشێر لێیدا، وە پاشاكەی و هەموو خەڵكەكەی قڕكرد و هیچی نەهێشتەوە. وە ئەوەی بە پاشای مەقیدە كرد كە بە پاشای ئەریحای كرد (٢٨) پاشان یەشوع و هەموو ئیسرائیل كە لەگەڵیا بوون لە مەقیدە پەڕینەوە بۆ لەبینە و شەڕی تیا كرد (٢٩) جا خوا ئەویشی تەسلیمی ئیسرائیل كرد، خۆی و پاشاكەیان. جا بە زەبری شمشێر لێیدا و هەموو خەڵكەكەی كوشت و كەسی نەهێشتەوە، وە ئەوەی بە پاشاكەی كرد كە بە پاشای ئەریحای كرد (٣٠) وە یەشوع و ئەوەی لەگەڵیا بوون لە لەبینەوە پەڕینەوە بۆ لاكیش، وە لەسەری گیرسایەوە و شەڕی كرد (٣١) جا خوا لاكیشی تەسلیمی دەستی ئیسرائیل كرد، جا دەستی بەسەردا گرت لە ڕۆژی دواتردا و بە زەبری شمشێر لێیدا و هەموو خەڵكەكەی كوشت وەك چۆن بە لەبینەی كرد (٣٢) ئەو كاتە هورام پاشای جازەر هەستا یارمەتی لاكیش

بدات، جا یەشوع لەو و گەلەکەی دا هەتا کەسی لێ نەهێشتن (٣٣) وە یەشوع و هەموو ئیسرائیل لەگەڵی لە لاکیشەوە چوون بۆ عیجلۆن وە لەشکری دا بەسەردا و شەڕیانکرد (٣٤) وە لەو ڕۆژەدا دەستیان بەسەریدا گرت وە بە زەبری شمشێر لێیاندا و هەموو خەڵکەکەیان کوشت لە هەمان ڕۆژدا وەك ئەوەی بە لاکیشی کرد (٣٥) وە یەشوع و هەموو ئیسرائیل کە لەگەڵیا بوون لە عیجلۆنەوە چوون بۆ حەبرۆن و شەڕیانکرد (٣٦) وە دەستیان بەسەردا گرت وە بە زەبری شمشێر لێیاندا شارەکە و پاشاکەی وە هەموو شارەکانی هەموو خەڵکەکەی ناوی، وە کەسیان نەمانەوە، وەك چۆنی بە عیجلۆن کرد و قڕی کرد ئەو و هەموو خەڵکەکەی (٣٧) وە یەشوع و هەموو ئیسرائیل لەگەڵی گەڕانەوە بۆ دەبیر وە شەڕیانکرد (٣٨) وە دەستیان بەسەردا گرت وە بە زەبری شمشێر لێیاندا شارەکە و پاشاکەی وە هەموو شارەکانی هەموو خەڵکەکەی ناوی، وە کەسیان نەمانەوە، وەك چۆنی بە حەبرۆن کرد وای لە دەبیر و پاشاکەی کرد، وە وەك چۆنی کرد بە لەبینە و پاشاکەی (٣٩) وە یەشوع لە هەموو ناوچەکەی دا: شاخ و نەقەب و دەشت و بەرزاییی، وە هەموو پاشاکانیان وە کەسی نەهێشتەوە، بەڵکو هەموو خەڵکەکەی قڕکرد، وەك چۆن یەزدان فەرمانی کرد خوای ئیسرائیل (٤٠).

– واجتمع جميع أولئك الملوك وجاؤوا وعسكروا سوية عند مياه ميروم لمحاربة إسرائيل (٥) فقال الرب ليشوع: "لا تخف من وجوههم، فإني في مثل هذا الوقت من غد، أجعلهم جميعا قتلى أمام إسرائيل. فعرقب خيلهم وأحرق مركباتهم بالنار" (٦) فخرج يشوع بغتة عليهم بجميع رجال الحرب عند مياه ميروم وانقضوا عليهم (٧) فأسلمهم الرب إلى أيدي إسرائيل، فضربوهم وطاردوهم إلى صيدون الكبير ومسرفوت ميم ووادي المصفاة شرقا، وضربوهم حتى لم يبق منهم باق (٨) وصنع بهم يشوع كما قال الرب: عرقب خيلهم وأحرق مركباتهم بالنار (٩) وعاد يشوع في ذلك الوقت فاستولى على حاصور وقتل ملكها بالسيف، لأن حاصور كانت قديما رأس جميع تلك الممالك (١٠) وضربوا كل نفس فيها بحد السيف محرمين إياهم، ولم تبق نسمة، وحرق حاصور بالنار (١١) واستولى يشوع على جميع مدن أولئك الملوك مع ملوكها، وضربهم بحد السيف، وحرمهم كما أمر موسى، عبد الرب (١٢) فأما المدن الواقعة على تلالها، فلم يحرقها إسرائيل بالنار، إلا حاصور وحدها فأحرقها يشوع (١٣) وجميع غنائم تلك المدن وبهائمها، اغتنمها بنو إسرائيل لأنفسهم. وأما البشر، فضربوهم جميعا بحد السيف، حتى أبادوهم ولم يبقوا نسمة (١٤) كما أمر الرب موسى عبده، أمر موسى يشوع، وكذلك فعل يشوع: لم يهمل كلمة من كل ما أمر الرب به موسى (١٥) وأخذ يشوع تلك

الأرض كلها: الجبل وكل النقب كل منطقة جوشف والسهل والعربة وجبل إسرائيل وسهله (١٦) من الجبل الأقرع الممتد جهة سعير، إلى بعل جاد في بقعة لبنان، تحت جبل حرمون. واستولى على جميع ملوكها فضربهم وقتلهم (١٧) وحارب يشوع جميع أولئك الملوك أياما كثيرة (١٨) لم يكن هناك مدينة سالمت بني إسرائيل سوى الحويين، سكان جبعون، وإنما أخذوا جميع المدن بالحرب (١٩) لأن ذلك كان من قبل الرب، فقسى قلوبهم حتى خرجوا على بني إسرائيل للقتال، لكي يحرموا ولا يرحموا، بل يستأصلوا، كما أمر الرب موسى (٢٠) وجاء يشوع ني ذلك الوقت، وقرض العناقيين من الجبل، من حبرون ودبير وعناب، ومن سائر جبل يهوذا وكل جبل إسرائيل: حرمهم يشوع مع مدنهم (٢١) ولم يبق عناقي في أرض بني إسرائيل إلا في غزة وجت وأشدود (٢٢) وأخذ يشوع كل الأرض، على حسب ما قال الرب لموسى، وأعطاها يشوع ميراثا لإسرائيل، على حسب أقسامهم وأسباطهم. وهدأت الأرض من الحرب (٢٣) (يشوع / ١١) وە هەموو ئەو پاشایانە کۆبوونەوە و هاتن سوپایان پێکەوە نا لەلای ئاوی میروم بۆ شەڕی ئیسرائیل (٥) جا خوا بە یەشوعی وت: "لە ڕوویان مەترسە، چونکە من سبەی ئەم کاتە لەبەردەم ئیسرائیلدا ئەیانکوژم. جا دەماری پێی ئەسپەکانیان ببڕەوە وە گالیسکەکانیان بسووتێنە" (٦) جا یەشوع لەپڕ بۆیان دەرچوو لەگەڵ

هەموو جەنگاوەرەکانیدا لەلای ئاوی میروم وە دایان بەسەریاندا (٧) جا خوا تەسلیمی ئیسرائیلی کردن، جا لێیاندان و ڕاویاننان بۆ صەیدونی گەورە و میسرفۆت میم و دۆڵی میسفا لە ڕۆژهەلات، وە لێیاندان تا کەسیان لێ نەهێشتنەوە (٨) وە یەشوع وای لێکردن کە خوا وتی: دەماری پێی ئەسپەکانیان بېڕەرەوە وە گالیسکەکانیان بسووتێنە (٩) وە یەشوع ئەو کاتە گەڕایەوە جا دەستی گرت بەسەر حاصوردا وە پاشاکەی کوشت بە شمشێر، چونکە حاصور لە کۆندا سەری هەموو ئەو پاشایەتیانە بوو (١٠) وە هەموو خەڵکەکەیان کوشت بە زەبری شمشێر قڕیانکردن، وە کەس نەمایەوە وە حاصوری بە ئاگر سووتاند (١١) وە یەشوع دەستی بەسەر هەموو شاری ئەو پاشایانەدا گرت لەگەڵ پاشاکانیاندا، وە بە زەبری شمشێر لێیدان، وە قڕی کردن وەك موسا بەندەی خوا فەرمانی کرد (١٢) ئەمما شارەکانی سەر گردەکان ئیسرائیل بە ئاگر نەیسووتاند، جگە لە حاصور بەتەنیا یەشوع سووتاندی (١٣) وە هەموو دەستکەوتەکانی ئەو شارانە و ئاژەڵەکانیان بەنی ئیسرائیل بۆ خۆیان هەڵیانگرت. وە ئەمما مرۆڤەکان ئەوا بە زەبری شمشێر هەموویان کوشتن، هەتا قڕیانکردن و کەسیان نەهێشتەوە (١٤) وەك چۆن خوا فەرمانی بە موسای بەندەی کرد، فەرمانی بە یەشوعیش کرد، وە یەشوعیش وایکرد، هیچ وشەیەکی خوای پشتگوێ نەخست کە خوا بە

موسای وتبوو (١٥) وە یەشوع هەموو ئەو زەوییەی برد، شاخ و هەموو نەقەب و هەموو ناوچەی جوشف وە بەرزایی وە عەربە وە شاخی ئیسرائیل و دەشتاییەکەی (١٦) لە شاخی ئەقرەعەوە کە لە لای سەعیرەوەیە تا بەعل جاد لە ناوچەی لوبنان لە ژێر حیرمون. وە دەستی بەسەر هەموو پاشاکانیدا گرت جا لێیدان و کوشتنی (١٧) وە یەشوع شەڕی هەموو ئەو پاشایانەی کرد ڕۆژانێکی زۆر (١٨) هیچ شارێك نەبوو ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیلدا بکات جگە لە حوبییەکان خەڵکی جیبعون، بەڵکو هەموو شارەکانیان بە جەنگ برد (١٩) چونکە ئەوە لەلایەن خواوە بوو، جا دڵیان ڕەق بوو تا لە بەنی ئیسرائیل ڕاپەڕین بۆ شەڕ، تاکو بکوژن وە ڕەحم نەکەن بەڵکو ڕیشەکێش بکەن، وەك چۆن خوا فەرمانی بە موسا کرد (٢٠) وە یەشوع لەو کاتەدا هات و عەناقییەکانی لە شاخەکە بنبڕکرد، لە حیبرۆن و دەبیر و عەناب، وە لە تەواوی شاخی یەهوزا وە هەموو شاخی ئیسرائیل، یەشوع لە شارەکانیان قڕیکردن (٢١) وە هیچ عەناقییەکی نەهێشت لە زەوی بەنی ئیسرائیلدا جگە لە غەززە وە جت وە ئەشدود (٢٢) وە یەشوع هەموو زەوییەکەی برد، وەك چۆن خوا بە موسای وت، وە یەشوع دای بە ئیسرائیل بە میراتی، بەپێی بەش و هۆزەکانیان. وە زەوییەکە ئارام بووەوە لە جەنگ (٢٣).

– وكان بعد وفاة يشوع أن بني إسرائيل سألوا الرب قائلين: (( من منا يصعد أولا لمحاربة الكنعانيين؟ )) (١) فقال الرب: ((يهوذا يصعد، لأني إلى يده أسلمت الأرض )) (٢) فقال يهوذا لشمعون أخيه : ((اصعد معي إلى نصيبي لنحارب الكنعانيين، وأنا أصعد معك أيضا إلى نصيبك )). فانطلق شمعون معه (٣) فصعد يهوذا، فأسلم الرب الكنعانيين والفرزيين إلى أيديهم، فضربوا منهم في بازق عشرة آلاف رجل (٤) وصادفوا في بازق أدوني بازق فحاربوه وضربوا الكنعانيين والفرزيين (٥) فهرب أدوني بازق، فطاردوه وقبضوا عليه وقطعوا أباهيم يديه ورجليه (٦) فقال أدوني بازق: ((إن سبعين ملكا مقطوعة أباهيم أيديهم وأرجلهم كانوا يلتقطون تحت مائدتي. فكما صنعت كافآني الله )). فأتوا به إلى أورشليم فات هناك (٧) وحارب بنو يهوذا أورشليم، فاستولوا عليها وضربوها بحد السيف وأحرقوا المدينة بالنار (٨) ومن بعد ذلك نزل بنو يهوذا ليحاربوا الكنعانيين المقيمين بالجبل والنقب والسهل (٩) وخرج يهوذا على الكنعانيين المقيمين بحبرون، وكان اسم حبرون قبلا قرية أربع، وضربوا شيشاي وأحيمان وتلماي (١٠) وزحفوا من هناك على سكان دبير، وكان اسم دبير قبلا قرية سفر (١١) فقال كالب: ((من ضرب قرية سفر وأخذها أعطيه عكسة ابنتي زوجة )) (١٢) فأخذها عتنيئيل بن قناز، أخو كالب الأصغر، فأعطاه عكسة ابنته زوجة (١٣)

(القضاة / ١) وە دوای مردنی یەشوع بەنی ئیسرائیل داوایان لە خوا کرد: (کێمان یەکەم کەس ئەچێت بۆ شەڕی کەنعانییەکان؟) (١) جا خوا وتی: (یەهوزا ئەچێت، چونکە من زەوییەکەم ڕادەستی ئەو کردووە) (٢) جا یەهوزا بە شەمعۆنی برای وت: (لەگەڵم وەرە بچینە بەشەکەم تا شەڕی کەنعانییەکان بکەین، وە منیش لەگەڵت دێم بۆ بەشەکەت). جا شەمعۆن لەگەڵی دەرچوو (٣) جا یەهوزا دەرچوو وە خوا کەنعانییەکان و فەریزییەکانی تەسلیم کرد، جا لە بازیق دە هەزار پیاویان کوشتن (٤) وە لە بازیق ئەدۆنی بازیقیان بینی جا شەڕیانکرد و لە کەنعانییەکان و فەریزییەکانیان دا (٥) جا ئەدۆنی بازیق ڕایکرد، جا دوایکەوتن و گرتیان و پەنجە گەورەی دەست و قاچیان بڕی (٦) جا ئەدۆنی بازیق وتی: (حەفتا پاشا پەنجە گەورەی دەست و قاچیان بڕابوو لەژێر مێزەکەمدا بەرماوەیان هەڵئەگرتەوە، جا من چیم کرد خواش وایکردەوە لێم). جا هێنایانە ئۆرشەلیم و لەوێ مرد (٧) وە کوڕەکانی یەهوزا شەڕی ئۆرشەلیمیان کرد، جا دەستیان بەسەریدا گرت وە بە زەبری شمشێر کوشتیانن وە شارەکەیان بە ئاگر سووتاند (٨) وە لە دوای ئەوە کوڕەکانی یەهوزا چوون شەڕی کەنعانییەکان بکەن کە لە شاخ و دەشت و دۆڵەکە بوون (٩) وە یەهوزا دەرچوو بۆ کەنعانییەکانی حیبرۆن، کە پێشتر ناوی قەریەت ئەربەع بوو، وە

لە شیشای و ئەحیمان و تیلماییان دا (١٠) وە لەوێوە کشان بۆ سەر خەڵکی دەبیر، وە ناوی دەبیر پێشتر قەریەت سەفەر بوو (١١) جا کالیب وتی: (هەرکەس لە قەریەت سەفەر بدات و بیگرێت ئەوا عەکسەی کچمی ئەدەمێ ببێت بە ژنی) (١٢) جا عەتنیئیل کوڕی قەناز بردی برای بچووکی کالیب، جا عەکسەی کچی دایە ببێت بە ژنی (١٣).

– وصعد آل يوسف أيضا إلى بيت إيل، وكان الرب معهم (٢٢) وتجسس آل يوسف بيت إيل (وكان اسم المدينة قبلا لوز) (٢٣) فرأى الجواسيس رجلا خارجا من المدينة. فقالوا له: ((دلنا على مدخل المدينة، فنصنع إليك رحمة)) (٢٤) فدلهم على مدخل المدينة، فضربوا المدينة بحد السيف. وأما الرجل، فأطلقوه هو كل عشيرته (٢٥) (القضاة / ١) وە بنەماڵەی یوسف چوونە سەر بەیت ئیل، وە خوا لەگەڵیان بوو (٢٢) وە بنەماڵەی یوسف سیخوڕییان بەسەر بەیت ئیلەوە کرد، وە ناوی شارەکە پێش ئەوە لەوز بوو (٢٣) جا سیخوڕەکان پیاوێکیان دی لە شارەکەوە دەرچوو. جا پێیان وت: (دەروازەی شارەکەمان پێ نیشان بدە، جا ئێمەش رەحمەت پێئەکەین) (٢٤) جا دەروازەی شارەکەی پێ وتن، جا بە زەبری شمشێر لە شارەکەیان دا. وە پیاوەکە خۆی و هۆزەکەیان ئازاد کرد (٢٥).

- وحارب أبيملك المدينة ذلك اليوم كله، واستولى على المدينة وقتل الشعب الذي فيها، ودمر المدينة وزرعها ملحا (٤٥) فسمع جميع أعيان مجدال شكيم، فذهبوا إلى سرداب بيت إيل بريت (٤٦) وأخبر أبيملك أن أعيان مجدال شكيم قد اجتمعوا (٤٧) فصعد أبيملك إلى جبل صلمون، هو وجميع القوم الذين معه، وأخذ أبيملك فأسا بيده وقطع غصنا من الشجر وحمله على عاتقه وقال للقوم الذين معه: ((ما رأيتموني أفعل فافعلوه أنتم سريعا)) (٤٨) فقطع جميع القوم الذين معه كل واحد غصنا، وتبعوا أبيملك ووضعوها على السرداب، وأحرقوا عليهم السرداب بالنار. فمات أيضا جميع أهل مجدال شكيم، نحو ألف نسمة من رجل وامرأة (٤٩) (القضاة / ٩) وە ئەبیمەلیك هەموو ئەو ڕۆژە شەڕی شارەکەی کرد، وە دەستی گرت بەسەر شارەکەدا وە خەڵکەکەی ناوی کوشت، وە شارەکەی ڕووخاند و بە خوێ دایپۆشی (٤٥) جا هەموو خەڵکی مجدال شەکیم ئەمەیان بیست جا چوونە قەڵایماڵی ئیل بەریت (٤٦) وە بە ئەبیمەلیك وترا کە هەموو خەڵکی مجدال شەکیم کۆبوونەتەوە (٤٧) جا ئەبیمەلیك چووە سەر چاخی صەلمۆن، ئەو و هەموو خەڵکەکەی لەگەڵیابوون، وە ئەبیمەلیك تەورێکی برد و لقێکی دارەکەی بڕی و خستییە سەر شانی، وە بە خەڵکەکەی لەگەڵیا بوون وت: (ئەوەی من کردم ئێوەش زوو بیکەن) (٤٨) جا هەموو خەڵکەکەی لەگەڵی

بوون هەريەكە لقێكى بڕى وە شوێن ئەبيمەليك كەوتن و خستيانە سەر قەلآكە، وە قەلآكەيان بە ئاگر بەسەردا سووتاندن. جا هەموو خەڵكى ميجدال شەكيم مردن، نزيكەى هەزار كەس لە پياو و ژن (٤٩).

— وضرب شاول بني عماليق من حويلة إلى شور التي قبالة مصر (٧) وأسر أجاج ملك بني عماليق حيا، وقتل شعبه جميعا بحد السيف (٨) وعفا شاول ورجاله عن أجاج، ولم يهلكوا خيرة الغنم والبقر والخراف، وكل ما كان جيدا، وإنما أهلكوا كل ما كان حقيرا هزيلا (٩) (صموئيل الأول / ١٥) وە شاول لە نەوەكانى عەماليقى دا لە حەويلەوە بۆ شور كە لە ڕۆژهەلآتى ميسرە (٧) وە ئوجاجى پاشاى بەنى عەماليقى گرت بە زيندوويى، وە گەلەكەيى كوشت بە زەبرى شمشێر (٨) وە شاول و پياوەكانى لە ئوجاج خۆشبوون، وە مەڕ و مانگا و دابەستە باشەكانيان نەفەوتاند، ئەوەى كە چاك بوون، بەڵكو ئەوانەى كە بێ نرخ و لاواز بوون لەناويانبرد (٩).

— فقال الملك لدواغ الأدومي: ((تقدم أنت واقتل الكهنة)). فتقدم دواغ وقتلهم وقتل في ذلك اليوم خمسة وثمانين رجلا لابسي أفود كتان (١٨) ثم ضرب شاول نوب، مدينة الكهنة، بحد السيف فسقط الرجال والنساء والأطفال والرضع والبقر والحمير والغنم (١٩) (صموئيل الأول / ٢٢) جا پاشا بە دواغى ئەدۆمى وت: (تۆ پێشكەوە و كاهينەكان بكوژە). جا دواغ

پێشکەوت و کوشتنی وە لەو ڕۆژەدا هەشتا و پێنج پیاوی کوشت کە ئـەفود کەتانیان لەبەردابوو (١٨) پاشان شاول لـە نـوبی دا شـاری کاهینـەکان بـە زەبری شمشێر، جا پیاو و ژن و منالّ و سـاوا و مـانگـا و کـەر و مالّاتـەکان مردن (١٩).

– وكان داود يصعد هو ورجاله ويغزون الجشوريين والجرزيين والعمالقة، لأن أولئك كانوا سكان الأرض من طالم جهة شور إلى أرض مصر (٨) وكان داود يضرب البلاد، فلا يبقي على رجل ولا امرأة، ويأخـذ الغـنم والبقـر والحمـير والجمـال والثياب، ويرجع إلى آكيش (٩) فيقول آكيش: "أين غـزوتم اليـوم؟ " فيقـول داود: "في نقب يهوذا ونقب اليرحمئيليين ونقب القينيين " (١٠) ولم يكـن داود يبقي رجل أو امرأة لـئلا يـأتي بهـم إلى جـت، قـائلا في نفسـه: " يخشـى أن يخبروا علينا ويقولوا: إن داود فعل كذا". وكان ذلك دأبه كل أيـام إقامتـه في ريف الفلسطينيين (١١) وكان آكيش يثق بداود ويقـول: "جعـل نفسـه ممقوتـا مقتا لدى شعبه إسرائيل، فصار لـي عبـدا للأبـد" (١٢) (صـموئيل الأول / ٢٧) جا داود خۆی و پیاوەکانی دەرئەچوون و غـەزای جەشـوری و جـیرزی و عەمالیقەکانیان ئەکرد، چونکە ئەوان خەڵکی زەوییەکە بوون لە تالیمەوە کە لەلای شورەوەیە تا زەوی میسر (٨) وە داود لە ناوچـەکانی ئـەدا، وە هـیچ پیاو و ژنێکی نەئەهێشتەوە، وە مەڕ و مانگا و کەر و حوشتر و جلی ئەبرد

و ئەگەڕایەوە لای ئاکیش (٩) جا ئاکیش ئەیوت: "ئەمڕۆ غەزای کوێتان کرد؟" داودیش ئەیوت: "بیابانی یەهوزا و بیابانی یەرحەمئیلییەکان و بیابانی قینییەکان" (١٠) وە داود هیچ پیاو و ژنێکی نەئەهێشتەوە تا بیانهێنێت بۆ جیت، وە لە ناخیدا ئەیوت: "ئەترسا هەواڵ لەسەری بدەن و بڵێن: داود ئاوای کرد". وە ئەوە کاری بوو هەموو ڕۆژەکان کە لە خاکی فەلەستینییەکان بوو (١١) وە ئاکیش متمانەی بە داود بوو وە ئەیوت: "داود خۆی لەلای گەلی ئیسرائیل قێزەون کردووە، بۆیە تا هەتایە بووە بە کۆیلەم" (١٢).

– أما أعدائي أولئك الذين لم يريدوني ملكا عليهم، فأتوا بهم إلى هنا، واضربوا أعناقهم أمامي (لوقا ١٩/ ٢٧) ئەمما دوژمنەکانم ئەوانەی کە نەیانویستووە من ببمە پاشا بەسەریانەوە، ئا بیانهێننە ئێرە، وە لەبەردەمما لە ملیان بدەن.

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا (١٥) وَإِذَآ أَرَدۡنَآ

أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا (١٦) (الإسراء) کێ هیدایەت وەرگرێت ئەوا بۆخۆی هیدایەت وەرئەگرێت، وە کێ گومڕابێت خراپەکەی بۆ خۆیەتی، وە هیچ کەسێك تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت، وە سزای هیچ قەومێك نادەین تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین (١٥) وە گەر بمانەوێت شارێك لەناوببەین فەرمان بە گەورەکانیان ئەکەین بە تەوحید بەڵام خراپە و شیرکی تیا ئەکەن، جا ئەوکاتە فەرمان بەسەریاندا جێبەجێ ئەبێت و لەناویان ئەبەین (١٦) ﴾.

+ ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ (البقرة - ٢١٣) خەڵکی یەك ئوممەت بوون جا خوا پێغەمبەرانی نارد مژدەدەر و ترسێنەر وە لەگەڵیاندا کتێبی دابەزاند بە حەق تا حوکم بکات لەنێوان خەڵکدا لەوەی تیای ڕاجیان، وە کەس ڕاجیانەبوو لەو کتێبانەدا مەگەر ئەوانەی بۆیانهاتووە لەدوای ئەوەی ڕوونکردنەوەیان بۆهات لە حەسوودی خۆیاندا، جا خوا ئەوانەی هیدایەتدا کە ئیمانیان هێنابوو لەوەی کە ڕاجیابوون بۆ حەق بە ئیزنی خۆی، وە خوا کێی بوێت هیدایەتی ئەدات بۆ ڕێگای ڕاست ﴾.

+ ﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا (١٦٣) وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا (١٦٤) رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا (١٦٥) (النساء) ئێمە وەحیمان بۆ تۆ ناردووە وەك کە وەحیمان نارد بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای، وە وەحیمان نارد بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و هۆزەکانی نەوەی یەعقوب و عیسا و ئەیوب و یونس و هارون و سولەیمان، وە زەبورمان دا بە داود (١٦٣) وە پێغەمبەرانێك کە بۆمان باسکردوویت پێشتر وە پێغەمبەرانێك کە بۆمان باسنەکردوویت، وە خوا قسەی لەگەڵ موسادا کرد بە حەقیقەت (١٦٤) پێغەمبەرانێك مژدەدەر و ترسێنەر تا بۆ ئینسانەکان هیچ بەهانەیەك نەبێت لەسەر خوا لە دوای پێغەمبەران، وە خوا بە عیززەت و دانایە (١٦٥) ﴾.

+ ﴿ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۖ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (الأنعام - ٤٨) وە پێغەمبەران نانێرین مەگەر مژدەدەر و ترسێنەرن، جا هەرکەس ئیمان بێنێت و چاکسازی بکات ئەوا ترسیان لەسەر نییە و نە خەفەتیش ئەخۆن ﴾.

+ ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّهُمۡ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ قُبُلٗا (٥٥) وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا (٥٦) وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۖ وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا (٥٧) وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا (٥٨) وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا (٥٩) (الكهف) چی ڕێگری لە خەڵك كرد كە ئیمان بێنن كاتێك هیدایەتیان بۆ هات وە تۆبەی پەروەردگاریان بكەن ئەوە نەبێت كە ئەو داب و نەریتەیان بۆ بێت كە بۆ ئوممەتانی پێشتریان هات یان عەزابیان بۆ بێت لە پێشیانەوە (٥٥) وە پێغەمبەران نانێرین مەگەر بە مژدەدەر و ترسێنەر، وە كافران موجادەلە ئەكەن بە بەتاڵ تا حەقی پێ پووچەڵ بكەنەوە، وە ئایەتەكانم و هەڕەشەكانم بە گاڵتە ئەگرن (٥٦) وە كێ لەوە زاڵمترە كە بە ئایەتەكانی پەروەردگاری ئاگاداركراوەتەوە جا ڕووی لێ وەرگێڕاوە و ئەو حەرامانەی ئەنجامیداون لەبیریچووە، ئێمە پەردەمان داوە بەسەر دڵیاندا كە نەتوانن تێیبگەن وە گوێیشمان گرانكردوون، وە گەر بانگیان بكەیت بۆ هیدایەت ئەوا هەرگیز

هیدایەت وەرناگرن (٥٧) وە پـەروەردگارت لێبووردەیـە و خـاوەن رەحمەتـە، گەر بەوە لەگەڵیان بجوولێتەوە کە کردوویانـە ئـەوا سـزای بـۆ پێشئەخسـتن، بەڵکو مەوعیدێکیان هەیە کـە هـیچ پەنایـەکیان نییـە لێـی (٥٨) وە ئـەو شارانەمان لەناوبرد کاتێك ستەمیان کـرد وە کاتمـان دانـا بـۆ لـەناوبردنیان (٥٩) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ (یـونس - ١٣) وە ئومـەتانی پێش ئێوەمان لەناوبرد کاتێك ستەمیان کرد وە پێغەمبەرانیان بـە بەڵگـەی ڕوونەوە هاتن بۆ لایـان، وە ئیمانیـان نـەهێنا، بـەو جـۆرە پاداشـتی گـەلی تاوانبار ئەدەینەوە ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمۡنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيۡنَا نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (الروم - ٤٧) وە پێش تـۆ پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ گەلەکانیان جا بـە بەڵگـەوە چـوون بـۆ لایـان جـا تۆڵەمان سـەند لەوانـەی تاوانیـان کـرد، وە حەقـە لەسـەرمان سەرخسـتنی ئیمانداران ﴾.

+ ﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ

وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ (٢١) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم
بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ (٢٢) (غافر) ئایا
بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون جا سەیربکەن سەرئەنجامی ئەوانەی پێش ئەوان
چۆن بوو، لەوان بەهێزتر بوون و زەویشیان ئاوەدانکردبووەوە، جا خوا بە
تاوانەکانیان بردنی، وە هیچ پارێزەرێکیان نەبوو لە خوا (٢١) ئەوە بەهۆی
ئەوەوە بوو پێغەمبەرانیان بە بەڵگەی ڕوونەوە ئەهاتن بۆ لایان جا
کوفریانکرد و خواش بردنی، ئەو بەهێزە و ئەشکەنجەشی توندە (٢٢) ﴾.

+ ﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا
كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٨٣) فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ
وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ (٨٤) فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ
سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ (٨٥) (غافر)
جا کاتێك پێغەمبەرانیان بە بەڵگەوە هاتن بۆ لایان بەو زانستە دڵخۆشبوون
کە لایانبوو، وە ئەو سزایە گرتنیەوە کە گاڵتەیان پێئەکرد (٨٣) وە کاتێك
سزاکەمانیان دی وتیان باوەڕمان بە خوا هەیە بەتەنیا و کافرین بەوەی
کردبوومان بە شەریکی (٨٤) بەڵام ئیمانیان سوودی بۆیان نەبوو کاتێك
سزاکەمانیان بینی، ئەمە سوننەتی خوایە کە لەناو بەندەکانیدا وابووە، وە
لەوێدا کافران دۆڕان (٨٥) ﴾.

+ ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ (٤٩) قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ (٥٠) إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ (٥١) (غافر) وە ئەوانەی لە ئاگردان بە دەرگاوانەکانی جەهەننەمیان وت بانگی پەروەردگارتان بکەن ڕۆژێك سزامان لەسەر سووك بکات (٤٩) وتیان ئەی پێغەمبەرانتان بەڵگەیان بۆتان نەهێنا، وتیان بەڵێ، وتیان دەی خۆتان داوا بکەن، وە داوای کافران تەنها لە فەوتاندایە (٥٠) ئێمە پێغەمبەرانمان سەرئەخەین وە ئەوانەی ئیماندارن لە ژیانی دنیا وە ڕۆژێك کە شایەتەکان هەڵئەستن (٥١) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ (النحل - ٣٦) وە لە هەموو ئۆمەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە کە الله بپەرستن و خۆتان لە تاغوت بپارێزن، جا هەیانە خوا هیدایەتی دا و هەشیانە گومڕایی گرتوویەتییەوە، جا بەناو زەویدا برۆن و سەیربکەن سەرئەنجامی بەدرۆخەرەوەکان چۆن بوو ﴾.

+ ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (إبراهيم - ٤) وە

پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر بە زمانی گەلەکەی تا بۆیان ڕوونبکاتەوە، جا خوا کێی بوێت گومڕای ئەکات و کێی بوێت هیدایەتی ئەدات، وە ئەوە بەدەسەڵات و کاربەجێ ﴾.

+ ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ (الحديد - ٢٥) ئێمە پێغەمبەرانمان بە بەڵگەی ڕوونەوە نارد وە لەگەڵیان کتێب و تەرازوومان دابەزاند تا خەڵك بە دادپەروەری کاریان بڕوات، وە ئاسنمان دابەزاند کەرەستەی جەنگی پێ دروستئەکرێت و سوودی تیایە بۆ خەڵك، وە تا خوا بزانێت کێ خۆی و پێغەمبەرەکانی سەرئەخات بە نهێنی، بەڕاستی خوا بەهێز و باڵادەستە ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ (١) قُمۡ فَأَنذِرۡ (٢) (المدثر) ئەی ئەو کەسەی خۆتت داپۆشیوە (١) هەستە خەڵك ئاگادار بکەرەوە (٢) ﴾.

+ ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ (النحل - ١٢٥) بانگەواز بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە دانایی وە ئامۆژگاری جوان، وە گفتوگۆیان بکە بەوەی کە باشترینە، پەروەردگارت

زاناترە بەوەی کە لە ڕێگاکەی لایداوە، وە ئەو زاناترە بە هیدایەتدراوەکان ﴾.

+ ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ (التوبة - ٦) وە گەر یەکێك لە موشریکەکان مۆڵەتی لێ وەرگرتیت ئەوا مۆڵەتی بدە هەتا گوێبیستی قسەی خوا ئەبێت، پاشان بیگەیەنە جێی ئەمینی، ئەوە چونکە ئەوان قەومێکن نازانن ﴾.

+ ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ (٩٨) قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٩٩) (آل عمران) بڵێ ئەی خاوەنانی کتێب بۆچی کافرن بە ئایەتەکانی خوا وە خوا ئاگادارە بەوەی ئەیکەن (٩٨) بڵێ ئەی خاوەنانی کتێب بۆچی ڕێ ئەگرن لە ڕێبازی خوا ئەوەی ئیمان بهێنێت ئەتانەوێت خوار بێت وە خۆتان حەق ئەزانن، وە خوا بێ ئاگا نییە لەوەی کە ئەیکەن (٩٩) ﴾.

+ ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ (٧٢) لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟

إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٧٣) أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٧٤) مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ (٧٥) قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (٧٦) قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ (٧٧) (المائدة) ئەوانە كوفریانكرد كە وتیان خوا مەسیحی كوڕی مەریەمە، وە مەسیح وتی ئەی بەنی ئیسرائیل الله بپەرستن خوای من و ئێوە، بەڕاستی ئەوەی شەریك بۆ خوا دابنێت ئەوا خوا بەهەشتی لێ حەرام كردووە و جێگەی ئاگرە، وە ستەمكاران پشتیوانیان نییە (٧٢) ئەوانە كوفریانكرد كە وتیان خوا سێیەمینی سیانە، وە هیچ خوایەك نییە جگە لە یەك خوا، وە گەر وازنەهێنن لەوەی كە ئەیلێن ئەوا سزایەكی گەورە بەر كافرەكانیان ئەكەوێت (٧٣) ئەوە بۆ تۆبەی خوا ناكەن و داوای لێخۆشبوونی لێناكەن، وە خوا لێبووردە و بەرەحمە (٧٤) مەسیحی كوڕی مەریەم هیچ نییە جگە لە پێغەمبەرێك كە پێش ئەو پێغەمبەری تر هاتووە وە دایكیشی ڕاستگۆیە، هەردووكیان خواردنیان ئەخوارد، سەیركە چۆن ئایەتەكانیان بۆ

ڕوونئەکەینەوە پاشان سەیرکە چۆن لە حەق لائەدەن (٧٥) بلّێ ئایا جگە لـە
خوا ئەوە ئەپەرستن کە نە زەرەری بۆتان هەیـە نـە سـوود، وە خـوا خۆیـەتی
بیسەر و زانا (٧٦) بلّێ ئەی خاوەنانی کتێب زیادەڕەوی مەکەن لە دینتانـدا
بە غەیری حەق، وە شوێن هەوای کەسانێك مەکەون کە پێشتر گومڕا بوون و
زۆرێکیان گومڕا کرد وە لە ڕێی ڕاست وێڵ بوون (٧٧) ﴾.

+ ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ
(٥٩) أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا
بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ بَلْ هُمْ
قَوْمٌ يَعْدِلُونَ (٦٠) أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ
لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا
يَعْلَمُونَ (٦١) أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ
خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ (٦٢) أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى
ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ أَءِلَٰهٌ مَّعَ
ٱللَّهِ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٦٣) أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن
يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ (٦٤) قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَمَا
يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ (٦٥) بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ
مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ (٦٦) وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ

أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ (٦٧) لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ
أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ (٦٨) قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ
ٱلْمُجْرِمِينَ (٦٩) وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ
(٧٠) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٧١) قُلْ عَسَىٰٓ أَن
يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ (٧٢) وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ (٧٣) وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ
صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ (٧٤) وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِي
كِتَٰبٍ مُّبِينٍ (٧٥) (النمل) بڵێ حەمد و سوپاس بۆ الله وە سەلام لەو
عەبدانەی کە هەڵیبژاردوون، ئایا الله باشترە یان ئەوانەی کە کردوویانن بە
شەریکی (٥٩) ئایا کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە وە لە ئاسمانەوە
ئاوی بۆ دابەزاندوون جا پێی باخاتی ڕازاوەمان ڕوواندووە کە ئێوە
نەتانئەتوانی بیڕوێنن، ئایا خوا هەیە لەگەڵ ألله دا، بەڵکو ئەوانە قەومێکن
لە حەق لائەدەن (٦٠) ئایا کێ زەوی جێگیرکردووە وە لەناویدا ڕووباری
داناوە وە شاخی بۆ داناوە وە لەنێوان دوو دەریاکەدا بەربەستی داناوە، ئایا
خوای تر هەیە لەگەڵ ألله دا، بەڵکو زۆربەیان نازانن (٦١) ئایا کێ وەڵامی
ناچار ئەداتەوە کە بانگی بکات وە خراپە هەڵئەگرێت وە ئەتانکات بە
جێنشینی زەوی، ئایا خوای تر لەگەڵ الله دا هەیە، کەم بیرئەکەنەوە (٦٢)

کێ ڕێنماییتان ئەکات لە تاریکایی وشکانی و دەریادا وە کێ با ئەنێرێت وەکو مژدە بە ڕەحمەتی، ئایا خوا هەیە لەگەڵ الله دا، خوا بڵندە لەوەی ئەیکەن بە شەریکی (٦٣) کێیە سەرەتا دروستکراوەکان دروستئەکات و دواتر ئەیانگێڕێتەوە، وە کێیە رزقتان ئەدات لە ئاسمان و زەوی، ئایا خوا هەیە لەگەڵ الله دا، بڵێ بەڵگەکانتان بێنن گەر ڕاستگۆن (٦٤) بڵێ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە غەیب و داهاتوو نازانێت جگە لە الله، وە ئەوانەی بانگەشەی غەیب ئەکەن نازانن خۆیان کەی خوا زیندوویانئەکاتەوە (٦٥) بەڵکو زانیارییان دەستەوسانە لە زانینی کاتی قیامەت، بەڵکو لە گوماندان تیای بەڵکو لێی کوێرن (٦٦) وە کافران وتیان ئایا گەر ببین بە خۆڵ وە باوانیشمان ئایا ئێمە دەرئەهێنرێینەوە (٦٧) ئێمە و باوانمان وەعدی ئەوەمان پێدرا لە پێشترا، ئەمە تەنها سەرگوزشتەی ئومەتانی پێشترە (٦٨) بڵێ بەناو زەویدا بگەڕێن جا سەیربکەن سەرئەنجامی تاوانباران چۆن بوو (٦٩) وە خەفەتیان لێ مەخۆ وە لە دڵتەنگیدا مەبە لەو فێڵەی ئەیکەن (٧٠) وە ئەڵێن ئەم وەعدە کەیە گەر ڕاستگۆن (٧١) بڵێ بەڵکو ئەو سزایەی پەلەتانە بۆی نزیك بێت (٧٢) وە پەروەردگارت خاوەن فەزڵە بەسەر خەڵکەوە بەڵام زۆربەیان سوپاس ناکەن (٧٣) وە پەروەردگارت ئەزانێت سنگیان چی

شاردووەتەوە وە چی ئاشکرا ئەکەن (٧٤) وە هیچ شاردراوەیەك نییە لە ئاسمان و زەوی ئیللا لە کتێبێکی ئاشکرادا نوسراوە (٧٥) ﴾.

+ ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ (٧٧) وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ (٧٨) قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ (٧٩) ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ (٨٠) أَوَلَيْسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ (٨١) إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (٨٢) فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٨٣) (يس) ئایا ئینسان نەیدیوە کە ئێمە لە تۆوێك دروستمانکردووە جا ئەو زۆر دوژمنایەتی ئەکات و ڕوونە لە گفتوگۆ (٧٧) وە نموونەی بۆمان هێنایەوە و دروستکردنی خۆی بیرچووەوە، وتی کێ ئێسقان زیندووئەکاتەوە لەکاتێکا ڕزیوە (٧٨) بلێ ئەوە زیندووی ئەکاتەوە کە یەکەمجار دروستیکردووە وە ئەو زانایە بە هەموو دروستکراوێك (٧٩) ئەوەی کە لە درەختی سەوزەوە ئاگری بۆتان دروستکردووە جا ئێوە لێوەی ئاگر ئەکەنەوە (٨٠) ئایا ئەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ناتوانێت هاوشێوەیان دروستکات، بەڵێ وە ئەو زۆر دروستکەرە و زانایە (٨١) فەرمانەکەی بەو شێوەیەیە کە شتێکی بوێت کە

پێی بڵێت ببە جا ئەبێت (٨٢) جا پاکی بۆ ئەوەی موڵکی هەموو شتێکی
بەدەستە و بۆ لای ئەو ئەگەڕێنرێنەوە (٨٣) ﴾.
+ ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ
وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠) وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ
رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ (٣١) وَجَعَلْنَا
ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ (٣٢) وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ
ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٣٣) وَمَا جَعَلْنَا
لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ (٣٤) كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ
ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ (٣٥) وَإِذَا رَءَاكَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ
ٱلرَّحْمَٰنِ هُمْ كَٰفِرُونَ (٣٦) خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ ۚ سَأُو۟رِيكُمْ ءَايَٰتِى فَلَا
تَسْتَعْجِلُونِ (٣٧) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٣٨) لَوْ يَعْلَمُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا
هُمْ يُنصَرُونَ (٣٩) بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ
يُنظَرُونَ (٤٠) وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنْهُم
مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ (٤١) قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ۗ
بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ (٤٢) أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا ۚ لَا

يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ (٤٣) بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ (٤٤) قُلۡ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلۡوَحۡيِۚ وَلَا يَسۡمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ (٤٥) (الأنبياء) ئایا کافرەکان نەیاندیوە کە ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون و جیامانکردنەوە، وە لە ئاو هەموو شتێکی زیندوومان دروستکردووە، ئایا ئیمان ناهێنن (٣٠) وە لە زەویدا شاخمان داناوە تا جێگیربێت، وە تیایا ڕێڕەومان داناوە تا پیا تێپەڕن بەڵکو ڕێی بەرژەوەندییان بدۆزنەوە (٣١) وە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو، وە ئەوان لە نیشانەکانی پشتئەکەن (٣٢) وە ئەوە خوایە کە شەو و ڕۆژی دروستکردووە وە خۆر و مانگیش، هەموو لە ڕێڕەوی خۆیاندا مەلە ئەکەن (٣٣) وە نەمریمان نەداوە بە هیچ مرۆڤێك پێش تۆ، ئایا گەر بمریت ئەوان نەمرن (٣٤) هەموو نەفسێك مردن ئەچێژێت، وە بە شەڕ و خێر تاقیتانئەکەینەوە وە بۆ لامان ئەگەڕێنەوە (٣٥) وە گەر کافران بتبینن ئەتکەن بە گاڵتە، ئایا ئەمە ئەوەیە کە باسی خواکانتان ئەکات، وە ئەوان بە خوای بەرەحم کافرن (٣٦) مرۆڤ لە پەلەپەل دروستکراوە، موعجیزەکانمتان نیشان ئەیەم جا پەلەم لێمەکەن (٣٧) وە ئەڵێن ئەم بەڵێنە کەیە گەر ڕاستئەکەن (٣٨) گەر کافران بیانزانیایە کاتێك کە ئاگر لە

دەموچاویان دوورناخەنەوە وە نە لە پشتیشیان وە سەرناخرێن وایان نەئــەوت (٣٩) بەڵکو لەپڕ بۆیان دێت جا سەرسامیان ئەکات، جا ناتوانن بیگێڕنــەوە وە مۆڵەتیشیان نادرێ (٤٠) وە گاڵتە کرا بە پێغەمبەرانێك لە پــێش تــۆدا، جا ئەوانــەی کــە گاڵتــەیان ئــەکرد ســزای خــوا گرتنیــەوە (٤١) بڵــێ کــێ ئەتانپارێزێت بە شەو و ڕۆژ لە ڕەحمان، بەڵکو ئەوان پشت ئەکەنە یادی خــوا (٤٢) ئایا خوایانێکیان هەیە کە ڕێمان لێبگرن، ناتوانن خۆیان ســەرخەن وە لە سزامان ناپارێزرێن (٤٣) بەڵکو ئەوانە و باوانیانمان ژیاند بــە نیعمەتــەوە هەتا تەمــەنیان درێــژبوو، ئایــا نــابینن کــەوا زەوی لــە لاکانییــەوە تەســك ئەکەینەوە، ئایا ئەوان زاڵ و سەرکەوتوون (٤٤) بڵێ مــن تــەنها بــە وەحــی ئاگادارتان ئەکەمەوە، وە کەڕ گــوێی لــە بــانگکردن نییــە کاتێــك ئاگــادار ئەکرێن (٤٥) ﴾.

+ ﴿ وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوۡاْ إِلَىٰ قَوۡمِهِم مُّنذِرِينَ (٢٩) قَالُواْ يَٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ (٣٠) يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ (٣١) وَمَن لَّا يُجِبۡ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيۡسَ بِمُعۡجِزٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَيۡسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءُۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ

(٣٢) أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَلَمۡ يَعۡيَ بِخَلۡقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (٣٣) (الأحقاف) وە کە کۆمەڵێك جنیمان بۆ ناردیت گوێبیستی قورئان بوون، جا کاتێك ئامادەی بوون وتیان گوێبگرن، جا کە تەواو بوو گەڕانەوە بۆ لای قەومەکەیان ئاگاداریان کردنەوە (٢٩) وتیان ئەی قەومەکەمان ئێمە گوێمان لە کتێبێك بوو دوای موسا دابەزیوە بەڕاستدانەری ئەوانەی پێش خۆیەتی، ڕێنوێنی ئەکات بۆ حەق وە بۆ ڕێگایەکی ڕاست (٣٠) ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی خوا بدەنەوە و ئیمانی پێ بێنن، خواش لە گوناحتان خۆشئەبێت وە ئەتانپارێزێت لە سزایەکی بەئێش (٣١) وە هەرکەس وەڵامی بانگخوازی خوا نەداتەوە ئەوا لە زەویدا ڕزگاری نابێت وە بەبێ خوا پشتیوانی نییە، ئائەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان (٣٢) ئایا نەیانبینیوە کە ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە و لاواز نەبووە بە دروستکردنیان بەتوانایە کە مردووان زیندوو بکاتەوە، بەڵێ ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە (٣٣) ﴾.

+ ﴿ وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١١١) بَلَىٰۚ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (١١٢)

(البقرة) وە وتیـان کـەس ناچـێتە بەهەشـتەوە جگـە لـەوەی یـەهودی یـان نەصرانی بێت، ئەوە هیوایانە، بڵێ بەڵگەکەتان بێنن گەر ڕاستئەکەن (١١١) بەڵێ، هەرکەس ڕووی تەسلیمی خوا بکات وە چاکەکار بێت ئـەوا پاداشـتی هەیە لای پەروەردگاری وە ترسیان لەسەر نییـە وە ئـەوان خەفـەتباریش نـین (١١٢) ﴾.

+ ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ ۖ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِيۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّ ۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ (الأنبيـاء - ٢٤) یان جگە لەو خوای تریان بڕیارداوە، بڵێ بەڵگەتان بێنن، ئەمە ئامۆژگارییـە بۆ ئەوانەی لەگەڵمن وە کتێبەکانی تریش ئامۆژگاری خـەڵکی پـێش مـنن، بەڵکو زۆربەیان حەق نازانن جا پشتی تێئەکەن ﴾.

+ ﴿ إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖ وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلۡمُسَخَّرِ بَيۡنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ (البقـرة - ١٦٤) بەدڵنیایی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی وە جیاوازی شەو و ڕۆژ وە ئەو کەشتییەی بە دەریادا ئەڕوات بەوەی سوودی بۆ خەڵك هەیـە وە ئـەو ئاوەی خوا لە ئاسمانەوە دایئەبەزێنێت جا زەوی پێ ژیاندەوە دوای مردنـی وە

تیایا بڵاویکردووەتەوە لــە هــەموو ئاژەڵێــك وە نــاردنی بایــەکان وە هــەورە ژێربارکراوەکان لەنێوان ئاسمان و زەوی نیشانە و بەڵگــە هەیــە بــۆ قــەومێك عەقڵیان هەبێت ﴾.

+ ﴿ الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ (١) ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ (٢) وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٣) وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ (٤) وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٥) (الرعد) ئـەليف لام مـيم را، ئەوانە ئایەتەکانی قورئانن، وە ئـەوەی لــە پەروەردگارتــەوە بــۆت دابــەزیوە حەقە، بەڵام زۆربــەی خــەڵك ئیمــان نــاهێنن (١) الله ئەوەیــە کــە ئاسمــانی بەرزکردووەتەوە بەبێ کۆڵەکە و ئەیبینن، پاشان بەرزبووەوە بۆ سەر عــەرش، وە خۆر و مانگی ژێربار کردووە، هەریەکە ئەڕۆن تا کــاتی دیــاریکراو، کــار

بەڕێوەئەبات ئایەتەکان ڕوونئەکاتەوە بەڵکو بە بینینی پەروەردگارتان دڵنیا بن (٢) وە ئەوە کە زەوی درێژکردووە وە تیایا شاخی داناوە و ڕووباریش، وە لە هەموو بەرەکان نێر و مێی دروستکردووە، شەو ڕۆژ دائەپۆشێت، ئا لەوانەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە (٣) وە لە زەویدا پارچەی لێك نزیك هەن وە باخاتی ترێ و کشتوکاڵ و خورما لێکچوو وە جیاواز بە یەك ئاو ئاوئەدرێن، وە فەزڵی هەندێکیان ئەدەین بەسەر هەندێکیاندا لە خواردندا، ئا لەوانەدا نیشانە هەیە بۆ قەومێك عاقڵبن (٤) وە گەر پێت سەیربێت ئەوا قسەکەی ئەوان سەیرە، ئایا گەر خۆڵ بین ئەوا دیسان دروستئەکرێینەوە، ئەوانە ئەوانەن کە بە پەروەردگاریان کافرن، وە ئەوانەن کە کۆت لە ملیاندایە، وە ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن ئەوان تیایا نەمرن (٥) ﴾.

+ ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ (٥٩) قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ (٦٠) قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٦١) أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ (٦٢) أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ (٦٣) فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ (٦٤) وَإِلَىٰ عَادٍ

أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٦٥)
قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ
ٱلۡكَٰذِبِينَ (٦٦) قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
(٦٧) أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ (٦٨) أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ
ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡۚ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ
بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمۡ
تُفۡلِحُونَ (٦٩) قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا
فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ (٧٠) قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ
رِجۡسٞ وَغَضَبٌۖ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ
ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ (٧١) فَأَنجَيۡنَٰهُ
وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ
مُؤۡمِنِينَ (٧٢) وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ
إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ
فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٧٣) وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ
جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا
قُصُورٗا وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
مُفۡسِدِينَ (٧٤) قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ
لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ
بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ (٧٥) قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ

(٧٦) فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ
إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٧٧) فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ
جَٰثِمِينَ (٧٨) فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ
لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ (٧٩) وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ
ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٨٠) إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ
شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ (٨١) وَمَا كَانَ جَوَابَ
قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوهُم مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ (٨٢)
فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ (٨٣) وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم
مَّطَرٗاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ (٨٤) وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ
قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ
فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٨٥) وَلَا تَقۡعُدُواْ
بِكُلِّ صِرَٰطٖ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبۡغُونَهَا
عِوَجٗاۚ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمۡۖ وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ
(٨٦) وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ
فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ (٨٧) قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ
ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ
أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ (٨٨) قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا
إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ

أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ
بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ (٨٩) وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ (٩٠) فَأَخَذَتۡهُمُ
ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ (٩١) ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ
يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٩٢) فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ
وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ
كَٰفِرِينَ (٩٣) وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ
وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ (٩٤) ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ
عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا
يَشۡعُرُونَ (٩٥) وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ (٩٦)
(الأعراف) نوحمان نارد بۆ قەومەکەی جا وتی هۆ قەومەکەم بەس خوا
بپەرستن هیچ خوایەکتان نییە غەیری ئەو، من ئەترسم لەسەرتان لە سزای
ڕۆژێکی مەزن (٥٩) سەرۆکەکانی قەومەکەی وتیان ئێمە لە گومڕاییەکی
ڕووندا تۆ ئەبینین (٦٠) وتی ئەی قەومەکەم گومڕا نیم بەڵکو نێردراوی
پەروەردگاری جیهانیانم (٦١) پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێئەگەیەنم و
نەسیحەتتان ئەکەم، وە لە خواوە ئەوە ئەزانم کە ئێوە نایزانن (٦٢) ئایا
بەلاتانەوە سەیرە وەحییەك لەلای پەروەردگارتانەوە بۆتان بێت لەسەر پیاوێك

لەخۆتان تا ئاگادارتان بکاتەوە و ئێوەش لە خوا بترسن بەڵکو رەحمتان پێبکرێت (٦٣) جا بەدرۆیانخستەوە وە ڕزگارمانکرد و ئەوانەشی لەگەڵیابوون لە کەشتییەکەدا، وە ئەوانەی ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە نوقممانکردن، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی کوێربوون لە ئاست حەق (٦٤) وە بۆ قەومی عاد هودمان نارد لەخۆیان، وتی قەومەکەم الله بپەرستن هیچ خوایەکتان نییە جگە لەو، ئایا تەقوای خوا ناکەن (٦٥) دەسەڵاتدارانی قەومەکەی وتیان ئێمە تۆ لە گێلیدا ئەبینین وە ئێمە وا گومان ئەبەین لە درۆزنان بیت (٦٦) وتی ئەی قەومەکەم گێلی و نەفامیم نییە بەڵکو من پێغەمبەرم لە پەروەردگاری هەموو جیهانەوە (٦٧) پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ئەگەیەنم وە من بۆ ئێوە نەسیحەتکەر و جێ متمانەم (٦٨) ئایا سەیرتان لێدێت کە لەلای پەروەردگارتانەوە وەحیتان بۆ هاتووە بۆ سەر پیاوێك لەخۆتان تا ئاگادارتان بکاتەوە، وە بیرتانبێت کە ئێوەی کردووە بە جێنشین لە دوای قەومی نوح و لە لاشەتاندا زیاتر گەورەی کردوون، جا یادی نیعمەتەکانی خوا بکەن بەڵکو سەرفراز بن (٦٩) وتیان ئایا هاتوویت کە بەتەنیا خوا بپەرستین و واز لەوە بێنین کە باوانمان ئەیانپەرست، دەی ئەو سزایەمان بۆ بێنە کە بەڵێنمان پێ ئەدەیت گەر لە ڕاستگۆکانیت (٧٠) وتی بەدڵنیایی سزا و تووڕەیی خواتان بەسەردا ئەبارێت، ئایا مشتومڕم ئەکەن لە

چەند ناوێکدا کە خۆتـان و باوانتـان ناوتـان نـاون کـە خـوا هـیچ بەڵگـەی لەسەریان دانەبەزانـدووە، جـا چـاوەڕێی سـزا بکـەن منـیش لەگـەڵتان لـە چاوەڕوانەکانم (٧١) جا ڕزگارمان کرد خـۆی و ئەوانـەی لەگـەڵیا ئیمانیـان هێنابوو بە رەحمەتێك لەئێمەوە، وە ئەوانـەی ئایەتـەکانمانیان بەدرۆخسـتەوە ڕیشەکێشمانکردن، وە لە ئیمانداران نەبوون (٧٢) وە بـۆ ثـەمـود صـالحمان نارد لەخۆیان، وتی ئەی قەومەکەم الله بپەرستن هیچ خوایەکتان نییـە جگـە لەو، بەدڵنیایی بەڵگەی ڕوونتـان بـۆ هـاتووە لـە پەروەردگارتانـەوە، ئەمـە حوشترێکە کە خوا بۆتانی ناردووە وەك بەڵگە، جـا لێیگـەڕێن بـا لـە زەوی خوادا بلەوەڕێت وە زەرەری لیّ مەیەن چـونکە سـزایەکی بـەئازار ئـەتانبات (٧٣) وە بیرتانبێت کە خوا لەدوای قەومی عاد کردتانی بە جێنشـین وە لـە زەویدا جێگیری کردن، لە دەشـتاییەکەی کۆشـك دروسـتئەکەن و شـاخەکان هەڵئەکۆڵن و ئەیکەن بەماڵ، جا نیعمەتەکانی خواتان بیربێت وە لە زەویـدا ئاژاوە مەنێنەوە (٧٤) دەسەڵاتدارانی قەومەکەی کە لوتبەرز بوون بەوانەیان وت کە بێدەسەڵات بوون لەوانەی ئیمانیان پێی هێنابوو ئایا ئەزانن کە صالح پێغەمبەرە لە خواکەیەوە، وتیان ئێمە ئیمانمان هەیە بـەوەی پێـی نێـردراوە (٧٥) ئەوانەی خۆیان بە گەورە ئەزانی وتیان ئێمە کافرین بـەوەی ئیمانتـان پێی هەیە (٧٦) جا حوشترەکەیان سەربڕی و سەرکەشییان کرد لـە فـەرمانی

پەروەردگاریان وە وتیان ئەی صالح ئەوەمان بێنە سەر کە بەڵێنمان پێ ئەدەیت گەر لە نێردراوانیت (٧٧) جا لەرزەی زەوی بردنی جا لە ماڵەکانیاندا نوسان بە زەوییەوە (٧٨) جا وازی لێهێنان و وتی ئەی قەومەکەم پەیامی پەروەردگارمم پێ گەیاندن و نەسیحەتم کردن بەڵام نەسیحەتکەرتان خۆشناوێت (٧٩) وە لوط کاتێك بە قەومەکەی وت ئایا ئێوە بەدڕەوشتییەك ئەکەن کە پێش ئێوە کەس نەیکردووە لە جیهانیان (٨٠) ئێوە دێنە لای پیاو بە شەهوەت بە وازهێنان لە ئافرەت، بەڵکو ئێوە قەومێکی زیادەڕەون (٨١) وە وەڵامی قەومەکەی هیچ نەبوو جگە لەوەی وتیان لە شارەکەتان دەریانکەن، ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕائەگرن (٨٢) جا خۆی و کەسوکاریمان ڕزگارکرد جگە لە ئافرەتەکەی ئەو لە تیاچووەکان بوو (٨٣) وە بەردبارانمان کردن، جا تەماشاکە سەرئەنجامی تاوانباران چۆن بوو (٨٤) وە بۆ مەدیەن شوعەیبی برایانمان نارد، وتی ئەی قەومەکەم ألله بپەرستن هیچ خوایەکتان نییە جگە لەو، بەڵگەی ڕوونتان بۆ هاتووە لەلای پەروەردگارتانەوە، جا با کێشانەتان دادپەروەری بێت، وە شتی خەڵك بە کەمتر لە حەقی خۆی مەزانن، وە خراپە مەنێنەوە لە زەویدا دوای چاککردنی، ئەوە باشترە بۆتان گەر ئیماندارن (٨٥) وە لەسەر هەموو ڕێگاکان دامەنیشن هەڕەشە بکەن و ڕێ لە دینی خوا بگرن ئەوەی ئیمان

بێنێت ئەتانەوێت خوار بێت، وە بیرتانبێت کە کەم بوون و خوا زۆری کـردن، وە سەیربکەن سەرئەنجامی خراپەکاران چۆن بـوو (٨٦) وە کـە کۆمـەڵێکتان ئیمانی هێناوە بەوەی پێی نێـردراوم وە کۆمـەڵێکتان ئیمـانی نـەهێناوە دە سەبربگرن هەتا خوا حوکم ئەکات لەنێوانماندا، وە ئەو باشترین دادوەرە (٨٧) گەورەکانی قەومەکەی وتیان ئەی شوعەیب تۆ و ئەوانەی ئیمانیـان هێنـاوە پێت دەرتانئەکەین لە شارەکەمان یان دێنەوە سەر دینمان، وتی ئایـا بـەزۆر وامان لێئەکەن (٨٨) درۆمانکردووە بەدەم خواوە گەر بێینەوە سـەر دینتـان دوای ئەوەی خوا ڕزگاری کردین لێی، وە بۆمان نییە بێینـەوە نـاوی مەگـەر الله ی خوامان بیەوێت، پەروەردگارمان زانستی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، پشـتمان بـە خـوا بەسـتووە، پـەروەردگارمان بڕیـار لـەنێوان ئێمـە و قەومەکەماندا بدە بە حەق وە تۆ باشترین سەرخەری (٨٩) وە دەسەڵاتدارانی کافر لە قەومەکەی وتیان گەر شـوێن شـوعەیب بکـەون ئـەوا ئێـوە دۆڕاون (٩٠) جا زەوی لەرزینەکە بردنی جا لەناو ماڵەکانیاندا لەسەر ئەژنۆ کـەوتن بە زەوییا (٩١) ئەوانەی شوعەیبیان بەدرۆخستەوە وەك ئـەوە بـوو هـەرگیز لەوێدا نەژیابن، ئەوانەی شوعەیبیان بەدرۆخستەوە ئـەوان دۆڕاو بـوون (٩٢) جا پشتی تێکردن و وتی ئەی قەومەکەم من پەیامەکانی پەروەردگارمم پـێ گەیاندن و نەسیحەتم کردن، جا چۆن خەفەت لە گەلی کـافر ئـەخۆم (٩٣) وە

لــە هــیچ شــارێکدا پێغەمبــەرێکمان نــەناردووە ئــیللا خەڵکەکــەیان تاقیکردووەتەوە بە ناخۆشی و زیان بەڵکو بگەڕێنــەوە (٩٤) پاشــان لــەجێی خراپە گۆڕیمان بە چاکە هەتا زۆر بوون و وتیــان باوانیشــمان تووشــی زیــان و خۆشی بوون، جا لەپڕ بردمــانن و هەســتیان نــەکرد (٩٥) وە گــەر خــەڵکی شارەکان ئیمانیان بێنایە و تەقوایان بکردایە ئەوا بەرەکەتمان بۆ ئەکردنەوە لە ئاسمان و زەوییەوە، بەڵام بەدرۆیانخستەوە جا بەوەی ئەیانکرد بردمــانن (٩٦) .

+ ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ (١٣) إِذۡ
أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ
(١٤) قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ
إِلَّا تَكۡذِبُونَ (١٥) قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ (١٦) وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ (١٧) قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ
وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ (١٨) قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ
قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ (١٩) وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٢٠) ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ (٢١) وَمَالِيَ لَآ
أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ (٢٢) ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن
يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ (٢٣) إِنِّيٓ إِذٗا

لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ (٢٤) إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ (٢٥) قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ (٢٧) وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ (٢٨) إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ (٢٩) يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٣٠) أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ (٣١) وَإِن كُلّٞ لَّمَّا جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ (٣٢) (يس) وە نموونەی هاوەڵانی ئەو شارەیان بۆ بێنە کە پێغەمبەرانیان بۆ هات (١٣) کاتێك کە دوو پێغەمبەرمان بۆ ناردن جا بەدرۆیانخستنەوە و بە سێیەم پێغەمبەر بەهێزمانکردن، جا وتیان ئێمە بۆ ئێوە نێردراوین (١٤) وتیان ئێوە هیچ نین هەر بەشەرێکن وەك ئێمە وە رەحمان هیچی دانەبەزاندووە ئێوە تەنها درۆئەکەن (١٥) وتیان پەروەردگارمان ئەزانێت کە ئێمە بۆ ئێوە نێردراوین (١٦) وە تەنها گەیاندنی ڕوونمان لەسەرە (١٧) وتیان ئێمە ئێوە بە شووم ئەبینین، گەر وازنەهێنن بەردبارانتان ئەکەین و سزایەکی بەئازار لەئێمەوە بەرتانئەکەوێت (١٨) وتیان شوومی ئێوە بەخۆتانەوەیە، ئایا بیرخستنەوەی خوا شوومە، بەڵکو ئێوە قەومێکن زیادەڕەوی ئەکەن (١٩) جا لەوپەڕی شارەکەوە پیاوێك بەڕاکردن هات وتی ئەی قەومەکەم شوێن پێغەمبەران

بکەون (٢٠) شوێن ئەوانە بکەون کە داوای پاداشت و کرێتان لێناکەن و هیدایەتدراون (٢١) وە بۆچی من ئەوە نەپەرستم کە دروستیکردووم و بۆ لای ئەو ئەگەڕێمەوە (٢٢) ئایا جگە لەو خوایانێك بپەرستم کە گەر خوای میهرەبان زیانێکی بۆم بوێت شەفاعەتیان هیچ سوودم پێ ناگەیەنێت وە ڕزگارم ناکەن (٢٣) من کەواتە لە گومڕاییەکی ئاشکرادام (٢٤) من ئیمانم بە پەروەردگارتانە جا گوێبیستم بن (٢٥) پێی وترا بچۆرە بەهەشتەوە، وتی خۆزگە قەومەکەم ئەیانزانی (٢٦) بەوەی کە پەروەردگارم لێم خۆشبوو وە منی خستە ناو ڕێزلێگیراوانەوە (٢٧) وە لە دوای ئەو بۆ سەر قەومەکەی هیچ سەربازێکمان نەنارد لە ئاسمانەوە، وە هیچمان دانەبەزاند (٢٨) تەنها یەك هاوار بوو جا ئەوان هەموو دامرکانەوە (٢٩) پەشیمانی بۆ بەندەکان، هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهات ئیللا گاڵتەیان پێی ئەکرد (٣٠) ئایا نەیانبینی چەنێکمان لەناوبرد لەقەومەکان کە تازە ئەوان بۆ لایان ناگەڕێنەوە (٣١) وە هەموویان لەلامان بەکۆمەڵ ئامادە ئەبن (٣٢) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ (٢٣) إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُواْ سَٰحِرٌ كَذَّابٌ (٢٤) فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُواْ ٱقْتُلُوٓاْ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُواْ نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ (٢٥) وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ

أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ (٢٦) وَقَالَ
مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ
(٢٧) وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن
يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ
وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ
مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ (٢٨) يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن
يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ
أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ (٢٩) وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم
مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ (٣٠) مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ
بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ (٣١) وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ
(٣٢) يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا
لَهُۥ مِنۡ هَادٖ (٣٣) وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ
مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ
يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ (٣٤) ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ
عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ (٣٥) وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا
لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ (٣٦) أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي
لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا
كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ (٣٧) وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ

سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ (٣٨) يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ
ٱلۡقَرَارِ (٣٩) مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن
ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ
حِسَابٖ (٤٠) وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ
(٤١) تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠
أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ (٤٢) لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ
دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ
أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ (٤٣) فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ
ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ (٤٤) فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ
سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ (٤٥) ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ
ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ (٤٦) وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ
فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا
نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ (٤٧) قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ
بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ (٤٨) وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ
عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ (٤٩) قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ
بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ (٥٠) إِنَّا لَنَنصُرُ
رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ (٥١) يَوۡمَ لَا
يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ (٥٢) (غافر) وە

موسامان نارد بە ئایەتەکانمان وە بەڵگەی ڕوون (٢٣) بۆ فیرعەون و هامان و قارون جا وتیان ساحیر و درۆزنە (٢٤) جا کاتێك بۆلایان چوو بە حەق لەلایەن ئێمەوە وتیان منداڵەکانی ئەوانە بکوژن کە ئیمانیان پێی هێناوە، وە ئافرەتەکانیان بهێڵنەوە، وە پیلانی کافران تەنها لە گومراییدایە (٢٥) وە فیرعەون وتی لێمگەڕێن موسا بکوژم وە با هاواری خواکەی بکات، من ئەترسم دینەکەتان بگۆڕێت یان خراپە لە زەوییا دەرخات (٢٦) وە موسا وتی من پەنا ئەگرم بە خوای من و خوای ئێوە لە هەموو لووتبەرزێك ئیمانی بە ڕۆژی لێپرسینەوە نییە (٢٧) وە پیاوێکی ئیماندار لە خەڵکەکەی فیرعەون وتی کە ئیمانی شاردبووەوە ئایا پیاوێك ئەکوژن کە بڵێت خوام الله یە، وە بەڵگەشی بۆتان هێناوە لە پەروەردگارتانەوە، وە گەر درۆزن بێت ئەوا درۆکەی لەسەر خۆیەتی، وە گەر ڕاستگۆش بێت هەندێك لەوەی وەعدتان پێ ئەدات لە سزا تووشتان ئەبێت، خوا هیدایەتی ئەوە نادات کە زیادەڕەو و درۆزنە (٢٨) ئەی قەومەکەم ئەمڕۆ موڵکتان هەیە و دیارن لە زەوییا جا کێ سەرمان ئەخات لە سزای خوا گەر بۆمان بێت، فیرعەون وتی هیچتان نیشان نایەم ئیللا ئەوە نەبێت کە خۆشم ئەیبینم وە بۆ ڕێی ڕاست نەبێت هیدایەتتان نادەم (٢٩) وە ئەو کەسەی ئیمانی هێنابوو وتی ئەی قەومەکەم من لەسەرتان ئەترسم وەك ڕۆژی کۆمەڵەکان (٣٠) وەك داب و نەریتی

قەومی نوح وە عاد وە ثەمود وە ئەوانەی دوای ئـەوان، وە خـوا زوڵمـی بـۆ عەبدەکان ناوێت (٣١) وە ئەی قەومەکەم من لە ڕۆژی بانگکردنەکە ئەترسم لەسەرتان (٣٢) ئەو ڕۆژە پشتهەڵئەکەن وە لە سزای خوا هیچ پارێزەرێکتـان نییە، وە هەرکەس خوا گـومڕای بکـات ئـەوا هیدایەتـدەری نییـە (٣٣) وە یوسفیش پێشتر بەڵگەی بۆتان هێنا جا هێشتا لە شکان لەوەی بۆتانی هێنا، هەتا کاتێك کە مرد وتتان ئیتر خوا لەدوای ئـەو پێغەمبـەر نانێرێـت، بـەو جۆرە خـوا ئـەوە گومڕائـەکات کـە زیـادەڕەو و بەگومانـە (٣٤) ئەوانـەی دەمەقاڵێ ئەکەن لە ئایەتەکانی خوادا بەبێ بەڵگەیەك بۆیان هاتبێت، جێـی ڕقێکی گەورەیە لەلای خوا وە لەلای ئەوانەی ئیمانیان هەیە، بەو جۆرە خـوا مۆر ئەدات لە دڵی هەموو لووتبەرزێکی عیناد (٣٥) وە فیرعەون وتی ئەی هامـان کۆشـکی بـەرزم بـۆ دروسـتبکە بـەڵکو بگەمـە دەرگاکـان (٣٦) دەرگاکانی ئاسمان جا سەیری خواکەی موسا بکەم وە من دڵنیام کە درۆزنـە، وە بەو جۆرە بۆ فیرعەون ڕازێنرایەوە کاری خراپـی وە ڕێگـری کـرا لـە ڕێـی ڕاست، وە نەخشەی فیرعەون تەنها لە تیاچووندایە (٣٧) وە ئـەوەی ئیمـانی هێنابوو وتی ئـەی قەومەکـەم شـوێنم بکـەون هیدایـەتتان ئـەدەم بـۆ ڕێـی بەهەشت (٣٨) ئەی گەلەکەم ئەم ژیانی دنیایە ڕابواردنە وە بەدڵنیایی ژیانی کۆتایی شوێنی مانەوەیە (٣٩) هەرکەس خراپەیەك بکـات ئـەوا تـەنها بـە

هاوشێوەی پاداشت ئەدرێت، وە هەرکـەس چـاکە بکـات لـە نێـر و مـێ وە ئیماندار بێت ئائەوانە ئەچنە بەهەشتەوە بەبێ حساب رزقیان ئـەدرێت (٤٠) وە ئەی قەوم چییە من بۆ ڕزگاربوون بانگتان ئەکەم وە ئێوە بۆ ئـاگر بـانگم ئەکەن (٤١) بانگم ئەکەن تا کوفر بە خوا بکەم وە شەریکی بـۆ دابنـێم کـە زانستم پێی نییە، وە من بانگتان ئەکەم بۆ لای باڵادەست و لێبـووردە (٤٢) بێ گومان ئەوەی منی بۆ بانگ ئەکەن هیچ وەڵامی نییە نە لە دنیـا نـە لـە قیامەت وە گەڕانەوەمان بۆ لای الله یە وە زیادەڕەوانن هـاوەڵی ئـاگر (٤٣) جا بەم نزیکانە ئەوەی پێتان ئەڵێم بیرتانئەکەوێتەوە، وە کـارم ڕادەسـتی الله ئەکەم، بەدڵنیایی الله بینەرە بە عەبدەکان (٤٤) جا خوا پاراستی لـە فێڵـی خراپیان، وە ئەشکەنجەی خراپ توشی ئالی فیرعەون بوو (٤٥) ئەخرێنە پێش ئاگر بە بەیانیان و ئێواران، وە لە قیامەتیشدا ئالی فیرعەون بخەنە تونـدترین سـزاوە (٤٦) وە کـە دەمـەقاڵێ ئەکـەن لـە ئـاگردا جـا لاوازەکـان بـە خۆبەگەورەزانەکان ئەڵێن ئێمە شوێنکەوتووتان بووین جا ئایا ئێوە بەشێك لە ئاگرمان لەسەر لائەبەن (٤٧) خۆبەگەورەزانەکان وتیان ئێمە هـەموومان لـە ئاگراین تازە خوا حوکمی کردووە لە بەینی عەبدەکانا (٤٨) وە ئەوانـەی لـە ئاگردان بە دەرگاوانەکانی جەهەننـەمیان وت بـانگی پـەروەردگارتان بکـەن ڕۆژێـك سـزامان لەسـەر سـووك بکـات (٤٩) وتیـان ئـەی پێغەمبـەرانتان

بەڵگەیان بۆتان نەهێنا، وتیان بەڵێ، وتیان دەی خۆتان داوا بکـەن، وە داوای
کـافران تـەنها لـە فەوتانداـیە (٥٠) ئێمـە پێغەمبـەرانمان سـەرئەخەین وە
ئەوانەی ئیماندارن لە ژیانی دنیا وە ڕۆژێك کە شـایەتەکان هەڵئەسـتن (٥١)
ئەو ڕۆژە عوزرهێنانەوە سوودی نییە بۆ ستەمکاران، وە دوورن لـە ڕەحمـەتی
خوا وە خراپترین جێیان هەیە (٥٢) ﴾.

+ ﴿ ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكۡرِي (٤٢) ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
إِنَّهُۥ طَغَىٰ (٤٣) فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ (٤٤) قَالَا رَبَّنَآ
إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ (٤٥) قَالَ لَا تَخَافَآۖ إِنَّنِي مَعَكُمَآ
أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ (٤٦) فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ
إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡۖ قَدۡ جِئۡنَٰكَ بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكَۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلۡهُدَىٰٓ
(٤٧) إِنَّا قَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡنَآ أَنَّ ٱلۡعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ (٤٨) قَالَ فَمَن
رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ (٤٩) قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ
(٥٠) قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ (٥١) قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا
يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى (٥٢) ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا
سُبُلٗا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ (٥٣)
كُلُواْ وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ (٥٤) مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ
وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ (٥٥) وَلَقَدۡ أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا

فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ (٥٦) قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ
(٥٧) فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ
وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى (٥٨) قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ
ضُحًى (٥٩) فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ (٦٠) قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ
وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ
(٦١) فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ (٦٢) قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ
لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ
ٱلْمُثْلَىٰ (٦٣) فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ
(٦٤) قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ (٦٥) قَالَ
بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ (٦٦)
فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ (٦٧) قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ
(٦٨) وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا
يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ (٦٩) فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ
هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ (٧٠) قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ
ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي
جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ (٧١) قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ
مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ (٧٢) إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ

ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ (٧٣) إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ (٧٤) وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ (٧٥) جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ (٧٦) (طـه) موسا تـۆ و براکـەت بـە موعجیزەکانمەوە بڕۆن وە بێزار مەبن لە زیکرم (٤٢) بڕۆن بـۆ لای فیرعـەون ئەو سنووری بەزاندووە (٤٣) جا قسەیەکی نەرمی پێبڵێن بەڵکو بیربکاتـەوە یان بترسێت (٤٤) وتیان پەروەردگارمان ئێمە ئەترسین کـە پەلـە بکـات لـە ئازاردانمـان یـان دەسـتدرێژی بکاتـە سـەرمان (٤٥) وتـی مەترسـن مـن لەگەڵتاندام ئەبیستم و ئەبینم (٤٦) جا بچنە لای و بڵێن ئێمـە پێغەمبـەری خـوای تـۆین جـا بـەنی ئیسـرائیلمان لەگەڵـدا بنێـرە و سـزایان مـەدە، وە نیشانەشمان لە پەروەردگارتەوە بۆت هێناوە، وە سەلام لەسەر ئـەوەی شـوێن هیدایەت ئەکەوێت (٤٧) ئێمە وەحیمان بـۆ هـاتووە کـە سـزا لەسـەر ئـەو کەسەیە کە بەدرۆی ئەخاتەوە و پشت هەڵئەکات (٤٨) وتی خواکەتان کێیـە ئـەی موسـا (٤٩) وتـی پـەروەردگارمان ئەوەیـە کـە هـەموو شـتێکی دروسـتکردووە پاشـان هیدایـەتی داوە (٥٠) وتـی ئـەی دەنگوباسـی ئـەو خەڵکەی پێشوو چییە کە بە کافری مردوون (٥١) وتی زانستی ئـەو بابەتـە لای پەروەردگارمە لە پەڕاوێکدا نوسراوە، خـوای گـەورە شـت ون ناکـات و

بیریناچێت (٥٢) ئەوەی کە زەوی بۆتان ڕاخستووە وە تیایا ڕێگەی داناوە، وە لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندووە جا جووتێك ڕووەکی جۆراوجۆرمان دەرکردووە پێی (٥٣) بخۆن و ئاژەڵەکانیشتان بلەوەڕێنن، بەدڵنیاییی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ خاوەن عەقڵەکان (٥٤) لێی دروستمان کردوون وە تیایا ئەتانگەڕێنینەوە وە لێوەی دەرتانئەهێنین جارێکی تر (٥٥) وە بەدڵنیاییی ئایەتەکانمان هەمووی نیشاندا جا بەدرۆیخستەوە و ڕەتیکردەوە (٥٦) وتی ئەوە تۆ هاتوویت لە زەوییەکەمان دەرمانبکەیت بە سیحرەکەت ئەی موسا (٥٧) جا سیحرێکی هاوشێوەیت بۆ دێنین، جا لەنێوان ئێمە و تۆدا کاتێك دیاریکە نە ئێمە و نە تۆ خیلافی ناکەین و جێیەکی مامناوەند بێت (٥٨) وتی کاتەکەتان ڕۆژی جەژن بێت وە کاتی چێشتەنگاو خەڵك بێن (٥٩) جا فیرعەون ڕۆشت و پیلانی خۆی کۆکردەوە پاشان هات (٦٠) موسا پێی وتن هاوار بۆتان درۆ بەدەم خواوە مەکەن چونکە کۆتاییتان پێدێنێت بە سزا، وە ئەوەی درۆ ئەکات زەرەرمەندە (٦١) جا لەناو خۆیاندا مشتومڕیانکرد وە قسەکانیان بە چپە و نهێنی بوو (٦٢) وتیان ئەم دووانە ساحیرن ئەیانەوێت لە زەوییەکەتاندا دەرتانکەن بە سیحرەکەیان وە ماڵ و سامانەکەتان ببەن (٦٣) جا نەخشەی خۆتان کۆبکەنەوە و بە یەك پۆل وەرن، وە ئەوەی ئەمڕۆ سەربکەوێت سەرفرازە (٦٤) وتیان ئەی موسا یان تۆ دەستپێبکە یان ئێمە

یەکەم جار دەستپێئەکەین (٦٥) وتی بەڵکو ئێوە دەستپێبکەن، جا پەت و گۆچانەکانیان وا هاتە پێش چاوی کە ئەڕوات (٦٦) جا موساش لە نەفسی خۆیدا ترسا (٦٧) وتمان مەترسە تۆ بەرزیت بەسەریاندا (٦٨) وە ئەوەی لە دەستتدایە هەڵیبدە ئەوەی کردوویانە قووتی ئەدات، ئەوەی کردوویانە فێڵی ساحیرە وە ساحیر سەرفراز نابێت بەو سیحرەی هێناویەتی (٦٩) جا ساحیرەکان کەوتن بە سوجدەدا وتیان ئیمانمان هێنا بە خوای هارون و موسا (٧٠) فیرعەون وتی ئیمانتان پێی هێنا پێش ئەوەی ئیزنتان بدەم، ئەو گەورەکەتانە کە سیحری فێرکردوون، جا دەست و قاچتان ڕاست و چەپ ئەبڕم، وە لەسەر قەدی دار خورما هەڵتانئەواسم، وە ئەزانن کاممان سزای توندترە و ئەمێنێتەوە (٧١) وتیان تۆمان ناوێت بەسەر ئەوەدا کە بۆمان هاتووە لە بەڵگەی ڕوون سوێند بەوەی دروستیکردووین، جا ئەوەی ئەیکەیت بیکە، تۆ تەنها لەم ژیانی دنیایەدا سزامان ئەدەیت (٧٢) ئێمە ئیمانمان بە پەروەردگارمان هێنا تا تاوانەکانمان ببەخشێت وە ئەوەشی بەزۆر پێت کردین لە سیحر، وە الله باشترە و ئەمێنێتەوە (٧٣) هەرکەس بە تاوانباری بێتە لای پەروەردگاری ئەوا جەهەننەمی بۆ هەیە تیایا نامرێت و ناشژی (٧٤) وە هەرکەس بە ئیمانداری بێتە لای و کرداری چاکی کردبێت ئائەوانە پلە

بەرزەکانیان هەیە (٧٥) بەهەشتی هەمیشەیی بە ژێریـا ڕووبارەکـان ئـەڕۆن نەمرن تیایا، وە ئەوە پاداشتی ئەوەیە خۆی پاکبکاتەوە (٧٦) ﴾.

+ ﴿ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ (١٢) فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ (١٣) وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ (١٤) (النمل) وە دەسـتت بخـە گیرفانتەوە بە سپێتی دەردێت بەبێ هیچ گولییەك، ئەمە لە نۆ بەڵگەیـە بـۆ فیرعەون و قەومەکەی، ئەوان قەومێکی لەڕێ دەرچوو بوون (١٢) جا کاتێك ئایەتەکانمانیان بۆ هات و بینییان وتیـان ئەمـە سـیحرێکی ڕوونـە (١٣) وە نکوڵییان کرد وە لە نەفسیاندا یەقینیان پێی هەبوو بـە زوڵـم و لووتبـەرزی، جا سەیرکە سەرئەنجامی خراپەکاران چۆن بوو (١٤) ﴾.

+ ﴿ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ (٣٨) وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ (٣٩) فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ (٤٠) (العنكبـوت) وە عـــاد و

ثەمودیش خوا لەناویبردن وە بۆتان دەرکەوت لە شوێنەکانیاندا، وە شەیتان
کردەوەکانی بۆ ڕازاندنەوە جا ڕێگری لێکردن لە ڕێگەی ڕاست وە حەقیشیان
بینی (٣٨) وە قارون و فیرعەون و هامان، وە موسا بە بەڵگەی ڕوونەوە
هات بۆلایان جا لووتبەرزبوون لە زەویدا وە پێشمان نەکەوتن (٣٩) جا
هەریەکە بە تاوانەکەی بردمان، جا هەیانە بەردبارانمان کرد وە تیایانە
هاوارەکە فەوتاندی وە هەیانە بردمان بە زەویدا وە هەیانە نوقممان کرد، وە
خوا زوڵمی لێیان نەکرد بەڵکو زوڵمیان لە خۆیان کرد (٤٠) ﴾.

+ ﴿ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا
أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا (٣١) وَبَرَّۢا
بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا (٣٢) وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ
أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا (٣٣) ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ
يَمۡتَرُونَ (٣٤) مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا
يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (٣٥) وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ
مُّسۡتَقِيمٞ (٣٦) فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ
يَوۡمٍ عَظِيمٍ (٣٧) (مريم) عیسا وتی من عەبدی الله م کتێبی داومەتیٚ و
کردوومی بە پێغەمبەر (٣٠) وە موبارەکی کردووم لە هەر جێیەك بم و
فەرمانی پێکردووم بە نوێژ و زەکات تا زیندووبم (٣١) وە باشبم لەگەڵ

دایکم وە نەیکردووم بە لوتبەرز و سەرپێچیکەری دایکم (٣٢) وە سەلامی خوا لەسەر منە ئەو ڕۆژەی لەدایك بووم و ئەو ڕۆژەی ئەمرم و ئەو ڕۆژەی زیندووئەبمەوە (٣٣) ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە قسەی حەق دەربارەی کە تیایا ڕاجیاییان هەیە (٣٤) خوا منالّ بۆ خۆی بڕیارنادات، پاکی بۆ ئەو، گەر بڕیاری شتێك بدات ئەوا پێی ئەڵێت ببە و ئەبێت (٣٥) وە اللّٰه پەروەردگاری من و ئێوەیە جا بیپەرستن، ئەوە ڕێگای ڕاستە (٣٦) جا کۆمەڵەکان لەناو خۆیاندا ڕاجیا بوون، جا هەرەشە بۆ کافرەکان لە دیمەنی ڕۆژێکی مەزن (٣٧) ﴾.

+ ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ (٤٥) وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (٤٦) قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ ۖ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (٤٧) وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ (٤٨) وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّيٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٤٩) وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ

فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ (٥٠) إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ
مُّسۡتَقِيمٞ (٥١) فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ
قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ (٥٢)
رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ (٥٣) وَمَكَرُواْ
وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ (٥٤) إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ
وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ
تَخۡتَلِفُونَ (٥٥) فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ
وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ (٥٦) وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ
أُجُورَهُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥٧) ذَٰلِكَ نَتۡلُوهُ عَلَيۡكَ مِنَ ٱلۡأٓيَٰتِ وَٱلذِّكۡرِ
ٱلۡحَكِيمِ (٥٨) إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ
لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (٥٩) ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ (٦٠) فَمَنۡ
حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ
وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى
ٱلۡكَٰذِبِينَ (٦١) إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡقَصَصُ ٱلۡحَقُّۚ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ
لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (٦٢) فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُفۡسِدِينَ (٦٣) قُلۡ
يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا
نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ
فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ (٦٤) يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ

وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ (٦٥) هَٰٓأَنتُمۡ
هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞۚ
وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ (٦٦) مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا
وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (٦٧) إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ
بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
(٦٨) وَدَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ
وَمَا يَشۡعُرُونَ (٦٩) يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ
(٧٠) يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ (٧١) وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ (٧٢) وَلَا
تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ
أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ
وَٰسِعٌ عَلِيمٞ (٧٣) يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ
(٧٤) (آل عمران) کاتێك کە مەلائیکەتەکان وتیان ئەی مەریەم خوا مژدەت
ئەداتێ بە وشەیەك لە خۆیەوە منداڵت ئەبێت ناوی مەسیحە عیسای کوڕی
مەریەم، خاوەن ڕێزە لە دنیا و قیامەت وە لە نزیککراوەکانە (٤٥) وە قسە
لەگەڵ خەڵکدا ئەکات لە بێشکەوە وە کە ئەچێتە تەمەنەوە وە لە چاکەکانە
(٤٦) وتی پەروەردگارم چۆن کوڕم ئەبێت و هیچ بەشەرێك جیماعی

نەکردووم، وتی ئاوا خوا چی بوێت دروستیئەکات، گەر بڕیاری شتێك بدات ئەوا پێی ئەڵێت ببە و ئەبێت (٤٧) وە نوسین و دانایی فێرئەکات وە تەورات و ئینجیل (٤٨) وە ئەیکات بە پێغەمبەر بۆ بەنی ئیسرائیل کە بە ئایەتێکەوە هاتووم بۆ لاتان لە پەروەردگارتانەوە، کە من لە قوڕ شێوەی تەیرتان بۆ دروستئەکەم و فووی پیائەکەم و بە ئیزنی خوا ئەبێت بە باڵندە، وە کوێر و بەڵەك چاکئەکەمەوە وە مردوو زیندوو ئەکەمەوە بە ئیزنی خوا، وە پێتان ئەڵێم چی ئەخۆن و چی هەڵئەگرن لە ماڵەکانتاندا، بەدڵنیایی لەوەدا بەڵگە هەیە بۆتان گەر ئیماندار بن (٤٩) وە بەڕاستدانەری تەوراتم کە پێش من هاتووە وە بۆئەوەی هەندێك لەو شتانەی لێتان حەرامکراوە بۆتان حەڵاڵبکەم، وە بەڵگەم بۆ هێناون لە پەروەردگارتانەوە جا تەقوای خوا بکەن و گوێرایەڵم بن (٥٠) بێگومان الله خوای من و ئێوەیە جا بیپەرستن، ئەمە ڕێگای ڕاستە (٥١) جا کاتێك عیسا هەستی بە کوفر کرد لێیانەوە وتی کێ پشتیوانی منە بۆ بانگەوازکردن بۆ خوا، قوتابییەکانی وتیان ئێمە پشتیوانی دینی خواین، ئیمانمان بە خوایە وە شایەتبە کە ئێمە موسوڵمانین (٥٢) پەروەردگارمان ئیمانمان بەوە هێنا کە داتبەزاند و شوێن پێغەمبەر کەوتین جا لەگەڵ شایەتەکاندا بمانووسە (٥٣) وە کافران فێڵیانکرد و خواش فێڵیکرد، وە خوا باشترین نەخشەدانەرە (٥٤) کاتێك خوا وتی ئەی عیسا

مـــن ئەتبـــەم و بەرزتئەکەمـــەوە بـــۆ لای خـــۆم، وە پاکتئەکەمـــەوە لەوانـــەی کوفریـــانکرد، وە ئەوانـــەی شـــوێنتکەوتن بەرزیانئەکـــەم بـــە ســـەر ئەوانـــەی کوفریانکرد تا ڕۆژی زیندووبوونەوە، پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای منە و حـوکم ئەکەم لەنێوانتانا لەوەی تیایا ڕاجیابوون (٥٥) جا ئەوانەی کوفریانکرد ئـەوا سزایەکی سەختیان ئەدەم لە دنیا و قیامەتدا، وە سەرخەریان نییـە (٥٦) وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە ئەوا پاداشتی تـەواویان ئەداتەوە، وە خوا زالّمانی خۆشناوێت (٥٧) ئەمەی بۆتمان خوێندەوە ئایـەت و زیکری پڕ حیکمەتە (٥٨) نموونەی عیسا لای خوا وەك نموونەی ئادەمە، لە گـڵ دروسـتیکرد پاشـان پێـی وت ببـە و ئـەبێت (٥٩) حـەق لەلایـەن پەروەردگارتەوەیە جا لە بەگومانەکان مەبە (٦٠) جا هەرکـەس مشـتومڕی تیاکرد لەگەڵت دوای ئەوەی زانستت بۆ هات ئـەوا بڵـێ وەرن منالّـەکانمان و منالّەکانتان دێین وە ئافرەتەکانمان و ئافرەتەکانتان دێین وە خۆمـان و خۆشتان دێین، پاشان موباهەلە ئەکەین جا لەعنـەتی خـوا لـەو کەسـە ئەکـەین کـە درۆزنە (٦١) بێگومان ئەمە هەواڵی ڕاست و حەقە وە هیچ خوایـەکی حـەق نییـە جگـە لـە الله، وە الله زۆر بالادەسـت و کاربەجێیـە (٦٢) جـا گـەر پشتهەڵکەن ئەوا خوا زانایە بە خراپەکاران (٦٣) بڵێ ئەی خاوەنـانی کتێـب وەرن بۆ وشەیەکی یەکسان لەنێوانماندا کـە غـەیری الله نەپەرسـتین وە هـیچ

شەریکی بۆ دانەنێین وە هیچکاممان ئەوی تر نەکات بە خوا جگە لە الله، جا گەر پشتیانهەڵکرد ئەوا بڵێن شایەت بن کە ئێمە موسوڵمانین (٦٤) ئەی خاوەنانی کتێب بۆچی مشتومڕ لە ئیبراهیمدا ئەکەن لە کاتێکدا تەورات و ئینجیل دانەبەزین ئیللا دوای ئەو، بۆ عاقڵ نابن (٦٥) ئەوەتا ئێوە لە شتێکدا مشتومڕتان کرد کە زانیاریتان پێی هەیە ئەی بۆچی لە شتێکدا مشتومڕتانە کە زانیاریتان پێی نییە، وە خوا ئەزانێت و ئێوە نازانن (٦٦) ئیبراهیم نە یەهودی بوو نە نەصرانی بەڵام لەشیرك لایدابوو وە موسوڵمان بوو وە لە موشریکەکان نەبوو (٦٧) ئەوانەی بە ئیبراهیم لەپێشترن ئەوانەن کە شوێنی کەوتن وە ئەم پێغەمبەرە و ئیمانداران، وە خوا پشتیوانی ئیماندارانە (٦٨) بەشێك لە خاوەنانی کتێب ئاواتەخواز بوون کە گومڕاتان بکەن، وە تەنها خۆیان گومڕا ئەکەن و هەستیش ناکەن (٦٩) ئەی خاوەنانی کتێب بۆچی کافرن بە ئایەتەکانی خوا وە ئێوە شایەتن و ئەزانن کە حەقە (٧٠) ئەی خاوەنانی کتێب بۆچی حەق و بەتاڵ تێکەڵ ئەکەن وە حەق ئەشارنەوە وە ئەشزانن (٧١) وە بەشێك لە خاوەنانی کتێب وتیان لە سەرەتای ڕۆژدا ئیمان بێنن بەوەی دابەزیوەتە سەر ئیمانداران وە لە کۆتایی ڕۆژەکە کافر بن بەڵکو بگەڕێنەوە لێی (٧٢) وە باوەڕ مەکەن تەنها بەوانە نەبێت کە شوێن دینەکەتان کەوتوون، بڵێ بێگومان هیدایەت هەر هیدایەتی

خوایە، وە زانیاری مەدەنە ئیمانداران با کەس وەك ئێوەی نەدرێتێ یان نەیکەن بە بەڵگە لەلای خواکەتان، بڵێ فەزڵی دین بەدەست خوایە بە کێی بوێت ئەیدات، وە خوا فەزڵی فراوانە و زانایە (٧٣) رەحمەتەکەی تایبەت ئەکات بە هەرکەس بیەوێت، وە خوا خاوەن فەزڵی مەزنە (٧٤) ﴾.

+ ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ
ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ
إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (٣٦) قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا
بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا
يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ (٣٧) وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ
وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ
عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ (٣٨) يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ
ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ (٣٩) مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ
إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ
إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا
يَعۡلَمُونَ (٤٠) يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا
ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ
(٤١) (يوسف) وە دوو گەنج لەگەڵ یوسفدا چوونە سجنەوە، یەکێکیان وتی من لە خەومدا ترێم ئەگوشی و ئەمکرد بە مەی، وە ئەوەی تریان وتی من بەسەر سەرمەوە نانم هەڵگرتبوو وە باڵندە لێیان ئەخوارد، بۆمان لێکبدەرەوە

ئێمە لە چاكەكارانت ئـەبینین (٣٦) وتـی هـیچ خواردنێكتـان بـۆ نایـەت و
بتاندرێتیێ ئیللا من پێتان ئەڵێم پـێش ئـەوەی بـۆ لاتـان بێـت، ئـەوە لـەو
شتانەیە كە پەروەردگارم فێریكردووم، من گەلێكم جێهێشتووە كە ئیمانیـان
بە خوا نییە وە ئەوان كافرن بە قیامەت (٣٧) وە شوێن دینی باوانم كەوتووم
ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب، بۆمان نییە هیچ هاوەڵێك بۆ خـوا دابنـێین،
ئەوە لە فەزڵی خوایە بەسەرمانەوە وە بەسەر خەڵكەوە، بەڵام زۆربەی خـەڵك
شوكرانە بـژێری ناكـەن (٣٨) ئـەی دوو هاوەڵەكـەی زینـدان ئایـا كۆمەڵـە
خوایەكی جیا باشترە یان الله ی تاكی بەتوانا (٣٩) هـیچ ناپەرسـتن غـەیری
ئەو ئیللا چەند ناوێكە ئێوە و باوانتان لێتانناون خوا هیچ بەڵگەی لەسەریان
دانەبەزاندووە، حوكم تەنها بۆ خوایە فەرمانی كردووە كە ئیللا ئەو بپەرستن،
ئەوە دینی دامەزراوە، بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن (٤٠) ئەی دوو هاوەڵەكەی
زیندان ئەمما یەكێكتان ئەوا مەی دەرخواردی پاشا ئەدات، وە ئەمما ئەوەی تر
لە خاچ ئەدرێت جا باڵندە لە سەری ئەخۆن، ئەو بابەتەی تیایا پرسیار ئەكەن
لێبووەتەوە (٤١) ﴾.

+ ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا (٤١) إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ
لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا (٤٢) يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ
جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا (٤٣) يَٰٓأَبَتِ لَا

تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا (٤٤) يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن
يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا (٤٥) قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ
عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا (٤٦) قَالَ سَلَٰمٌ
عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا (٤٧) وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا (٤٨) فَلَمَّا
ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا
نَبِيّٗا (٤٩) وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا (٥٠)

(مریم) وە لە قورئاندا باسی ئیبراهیم بکە، ئەو بەڕاستی ڕاستگۆ و پێغەمبەر بوو (٤١) کاتێك بە باوکی وت ئەی باوکە بۆ شتێك ئەپەرستیت نابیستیٚ و نابینیٚ و هیچ بەکەڵکت نایەت (٤٢) ئەی باوکە من لە زانستم بۆ هاتووە کە بۆ تۆ نەهاتووە، جا شوێنمبکەوە هیدایەتت ئەدەم بۆ ڕێیەکی ڕاست (٤٣) ئەی باوکە شەیتان مەپەرستە، شەیتان سەرپێچی خوای کرد (٤٤) ئەی باوکە من ئەترسم کە سزایەك لە خوای بەرەحمەوە بەرتبکەوێت و ئەوسا ئەبیت بە خۆشەویستی شەیتان (٤٥) وتی ئایا تۆ ڕوو وەرئەگێڕی لە خواکانم ئەی ئیبراهیم، گەر وازنەهێنی بەردبارانت ئەکەم، وە ماوەیەکی زۆر لێم دووركەوەرەوە (٤٦) وتی سەلامەت ئەبیت لە منەوە، وە داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم لە پەروەردگارم، خوا زۆر چاکەکارە لەگەڵم (٤٧) وە

لێتان و لەوانەی هاواریـان ئەکـەن جگـە لـە خـوا دوورئەکەومـەوە، وە لـە پەروەردگارم ئەپاڕێمەوە، وە بێئومێد نابم لە پاڕانەوە لە پـەروەردگارم (٤٨) جا کاتێ لێیان و لەوانەی هاواریان ئەکرد جگە لە خوا دوورکەوتەوە ئیسحاق و یەعقوبمان پێبەخشـی، وە هـەموویانمان کـرد بـە پێغەمبـەر (٤٩) وە لـە ڕەحمەتی خۆمان پێبەخشین، وە زمانی ڕاستگۆی بـەرزمان پێبەخشـین (٥٠) .

+ ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٢٥٨) أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (٢٥٩) (البقرة) ئەوەت نەبینی کە بەڵگەی هێنایەوە بۆ ئیبراهیم لە پەروەردگاریدا کە خـوا مـوڵکی دابوویە، کاتێك ئیبراهیم وتی پەروەردگارم ئـەژیێنێت و ئـەمرێنێت ئـەویش وتی منیش ئەمرێنم و ئەژیێنم، ئیبراهیم وتی دەی خوا خۆر لە خۆرهەڵاتەوە دێنێت تۆ لە خۆرئاواوە بیهێنە، جا ئەوەی کوفری کرد دەمکوت بوو، وە خوا

قەومی زاڵم هیدایەت نادات (٢٥٨) یـان وەك ئـەوەی کـە بـەلای دێیەکـدا ڕۆشت و بەسەر دیوارەکانیا ڕووخابوو وتی چۆن خـوا ئەمـە زیندووئەکاتـەوە دوای مردنی، جا خـوا سـەد سـاڵ مرانـدی و دواتـر زینـدوویکردەوە، وتـی چەندێك لێرەدا مردبوویت، وتی ڕۆژێك یان کەمتر، وتـی بـەڵکو سـەد سـاڵ لێرەدا مردبوویت جا سەیری خواردن و خواردنەوەکەت بکە هیچ نەگۆڕاوە وە سەیری کەرەکەت بکە، وە تـۆ ئەکـەین بـە نیشـانە بـۆ خـەڵك، وە سـەیری ئێسقانەکان بکە چۆن بەرزی ئەکەینەوە پاشان بـە گۆشـت دایئەپۆشـین، جـا دوای ئەوەی بۆی ڕوونبووەوە وتـی ئـەزانم کـە خـوا توانـای بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیە (٢٥٩) ﴾.

+ ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ (٧٤) وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ (٧٥) فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ (٧٦) فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (٧٩) وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ

أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ
رَبِّي شَيۡـٔٗاۚ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ (٨٠) وَكَيۡفَ أَخَافُ
مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗاۚ
فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ (٨١) ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ
يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ (٨٢) وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ
ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ
(٨٣) (الأنعام) وە کە ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت ئایا بت ئەکەیت بە خوا، من تۆ و قەومەکەت لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ئەبینم (٧٤) وە بەو شێوەیە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی نیشانی ئیبراهیم ئەدەین بۆئەوەی لەوانە بێت کە یەقینیان هەیە (٧٥) جا کاتێك شەو ڕووناکی ڕۆژی داپۆشی ئەستێرەیەکی بینی وتی ئەمە خوای منە، جا کە دیارنەما وتی من حەزم لەوانە نییە کە دیارنامێنن (٧٦) جا کاتێك مانگی بینی دەرکەوتبوو وتی ئەمە خوامە، جا کاتێك ئاوا بوو وتی گەر پەروەردگارم هیدایەتم نەدات ئەوا لە گەڵە گومڕاکان ئەبم (٧٧) جا کاتێك خۆری بینی دەرکەوتبوو وتی ئەمە خوامە ئەمەیان گەورەترە، جا کە ئاوا بوو وتی ئەی قەومەکەم من بەریم لەوانەی کردووتانە بە شەریکی خوا (٧٨) من ڕووم کردووەتە ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە و لامداوە لە شیرك، وە من لە موشریکەکان نیم (٧٩) وە قەومەکەی دەمەقاڵێیان کرد، وتی ئایا لە الله دا

دەمەقالێم ئەکەن و ئەو هیدایەتی داوم، وە لەوانە ناترسم کە کردووتانە بە شەریکی مەگەر پەروەردگارم شتێکی بوێت، زانست و زانینی پەروەردگارم هەموو شتێکی گرتووەتەوە، ئایا بیرناکەنەوە (٨٠) وە چۆن لەوە بترسم کە کردووتانە بە هاوەڵ و ئێوە ناترسن کە هاوەڵتان بۆ خوا داناوە کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەریان دانەبەزاندووە بۆتان، جا کام کۆمەڵەیە شایەنترە بە ئەمان و ئیسراحەت گەر بەڵگەتان هەیە (٨١) ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و شیرکیان تێکەڵی تەوحیدەکەیان نەکردووە ئائەوانە لە ئەماندان وە ئەوان هیدایەتدراون (٨٢) وە ئەوە بەڵگەمانە داومانەتە ئیبراهیم لەسەر قەومەکەی، پلەی کێمان بوێت بەرزی ئەکەینەوە، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێ و زانایە (٨٣) ﴾.

+ ﴿ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ (آل عمران - ٣٢) بڵێ گوێرایەڵی خوا و پێغەمبەری بکەن جا گەر پشتیان هەڵکرد ئەوا خوا کافرانی خۆشناوێت ﴾.

+ ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا (الكهف - ٢٩) وە بڵێ حەق لەلای پەروەردگارتانەوەیە جا کێ ئەیەوێت ئیمان بێنێت وە کێ ئەیەوێت

کافربێت، ئێمە بۆ ستەمکاران ئاگرێکمان ئامادە کردووە چواردەوریانی گرتووە، وە گەر داوای ئاو بکەن ئاوێکیان ئەدرێتێ وەك زەیت و مسی تواوەیە دەموچاو ئەبرژێنێت، خراپترین خواردنەوەیە وە جێیەکی خراپە ﴾.

+ ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ (التوبة - ٢٩) شەڕی ئەوانە بکەن کە باوەڕیان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نییە، وە ئەوە حەرام ناکەن کە خوا و پێغەمبەر حەرامیکردووە، وە بە دینی حەق دینداری ناکەن، لەوانەی کە کتێبیان دراوەتێ هەتا جیزییە ئەدەن بە دەستی خۆیان و بە زەلیلی ﴾.

+ ﴿ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا (النساء - ٨٩) ئاواتەخوازن ئێوە کوفر بکەن وەك چۆن خۆیان کوفریان کرد وە ئەوکاتە یەکسان بن، جا پشتیوانیان لێ مەگرن هەتا لە پێناو خوادا کۆچ ئەکەن، وە گەر پشتیان هەڵکرد ئەوا بیانبەن و بیانکوژن لە هەر جێیەك بینیتانن، وە هیچ پشتیوان و سەرخەرێکیان لێ مەگرن ﴾.

+ ﴿ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (١) فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ

مُخْزِي ٱلْكَٰفِرِينَ (٢) وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ
أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ
فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣) إِلَّا
ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ
أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ (٤) فَإِذَا ٱنسَلَخَ
ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ
وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟
ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٥) وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا
يَعْلَمُونَ (٦) كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا
ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ (٧) كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ
يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ (٨) ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَٰتِ
ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ (٩) لَا
يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ (١٠) فَإِن تَابُوا۟
وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ
يَعْلَمُونَ (١١) وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِي دِينِكُمْ فَقَٰتِلُوٓا۟
أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ (١٢) أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوٓا۟
أَيْمَٰنَهُمْ وَهَمُّوا۟ بِإِخْرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَٱللَّهُ

أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (١٣) قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ
وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ (١٤) وَيُذۡهِبۡ
غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٥) (التوبة)

خوا و پێغەمبەرەکەی بەرین لەو موشریکانەی پەیمانتان لەگەڵیاندا کرد (١) جا لە زەویدا چوار مانگ بگەڕێن وە بزانن کە ئێوە لە خوا ڕزگارتان نابێت وە خوا سەرشۆڕکەری کافرانە (٢) وە ئاگادارکردنەوە لە خوا و پێغەمبەرەوە بۆ خەڵکی لە ڕۆژی حەجی گەورەدا کە خوا و پێغەمبەرەکەی لە موشریکەکان بەرین، جا گەر تۆبە بکەن ئەوە بۆتان باشترە، وە گەر پشتهەڵکەن ئەوا بزانن کە لە خوا ڕزگارتان نابێت، وە مژدەی سزایەکی بەئێش بدە بە کافران (٣) ئەوانە نەبێت لە موشریکەکان کە پەیمانتان لێ وەرگرتن و هیچ بەڵێنێکیان هەڵنەوەشاندەوە، وە یارمەتی کەسیان نەداوە بۆ سەرتان جا پەیمانەکەیان لەگەڵدا تەواو بکەن تا ماوەکەی خۆی، بەدڵنیایی خوا تەقواکارانی خۆشئەوێت (٤) جا کە مانگە حەرامەکان لێبوونەوە ئەوا موشریکەکان بکوژن لە هەر جێیەك بیاندۆزنەوە وە بیانبەن و گەمارۆیان بدەن وە لە هەموو ڕێگایەکدا بۆیان دانیشن، جا گەر تۆبەیان کرد و نوێژیانکرد و زەکاتیان دا ئەوا لێیانگەڕێن، بێگومان خوا لێبووردە و بەرەحمە (٥) وە گەر یەکێك لە موشریکەکان مۆڵەتی لێ وەرگرتیت ئەوا

مۆڵەتی بدە هەتا گوێبیستی قسەی خوا ئەبێت، پاشان بیگەیەنە جێی ئەمینی، ئەوە چونکە ئەوان قەومێکن نازانن (٦) چۆن موشریکەکان پەیمانیان ئەبێت لەلای خوا وە لەلای پێغەمبەرەکەی ئیللا ئەوانەی لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتان لەگەڵیان کرد، جا تا بەردەوام بن لە پەیمانەکەیان ئێوەش بەردەوام بن، بێگومان خوا تەقواکارانی خۆشئەوێت (٧) چۆن وە لە کاتێکدا زاڵبن بەسەرتاندا هیچ خزمایەتی و پەیمانێك نازانن، بە دەمیان ڕازیتان ئەکەن وە دڵیان نایەوێت وە زۆربەیان لەڕێ دەرچوون (٨) بە ئایەتەکانی خوا نرخێکی کەمیان دەستکەوتووە جا ڕێگرییان کرد لە ڕێبازەکەی، ئەوان زۆر خراپیان کرد (٩) لە ئیماندارانا ڕەچاوی نە خزمایەتی نە بەڵێن ئەکەن، وە ئەوانە دەستدرێژکەرەکانن (١٠) جا گەر تۆبەیان کرد وە نوێژیان کرد وە زەکاتیان دا ئەوا براتانن لە دیندا، وە ئایەتەکان ڕوونئەکەینەوە بۆ قەومێك زانیارییان هەبێت (١١) جا گەر پەیمانیان شکاند دوای بەڵێندانیان وە تانەیان دا لە دینەکەتان ئەوا شەڕی سەرانی کوفر بکەن ئەوان هیچ پەیمانێکیان نییە بەڵکو تەواو ببن (١٢) ئایا شەڕی قەومێك ناکەن پەیمانەکەیان شکاند وە ویستیان پێغەمبەر دەرکەن وە ئەوان سەرەتا دەستیانپێکرد، ئایا لێیانئەترسن، جا خوا شایەنترە لێی بترسن گەر ئیماندارن (١٣) شەڕیانبکەن خوا بەدەستی ئێوە سزایان ئەدات وە

سەرشۆڕیان ئەکات وە سەرتانئەخات بەسەریاندا وە شیفای دڵـی قـەومێکی ئیماندار ئەدات (١٤) وە ڕقی دڵیان ئەبات، وە خوا لـە هەرکـەس بیـەوێت خۆشئەبێت، وە خوا زانا و کاربەجێیە (١٥) ﴾.

گەر دیقەتی دەقەکان بدەین لە قورئانی پیرۆزدا ئەبینین لە چەندین سورەت و سەدان ئایەتدا بانگەوازکردن و بڵاوکردنەوەی دیـن سـەرەتا بـە نەسـیحەت و نیشـاندان و خستنەڕووی بەڵگە و وەڵامی پرسیار و گومانە. جا گەر کەسەکە قەناعەتی کـرد و تەسلیمی حەق بوو ئەوا موسوڵمانە. وە گەر ئیسلامی قبوڵنەکرد ئەوا کافرە و لـە دنیا بۆی هەیە تا ئەمرێت لەسەر دینەکەی خۆی بێـت. بـەڵام لـە قیامەتـدا سـزا ئەدرێت بە هەتاهەتایی لە جەهەننەمدا، وە هـەر لـەم دنیـا لـەو سـزایە ئاگـادار ئەکرێتەوە. وە لە قورئاندا لەسەر پرسیار و گومانکردن کەسەکە ناکوژرێت. بـەڵکو خوای گەورە هانی مرۆڤەکان ئەدات بیربکەنـەوە و لـە بەڵگـەکان بـڕوانن و، گـەر پرسیاریش بکەن وەڵامیان ئەداتەوە ڕاستەوخۆ خۆی یان لەڕێی پێغەمبەرەکانیـەوە. وە خوای گەورە سزای هیچ کەسێك نادات لە دنیا یان قیامەت هـەتا پێغەمبـەری بۆ نەنێرێت و وەڵامی پرسیار و شوبهەی نەداتـەوە و بەهانـەی نـەبڕێت. وە خـوای گەورە بۆ هەموو قەومێك و بە زمانی خۆیان بۆ ئەمە پێغەمبەری ناردووە. وە گەر

قەومەکە ئیمان نەهێنن و دژایەتی بکەن ئەوکاتە سزای خوا بۆیان حەڵاڵە و خـوای گەورە لەناویانئەبات لە دنیادا گەر بیەوێت، یان سزاکەیان دوائەخات بۆ قیامـەت. وە بانگەواز و نەسیحەتکردن بە حیکمەت و داناییانە ئـەکرێت، وە بـە نیشـاندانی عـەیبەکانی کوفر و شیرکە، وە بە مـژدەدان بـە بەهەشـت و ئاگادارکردنەوەیـە لـە جەهەننـەم، وە بـە ناسـاندنی لێبـووردنی خـوای گەورەیـە لـە تاوانـەکان تـا زوو بگەڕێنەوە و وانەزانن تیاچوون و ڕێی گەڕانەوەیان نەماوە. وە داوای بەڵگە لەئاست بانگەشەی کافراندا ئەکرێت و، بێ بەڵگە هیچ بانگەشەیەك قبوڵ نییە. وە ئیماندار بەڵگـەکانی ئەخاتـە ڕوو لەسـەر تاقانـەیی خـوای گـەورە و ڕاسـت و دروسـتی عـەقیدەکەی. وە هەموو پێغەمبەران علیهم السلام نەسیحەتی قەومەکانیان کردووە بەدڵسۆزی و، بەڵگەیان هێناوە و بەهانەیان بڕیون، وە چیرۆکەکانیان باسـکراون. وە گەر کەسێك دوای هەڵسانی حوججە لەسەری بەردەوامبوو لە ڕەتکردنـەوەی حـەق، ئەوا ئەشێ موباهەلەی بکرێـت. وە کـافر لـەم دنیـا یـان جزیـە ئـەدات و لەسـەر دینەکەی خۆی ئەمێنێتـەوە، یـان شـەڕی ئـەکرێت و ئـەکوژرێت. وە گـەر شـەڕی موسوڵمانان بکەن و هەوڵی هەڵگێڕانەوەی موسوڵمانان بدەن و تانە لە ئیسلام بدەن ئەکوژرێن. وە گەر پەیمان بشکێنن لەگەڵ موسوڵماناندا ئەوا شـەڕیان ئـەکرێت. وە گەر دوای ئـەو خیانـەت و دژایەتییـەش تۆبـە بکـەن و ئیمـان بێـنن وازیـان لـێ ئەهێنرێت و ئیمانەکەیان لێ وەرئەگیرێت.

بەڵام لە کتێبی گاور و جوولەکەکاندا نەسیحەت و موناقەشە و بەڵگەهێنانەوە نییە، بەڵکو بێ قسە و موناقەشە دەست بە شەڕ و کوشتار ئەکرێت. وە ئاساییە لە کتێبدا بۆ چەندین نەوە شەڕ لەنێوان دوو لایەندا ڕووبدات و درێژە بکێشێت، لەبری هیدایەتی بێ باوەڕان. وە لە کتێبدا وا مامەڵەی بێ باوەڕان ئەکرێت کە هیچ ڕێگەیەکیان لەبەردەمدا نییە بۆ تۆبە و گەڕانەوە غەیری شەڕ و کوشتن. وە لە کتێبدا نەك تەنها مرۆڤەکان بەڵکو ئاژەڵی کافرەکانیش ئەکوژرێن و لەناوئەبرێن، وە نەك تەنها باڵغەکان بەڵکو منداڵ و کۆرپەکانیش ئەکوژرێن، وە نەك تەنها پیاو بەڵکو ئافرەتەکانیش بێ جیاوازی هەموویان ئەکوژرێن، مەگەر هەندێك جار ئافرەتە کچەکان نەکوژرێن و سەربازەکان بۆ خۆیان هەڵیانبگرنەوە. وە دەقەکانی کتێب زۆر دەستەواژەی شمشێر و کوشتن دووبارە ئەکەنەوە و، وا هەستئەکەیت ئەوەی گرنگە کوشتنی خەڵك و تێکدانی شار و دێیەکانە نەوەك بانگەوازکردن بۆ حەق. وە ئەمە زوڵمێکیشە لەو خەڵکە کراوە لە کتێبدا، چونکە ئەشێ پرسیار و گومانیان هەبووبێت و دوای وەڵام وەرگرتن ئیمانیان بهێنایە و بهاتنایەتە ڕیزی ئیماندارانەوە. وە لە کتێبدا ئیمانهێنان گرنگ نییە هێندەی ژمارەی کوژراوی شەڕەکان. وە دەقی نەسیحەت و بانگەواز لە کتێبدا نابینیت مەگەر بە دەگمەن و ناڕوونی و نوقسانی. وەك ئەم دەقە دەگمەنەی پەیمانی کۆن (الملوك الأول / ١٨)، کە تیایدا پێغەمبەرێك تەحەدای پیاوانی دینێکی بتپەرست ئەکات، کە گەر ڕاست

ئەکەن و بتەکانیان وەڵامیان ئەدەنەوە با هاواریان بکەن بزانن خوای کامیان وەڵامیان ئەداتەوە. وە دوای ئەوەی خوا وەڵامی پێغەمبەرەکەی دایەوە پێغەمبەرەکە ڕاستەوخۆ هەموویانی کوشت. ئەمەش بەو جۆرە هەرچەندە سزایە دوای هێنانی بەڵگە، بەڵام هەر نوقسانە لەو ڕووەوە کە داوای تۆبەیان لێ نەکراوە و مۆڵەت نەدراون ئیمان بێنن.

وە گەر یەکێك بڵێت: خۆ لە ئیسلامیشدا جیهاد و بەکۆیلەکردن و حوکمی کوشتن هەیە، وە سزای مورتەدد هەیە. ئەی ئەوانە بۆچی خراپ نین و ڕازین بدرێنە پاڵ دینی خوا؟

لە وەڵامدا ئەڵێین:

١. لە ئیسلامدا دین بە شمشێر و خوێنڕشتن بڵاوناکرێتەوە، بەڵکو سەرەتا بە موناقەشە و نەسیحەت و هێنانی بەڵگەیە. کە دەیان دەقمان هێنایەوە لەسەر ئەوە. وە سەلماندمان کە ئەو کارە لە ئیسلامدا وەك ئەوە نییە کە لە دینی یەهود و نەصارادا هەیە، کە لای ئەوان بە هێزی شمشێر و کوشتنە.

٢. لە ئیسلامدا سزای هیچ قەومێکی کافر و لاڕێ نادرێت پێش نەسیحەت و ئیقامەی حوجحە لەسەریان (الإسراء - ١٥، ١٦). بەپێچەوانەی دینی

یەهود و نەصارا کە نەسیحەت و موناقەشە نییە، بەڵکو سوپا ڕێکئەخرێت و هەموو خەڵکی شارەکە و سامانەکانیان قڕ ئەکرێت.

٣. لە ئیسلامدا شەڕکردن و جیهاد هەیە و حوکم و ڕێی خۆی هەیە. وە هەرکەس و دینێك بەتەواوەتی شەڕ ڕەتبکاتەوە ئەوا ئەبێت زوڵم و تەعەدا لە هەموو کەس قبوڵ بکات. ئەمەش هیچ مەخلوقێکی عاقڵ قبوڵی ناکات چجا خوای گەورە سبحانە وتعالی. وە جیهاد لە ئیسلامدا حاڵەتی خۆی هەیە. یەکەمیان ئەو کاتەیە کە دوژمن هێرش ئەهێنێت بۆ سەر موسوڵمانان، کە ئەمەیان پێی ئەوترێت جیهادی پاڵنان (جهاد الدفع). وە ئەمە دوو عاقڵ تیای ڕاجیا نین کە شتێکی مەعقولە دیفاع لە نەفس و سامان و ناموست بکەیت. وە دووەمیان ئەو کاتەیە کە کافران نە ڕازین بەوەی بێنەوە سەر ڕێی ڕاست و واز لە کوفر و فەساد و زوڵم بێنن، نە ڕازیشن بەوەی شەرعی خوای گەورە حوکمیان بکات و لەسەر دینی خۆشیان بمێننەوە وەك پارێزراوێك (ذمي)، وە ئەمەیان پێی ئەوترێت جیهادی داواکردن (جهاد الطلب). وە هۆکارەکەشی ئەوەیە کە خوای گەورە ڕازی نییە لەسەر زەوییەکەیدا فەساد و زوڵم بڵاوببێتەوە، یان هیچ کەسێك خۆی لە خەڵك بکات بە خوا و حوکمیان بۆ داڕێژێت پێچەوانەی شەرعی خوای گەورە. بەڵکو دین تەنها دینی خوای گەورەیە، وە حوکم و بڕیار تەنها بۆ

خوای گەورەیە نەوەك بۆ مرۆڤ (الأنفال - ٣٩)، (یوسف - ٤٠)، (المائدة - ٥٠)، (التوبة - ٢٩)، (الکهف - ٢٦). کە ئەمەشیان هەموو خاوەن دین و فیکرێك بۆ خۆی پێی ڕازییە کە فیکرەکەی بڵاوبکاتەوە و زۆرترین کەس قەناعەتی پێبکات[٢٢] [٢٣] [٢٥]، وە بەرامبەرەکەی بە سەرلێشێواو و نادادپەروەر ئەبینێت[٢٢] [٢٣]. وە لە کۆن[٢٢] [٢٣] و تەنانەت لەم سەردەمەشدا[٢٩] [٣٠] ئامادەیە لەم پێناوەدا وڵاتان داگیربکات و چەکی ئەتۆمیش بەکاربێنێت. وە داگیرکارییەکانی ئەمەریکا و وڵاتانی ئەوروپا و ڕوسیا بۆ فەلەستین و سوریا و ئەفغانستان و عێراق و شانازیکردنی سەرۆکەکانیان بە کوشتنی کەسە دیار و سەرکردەکانی موسوڵمانان لە سەردەمی ئێمەدا شاردراوە نین. وە لە جەنگەکانیشیاندا هیچ یاسایەکی شەڕیان جێبەجێ نەکرد، بەو یاسایانەشەوە کە خۆیان نوسیبوویان و ئیمزایان کردبوو[٢٢] [٢٧] [٢٨]. وە مافی مرۆڤەکانیان نەدا کە بەو بانگەشەیە ئەو داگیرکارییانەیان کرد[٢٦] [٢٧] [٢٨].

٤. گەر موسوڵمانان بڕیاری ئەنجامدانی جیهادی داواکردنیاندا ئەوا ئیسلام ڕێ و شوێن و حوکمەکانی شەڕ و جەنگی پێ وتوون و، وەك شەڕەکانی کافران نین و زوڵم و دەستدرێژییان تیا نییە[٢٢] [٢٣] [٢٧] [٣٥]. کە هەندێك لە حوکمەکانی ئەمانەن: سەرەتا گەر کافران ئیسلامیان پێنەگەشتبوو ئەوا

بانگئەکرێن بۆی بێ زۆرلێکردن، جا گەر ڕازی نەبوون بە ئیسلام داوای جیزیەیان لێ ئەکرێت و ئەهێڵرێت لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە، پاشان گەر بەوەش ڕازی نەبوون ئەوسا شەڕیان ئەکرێت، وە لە شەڕیشدا خیانەتکردن حەرامە، وە شێواندنی لاشە حەرامە، وە منداڵ و ساوا ناکوژرێن، وە پیر و بەساڵاچوو ناکوژرێت، وە ئافرەت ناکوژرێت (مسند أحمد ٣/ ٣٣٥)، (صحيح مسلم - ١٧٣١)، (البقرة - ٢٥٦)، (تخريج سنن أبي داود - ٢٦١٤). جا جیهاد و شەڕکردن لە ئیسلامدا وەك دینەکانی تر نییە و بە ئارەزوو نییە و بە مەبەستی خوێنڕشتن نییە. وە سەیری چەند نموونەیەکی تر بکە لە کتێبی گاور و جوولەکەکاندا لەم بابەتەدا و جیاوازیی دەقەکان ببینە لەگەڵ دەقەکانی ئیسلامدا (التثنية ٢/ ٣٣ - ٣٥)، (التثنية ٣/ ٦ - ٨)، (التثنية ٧/ ١ - ٥)، (القضاة ٣/ ٣١)، (القضاة ١٤/ ١٩)، (القضاة ١٥/ ٤ - ١٦)، (صموئيل الثاني ٢٣/ ٨ - ٢٣)، (الملوك الثاني ١/ ١٠ - ١٢)، (أستير ٩/ ٥ - ١٠).

٥. لە ئیسلامدا ئەسڵ ئەوەیە هەموو مرۆڤێك سەربەست و ئازادە نەك کۆیلەی مرۆڤێکی تر بێت[١٥]. وە بەکۆیلەکردن ئیسلام دایناهێناوە بەڵکو پێشتر هەبووە[٢٢] [٢٣] [٣٤]. وە بەکۆیلەکردن لە دینی گاور و جوولەکەکان و دیموکراسییەتیشدا[٢٢] [٣٤] هەیە (يوسف - ١٩، ٢٠)، (اللاويين ٢٥/ ٤٤ -

٤٦)، (صموئيل الثاني ٥/ ١٣). وە ئیسلام هانی موسوڵمانان نادات خەم و ئامانجیان بەکۆیلەکردنی کافران بێت، وە هیچ ئایەتێك نییە لە قورئانی پیرۆزدا یان فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم هانی بەکۆیلەکردن بدات لە بنەڕەتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئیسلام زۆر ڕێگای داناوە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و هانی موسوڵمانان ئەدات بۆی[١٥] [٣٤].

لەو ڕێگایانەش: ئازادکردنی کۆیلە لەبری کەفارەتی چەند تاوانێك، ئازادکردنی کەنیزە گەر سکی لە خاوەنەکەی هەڵگرت، ئازادبوونی کۆیلە گەر خاوەن ڕەحمێکی خۆی بیکڕێتەوە (النساء - ٩٢)، (المائدة - ٨٩)، (المجادلة - ٣)، (البلد - ١٣)، (التوبة - ٦٠). وە بەکۆیلەکردن لە ئیسلامدا لە هەموو کاتێکدا ڕوونادات و وەك دینەکانی تر نییە هەرکات بتەوێت کەسێك بکەیت بە کۆیلەی خۆت[٣٤]. بەڵکو لە بنەڕەتدا تەنها لە کاتی شەڕی کافراندا ڕووئەدات[١٥] دوای ئەوەی کە کافرەکان ڕازی نەبوون بە ئیسلام یان جزیە وە شەڕیان هەڵبژاردووە. جا ئافرەت و منداڵەکانیان ئەبن بە کۆیلە[١٥] [٣١]. وە پیاوە باڵغەکانیان ئیمامی موسوڵمانان چوار بژاردەی هەیە و کامیانی بە باش و گونجاو بینی ئەوەیان هەڵئەبژێرێت[١٥] [١٨] [٣١] لەنێوان: ئازادکردنیان بێ بەرامبەر، ئازادکردنیان لە بەرامبەر پارە یان ڕادەستکردنی گیراوی موسوڵماندا لای کافران، کوشتنیان، بەکۆیلەکردنیان

(محمد - ٤). وە ئەبێت بزانین کە لای غەیری موسولْمانان هەندێك لەو بژاردانە نین، وەك ئازادکردن بێ بەرامبەر. وە کۆیلە لای ئەوان ئەو مافانەی نییە کە لە ئیسلامدا هەیەتی[٥] [١٥] [٢٢] [٢٣] [٣٤] (خروج ٢١/ ٢٠، ٢١).

﴿ لَقِيتُ أبَا ذَرٍّ بالرَّبَذَةِ، وعليه حُلَّةٌ، وعلَى غُلَامِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْتُهُ عن ذلكَ، فَقالَ: إنِّي سَابَبْتُ رَجُلًا فَعَيَّرْتُهُ بأُمِّهِ، فَقالَ لي النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: يا أبَا ذَرٍّ أعَيَّرْتَهُ بأُمِّهِ؟ إنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ، إخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أيْدِيكُمْ، فمَن كانَ أخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ ممَّا يَأْكُلُ، ولْيُلْبِسْهُ ممَّا يَلْبَسُ، ولَا تُكَلِّفُوهُمْ ما يَغْلِبُهُمْ، فإنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فأعِينُوهُمْ (صحيح البخاري - ٣٠) بە ئەبو ذەر گەشتم و جلێکی تازەی لەبەرا بوو وە خزمەتکارەکەشی جلێکی تازەی لەبەرا بوو، جا پرسیاری ئەوەم لێکرد، وتی: من جنێوم بە کەسێك دا و بە دایکی لەکەدارم کرد، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی وتم: ئەی ئەبو ذەر ئەوە بە دایکی لەکەدارت کرد؟ تۆ کەسێکی نەفامیت تیایە، براکانتان بەخششن خوا خستوونیێتییە ژێر دەستانەوە، جا هەرکەس براکەی لەژێر دەستیا بوو با لەوەی دەرخوارد بدات کە خۆی ئەیخوات وە با لەوە بکات بەبەریا کە خۆی لەبەری ئەکات، وە شتێکیان بەسەرا مەدەن نەیتوانن، وە گەر کارێکیشتان دانێ هاوکاریان بن ﴾، ﴿ ثَلَاثَةٌ لهمْ أجْرَانِ: رَجُلٌ مِن أهْلِ الكِتَابِ، آمَنَ بنَبِيِّهِ وآمَنَ بمُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عليه

وسلَّمَ، والعَبْدُ المَمْلُوكُ إذَا أدَّى حَقَّ اللَّهِ وحَقَّ مَوَالِيهِ، ورَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أمَةٌ فأدَّبَهَا فأحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وعَلَّمَهَا فأحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أجْرَانِ (صحيح البخاري - ٩٧) سێ کەس دوو جار پاداشتیان هەیە، پیاوێك لە خاوەنانی کتێب باوەڕی بە پێغەمبەرەکەی هێنابێت و باوەڕی بە موحەممەد هێنابێت صلى الله عليه وسلم، وە کۆیلەی خاوەندار گەر مافی خوا و خاوەنەکەی بدات، وە پیاوێك کەنیزەیەکی هەبێت جا تەربێتی بدات و تەربێتێکی جوانی بدات وە فێری بکات و باش فێری بکات پاشان ئازادی بکات و مارەی بکات ئەوە دوو پاداشتی هەیە ﴾، ﴿ لا يَقُلْ أحَدُكُمْ: أطْعِمْ رَبَّكَ وضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ، ولْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلايَ، ولا يَقُلْ أحَدُكُمْ: عَبْدِي أمَتِي، ولْيَقُلْ: فَتايَ وفَتاتي وغُلامِي (صحيح البخاري - ٢٥٥٢) کەستان نەڵێت: خواردنی خواکەت بدە ئاو بە بە خواکەت ئاوی خواکەت بدە، بەڵکو با بڵێ: گەورەم خاوەنم، وە کەستان نەڵێت: کۆیلەم کەنیزەم، وە بابڵێ: کوڕم وە کچم وە خزمەتکارم ﴾، (النساء - ٢٥، ٣٦)، (مسند أحمد - ٢٣٤٨٩). جا ئیسلام هات ڕێگە زۆرەکانی بەکۆیلەکردنی کرد بە یەك ڕێگە، وە چەندین ڕێگەی دانا بۆ ڕزگاربوون لێی، وە لە ماوەی کۆیلەبوونی کەسەکەشدا مافی نەفەوتاندووە و هەر وەك مرۆڤێکی بەڕێز مامەڵەی کردووە.

٦. لە ئیسلامدا ئەسڵ حەرامێتی کوشتنی نەفسەکانە[١٨]، وە کوشتنی هەر کەسێك بەناحەق تاوانێکی گەورەیە و لای خوای گەورە بکوژەکە وەك ئەوەیە هەموو خەڵکی کوشتبێت (المائدة - ٣٢)، (صحيح مسلم - ١٢١٨). بەڵام هەندێك تاوان هەن کە خوێنی تاوانبارەکە حەڵاڵ ئەکەن و دەسەڵاتی ئیسلام تاوانبارەکە ئەکوژێت. وە ئەبێت ئەوە بزانین کە حوکمی کوشتن لە ئیسلامدا حاکم (قازی) دوای لێکۆڵینەوە و دوای چەسپینی تاوانەکە لەسەر کەسەکە لەلای دەریئەکات و جێبەجێی ئەکات[١٨]. وە بە ئارەزوو و بۆ چێژوەرگرتن لە کوشتن نییە. وە تاوانبار گەر شوبهە هەبێت لەسەر چەسپینی تاوانەکە لەسەری ئەوا ناکوژرێت تا تاوانەکەی لەسەر ئەچەسپێت[١٨]. وە ئەوانەی کە لە ئیسلامدا شایەنی کوشتنن ئەمانەن: ژن یان پیاوێك کە هاوسەرگیرییان کردبێت و دواتر زینا بکەن، کەسێك نەفسێکی کوشتبێت بە ناحەق، هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، دژایەتیکەری ئیسلام و موسوڵمانان ﴿ لا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأَنِّي رَسولُ اللَّهِ، إلَّا بإحْدَى ثَلاثٍ: النَّفْسُ بالنَّفْسِ، والثَّيِّبُ الزَّانِي، والمارِقُ مِنَ الدِّينِ التَّارِكُ لِلْجَماعَةِ (صحيح البخاري - ٦٨٧٨) خوێنی هیچ کەسێکی موسوڵمان حەڵاڵ نییە شایەتمانی هێنابێت مەگەر بە سێ شت: نەفسێکی کوشتبێت، وە پیاو و ژنی داوێنپیس، وە دەرچوو لە دین جێهێڵەری کۆمەڵی موسوڵمانان ﴾، (النساء

- ٩١). وە تەنها ئاینی ئیسلام نییە کە لە بەرامبەر تاواندا سزای کوشتنی هەیە، بەڵکو لە دینەکانی تر و تەنانەت دیموکراسییەتیشدا هەیە[٢٢] [٢٣].

وە هۆی کوشتن لای ئەوان ئەشێ لە ئیسلامدا هۆکار نەبێت بەتایبەتی لە دیموکراسییەتدا، چونکە لە دینی دیموکراسییەتدا لەسەر بنەمای ڕای زۆرینە بڕیارئەدرێت. وە لە ئیسلامدا حەرامە لاشەی مردووەکە بشێوێنرێت، وە دوای کوشتنی ئەنێژرێت. جیا لە دینەکانی تر کە لای بەشێکیان نەك مەرج نییە ڕێ لە شێواندنی جەستەکە بگیرێت[٢٢]، بەڵکو ئەشێ بەبیانووی لێکۆڵینەوە و زانستەوە دەستکاری بکرێت، وە دوای کوشتنی مەرج نییە بینێژن بەڵکو لەوانەیە بسوتێنرێت یان بدرێتە دەم ئاژەڵەکان بیخۆن.

٧. لە ئیسلامدا کەس بە زۆر ئیسلام نادرێت بەسەریدا، بەڵکو دینی بۆ ڕوونئەکرێتەوە و داوای لێئەکرێت موسوڵمان ببێت، جا گەر قبوڵیکرد موسوڵمانە، وە گەر ڕەتیکردەوە ئەوا خۆی لە ئەنجامەکەی بەرپرسیارە کە جەهەننەمە بۆ هەتا هەتایە ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (البقرة - ٢٥٦) زۆرکردن نییە لە دیندا، لەبەرئەوەی ڕێگای ڕاست لە چەوتی ڕوونبووەوە، جا هەرکەس کافربێت بە تاغوت و ئیمان بە الله بهێنێت ئەوا دەستی بە پەتی بەهێزەوە گرتووە هیچ پچڕانی

نییە، وە خوا بیسەر و زانایە ﴾، ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا (الكهف - ٢٩) وە بڵێ حەق لەلای پەروەردگارتانەوەیە جا کێ ئەیەوێت ئیمان بێنێت وە کێ ئەیەوێت کافربێت، ئێمە بۆ ستەمکاران ئاگرێکمان ئامادە کردووە چواردەوریانی گرتووە، وە گەر داوای ئاو بکەن ئاوێکیان ئەدرێتێ وەك زەیت و مسی تواوەیە دەموچاو ئەبرژێنێت، خراپترین خواردنەوەیە وە جێیەکی خراپە ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (التحريم - ٧) ئەی کافران ئەمڕۆ بیانوو مەهێننەوە، چونکە تەنها پاداشتی ئەوە ئەدرێنەوە کە ئەتانکرد ﴾. وە گەر ئیسلامی وەرگرت ئەوا ئەبێت پابەندی واجباتەکان بێت، وە بزانێت کە ئەرکی لەسەر شانە بەرامبەر خوای گەورە و موسوڵمانان، وە لەبەرامبەریشدا خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی ئەیخاتە بەهەشتەوە بۆ هەتا هەتایە. جا گەر دوای ئەوەی بە ئازادانە موسوڵمان ببوو وازی لە ئیسلام هێنا، ئەوا لە دین هەڵئەگەڕێتەوە و بە مورتەدد حسابە[١٥]. وە کەسی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام (مورتەدد) جیایە لە کەسێك کە لە ئەسڵا ئیسلامی هەڵنەبژاردووە (کافری ئەسڵی). وە لە حاڵەتی پەشیمانبوونەوەدا کەسەکە

داوای لێ ئەکرێت بگەڕێتەوە بۆ ناو ئیسلام[١٥]، وە مۆڵەتی ئەدرێتێ تا بگەڕێتەوە[١٥] [١٨]، جا گەر گەڕایەوە ئەوا موسوڵمانە و هیچ سزایەك نادرێت[١٥] [١٨] [٣١]، وە گەر دوای ماوەی مۆڵەتەکە نەگەڕایەوە ئەوا ئەکوژرێت لەلایەن دەسەڵاتەوە نەوەك خەڵك[١٥] [١٨] [٣١]، وە ئەمە دوای ئەوەی تۆمەتی هەڵگەڕانەوەکەی لەسەر چەسپاوە[١٥]. ئەمە و لە دینەکانی تریشدا حوکمی هەڵگەڕانەوە هەیە[٢٣] [٣٢]، بەڵام گوێ نادەن بەو جیاوازیکردنە لە نێوان کەسێك کە دینەکەی وەرنەگرتووە لە بنەڕەتدا و کەسێك وەریگرتووە و دواتر لێی گەڕاوەتەوە، وە سزای قورسی ئەوانە ئەدەن کە شوێن دینەکەیان ناکەون بە جۆرەها سزا کە کوشتنیشی تێدایە (عزرا ٧/ ٢٦)، (لوقا ١٩/٢٧). وە بێ ئەوەی مۆڵەتی گەڕانەوە بدەن لە ریددەکە و بێ ئەوەی حاکم حوکم بدات، وە بە سنوور بەزاندن و سزادانی بێ تاوانەکان (التثنية ١٣/ ٦ - ١٧)، (التثنية ١٧/ ٢ - ٧).

جا کە ئەمانەمان زانی ئێستە ئەڵێین: بەڵێ کوشتنی تاوانباران و جیهادی کافران و بەکۆیلەکردنی کافری شەڕانی و کوشتنی مورتەدد، حوکمی خوای گەورەن و لە

دینەکەیدا دایناون بەو شێوەیەی کە خۆی بە جوانی دایڕشتووە، نەوەك بەو جـۆرەی یەهود و نەصارا بەدرۆوە ئەیدەنە پاڵی.

# بابەتی دووەم

## دەقەکان دەربارەی هاوسەرگیری

یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی ژیانی دنیا هاوسەرگیری و خستنەوەی وەچەیە، وە گرنگی ئەم بابەتە لەوەدایە کە پیاو شەهوەتێکی هەیە و پێویستی بە ئافرەتـە، وە ئـافرەت پێویسـتی بـە سەرپەرشـتیکردن و بەخێوکردنـە لەلایـەن پیـاوەوە، وە هەردووکیشیان پێویستیان بە نەوەیەکە کـە پشـتیوان و یارمەتیـدەریان بێـت، وە دوای خۆشیان جێیانبگرێتەوە و بەردەوامی بە ژیانی مرۆڤ بدات لەسەر زەوی.

وە هاوسەرگیری چـەندین بابـەتی تیایـە لـە: مەرجـەکانی دوو هاوسـەرەکە، ئـەو ئافرەتانەی کە بۆ پیاو حەڵاڵە هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکات و ئەوانەی لێی حەرامە، چۆنیەتی چوون بەلای خێزاندا، ژمارەی هاوسەرەکان لە یـەك کاتـدا، حوکمـەکانی جیابوونەوە، وە بابەتی تر. جا با بزانین قورئانی پـیرۆز و کتێـب چـۆن باسـی ئـەم بابەتانە ئەکەن.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– وخرجت دينة بنت ليئة التي ولدتها ليعقوب، لترى بنات البلد (١) فرآها شكيم بن حمور الحوي، رئيس البلد، فأخذها وضاجعها واغتصبها (٢) وتعلقت نفسه بدينة بنت يعقوب وأحب الفتاة وخاطب قلبها (٣) وكلم شكيم حمور أباه قائلا: (( خذ لي هذه الفتية زوجة )) (٤) وسمع يعقوب أن شكيم قد دنس دينة ابنته، وكان بنوه مع ماشيته في البرية، فسكت حتى رجعوا (٥) فخرج حمور أبو شكيم إلى يعقوب ليخاطبه (٦) وجاء بنو يعقوب من الحقل، ولما سمعوا بالأمر، شق على القوم وغضبوا جدا، لأن شكيم قد صنع فاحشة في إسرائيل، إذ ضاجع ابنة يعقوب، ومثل ذلك لا يصنع (٧) فتكلم حمور معهم قائلا: ((إن شكيم ابني قد تعلقت نفسه بابنتكم، فأعطوه إياها زوجة (٨) وصاهرونا: أعطونا بناتكم واتخذوا بناتنا (٩) وأقيموا معنا، وهذه الأرض أمامكم، أقيموا فيها وجولوا وتملكوا )) (١٠) وقال شكيم لأبيها وإخوتها: (( أنال حظوة في عيونكم، وما يطلبونه مني أعطيه (١١) أكثروا علي المهر والعطية جدا، فأعطيكم كما تطلبون مني، وأعطوني الفتاة زوجة )) (١٢) فأجاب بنو يعقوب شكيم وحمور أباه وكلموهما بمكر لأن شكيم دنس دينة أختهم (١٣) وقالوا لهما: (( لا نستطيع أن نصنع هذا: أن نعطي

أختنا لرجل أقلف، لأنه عار عندنا (١٤) ولا نوافقكم على ذلك إلا إذا صرتم مثلنا بأن يختن كل ذكر منكم (١٥) فنعطيكم بناتنا ونتخذ بناتكم ونقيم عندكم ونصير شعبا واحدا (١٦) وإن لم تسمعوا لنا ولم تختتنوا، نأخذ ابنتنا ونمضي )) (١٧) (تكوين / ٣٤) دینەی کچی لەیئە کە لە یەعقوب ببووی دەرچوو تا کچانی ناوچەکە ببینێت (١) جا شەکیمی کوڕی حەموری حەوی بینی کە سەرۆکی ناوچەکە بوو، جا بردی و لەگەڵی جووت بوو و دەستدرێژی کردە سەر (٢) وە نەفسی بە دینەی کچی یعقوبەوە پەیوەست بوو وە خۆشی ویست و دڵی چووە سەر (٣) وە شەکیم حەمور قسەی لەگەڵ باوکیدا کرد وتی: (ئەم کچەم بۆ بێنە ببێتە ژنم) (٤) وە یەعقوب بیستییەوە کە شەکیم دینەی کچی خراپکردووە، وە کوڕەکانی لەگەڵ ماڵاتەکانیدا بوون لە دەشت، جا بێدەنگ بوو تا گەڕانەوە (٥) جا حەمور باوکی شەکیم هاتە لای یەعقوب تا داخوازی بکات (٦) وە کوڕەکانی یەعقوب هاتنەوە لە بێستانەکە وە کە شتەکەیان بیست، زۆر قورس بوو بۆیان و زۆر تووڕە بوون، چونکە شەکیم داوێنپیسی کردبوو لە ئیسرائیلدا کە لەگەڵ کچەکەی یەعقوبدا جووت ببوو، وە شتی وا ناکرێت (٧) جا حەمور قسەی لەگەڵکردن وتی: (شەکیمی کوڕم دڵی بە کچەکەتانەوە پەیوەست بووە، جا وەك ژنی بیدەنێ (٨) وە خزمایەتیمان بکەن، کچەکانتانمان بدەنێ و لە کچەکانمان ببەن

(٩) وە لەگەڵمان دانیشن، وە ئەوەش زەوییە لەبەردەمتان تیایا نیشتەجێ بن و بێن و بچن و موڵکداری بکەن) (١٠) جا شەکیم بە باوك و براکانی وت: (لێم ڕازی بن، وە ئەوەی داوای ئەکەن ئەیدەم (١١) مارەیی و دیارییەکەم لەسەر زیاد بکەن ئەتاندەمێ وەك ئەوەی داوایئەکەن، وە کچەکەم بدەنێ ببێت بە ژنم) (١٢) جا منداڵەکانی یەعقوب وەڵامی شەکیم و حەموری باوکیان دایەوە وە بە فێڵەوە قسەیان لەگەڵ کردن چونکە شەکیم دینەی خوشکیانی خراپکردبوو (١٣) وە پێیان وتن: (ناتوانین وابکەین خوشکەکەمان بدەین بە پیاوێکی خەتەنە نەکراو، چونکە عەیبە لەلای ئێمە (١٤) وە ڕازی نین لەگەڵتان بەوە مەگەر وەك ئێمەتان لێبێت بەوەی هەموو نێرێکتان خەتەنە بکرێت (١٥) جا کچەکانمانتان ئەدەینێ و ژنتان لێدێنین وە لەگەڵتان ئەژین و ئەبین بە یەك گەل (١٦) وە گەر گوێبیستمان نەبن و خەتەنە نەکرێن کچەکەمان ئەبەین و ئەڕۆین (١٧).

— ونزل شمشون إلى تمنة، فرأى في تمنة امرأة من بنات فلسطين (١) فصعد وأخبر أباه وأمه وقال: (( رأيت في تمنة امرأة من بنات الفلسطينيين، فاتخذاها الآن لي زوجة )) (٢) فقال له أبوه وأمه: (( أليس في بنات إخوتك وفي شعبي كله امرأة، حتى تذهب وتأخذ امرأة من الفلسطينيين القلف؟ )) فقال شمشون لأبيه: ((بل إياها تأخذ لي، لأنها حسنت في عيني )) (٣) ولم يعلم أبوه وأمه

أن هذا كان من قبل الرب وأنه كان يطلب علة على الفلسطينيين، وكان الفلسطينيون في ذلك الزمان متسلطين على إسرائيل (٤) (القضاة / ١٤) وە شەمشون دابەزییە تیمنە وە لە تیمنە ئافرەتێکی بینی لە کچەکانی فەلەستین (١) جا سەرکەوت و بە باوك و دایکی وت: (لە تیمنە ئافرەتێکم بینی لە کچەکانی فەلەستین جا ئێستە بیکەن بە ژنم) (٢) جا دایك و باوکی پێیان وت: (ئەی لە کچی براکانتا و لە هەموو گەلەکەمدا ئافرەت نییە، هەتا بچیت و لە فەلەستینییە خەتەنەنەکراوەکان ئافرەت بێنیت؟) جا شەمشون بە باوکی وت: (بەڵکو ئەوەیانم بۆ دێنیت، چونکە لە چاومدا جوانە) (٣) وە باوك و دایکی نەیانزانی کە ئەمە لەلایەن خواوەیە و بەدوای دەرفەتدا دەگەڕا لە دژی فەلەستینییەکان، وە لەو سەردەمەدا فەلەستینییەکان زاڵ بوون بەسەر ئیسرائیلدا (٤).

- وأحب الملك سليمان نساء غريبة كثيرة مع ابنة فرعون، من الموأبيات والعمونيات والأدوميات والصيدوبيات والحثيات (١) من الأمم التي قال الرب لبني إسرائيل في شأنها: ((لا تذهبوا إليهم ولا يذهبوا إليكم، فإنهم يستميلون قلوبكم إلى اتباع آلهتهم )). فتعلق بهن سليمان حبا لهن (٢) وكان له سبع مئة زوجة وثلاث مئة سرية، فأزاغت نساؤه قلبه (٣) وكان في زمن شيخوخة سليمان أن أزواجه أستملن قلبه إلى اتباع آلهة أخرى، فلم يكن

قلبه مخلصا للرب إلهه، كما كان قلب داود أبيه (٤) وتبع سليمان عشتاروت، إلاهة الصيدويين، وملكوم، قبيحة بني عمون (٥) وصنع سليمان الشر في عيني الرب، ولم يتبع الرب أتباعا تاما مثل داود أبيه (٦) حينئذ بنى سليمان مشرفا لكاموش، قبيحة موآب، في الجبل الذي شرقي أورشليم، ولمولك، قبيحة بني عمون (٧) وكذلك صنع لجميع نسائه الغريبات اللواتي كن يحرقن البخور ويذبحن لآلهتهن (٨) فغضب الرب على سليمان، لأن قلبه مال عن الرب، إله إسرائيل، الذي تراءى له مرتين (٩) وأمره في ذلك أن لا يتبع آلهة أخرى، فلم يحفظ ما أمره الرب به (١٠) فقال الرب لسليمان : ((بما أن أمرك هذا، وأنت لم تحفظ عهدي وفرائضي التي أمرتك بها، فسأنتزع الملك عنك وأسلمه إلى عبدك (١١) (الملوك الأول / ١١) وە سولەیمانی پاشا حەزی لە ئافرەتانێکی بێگانەی زۆر کرد لەگەڵ کچەکەی فیرعەوندا، لە موئابییەکان وە عەموییەکان وە ئەدومییەکان وە صیدوبییەکان وە حیسییەکان (١) لەو گەلانەی خوا دەربارەیان بە بەنی ئیسرائیلی وت: (مەچن بەلایانا وە نەیەن بەلاتانا، چونکە ئەوان دڵتان ڕائەکێشن بۆ پەرستنی خواکانیان). جا سولەیمان پێیانەوە پەیوەست بوو بە خۆشویستنیان (٢) وە حەوتسەد ژن و سێسەد کەنیزەی هەبوو، جا ژنەکانی دڵیان هەڵگێڕایەوە (٣) وە لە دەمی پیرێتی سولەیماندا ژنەکانی دڵیان ڕاکێشا

بەلای خوای تردا، جا دڵی دڵسۆز نەبوو بۆ یەزدانی خواکەی وەك دڵی داودی باوکی (٤) وە سولەیمان شوێن عەشتارۆت کەوت خـواژنی سـەیدوییەکان، وە مەلکوم خواوەندی قێزەونی بەنی عـەمۆن (٥) وە سـولەیمان خراپـەیکرد لـە چاوی خوادا، وە شوێن خوا نەکەوت شوێنکەوتنێکی تەواو وەك داودی باوکی (٦) ئەوکات سولەیمان نزرگەیەکی بۆ کاموش قێزەونـی موئـاب لـە شـاخی ڕۆژهەڵاتی ئۆرشەلیم دروستکرد، وە بۆ مولەك قێزەونی بەنی عەمۆن (٧) وە بەهەمان شێوە بۆ هـەموو ژنـە بێگانـەکانی دروسـتکرد ئەوانـەی بخوریـان ئەسووتاند و قوربانییان بۆ خواکانیان ئەکرد (٨) جا خوا لە سولەیمان تـووڕە بوو چونکە دڵی لایدا لە خـوا پـەروەردگاری ئیسـرائیل کـە دوو جـار بـۆی دەرکەوت (٩) وە تیایانا فەرمانی پێکرد کە شوێن خوای تر نەکـەوێت، جـا فەرمانەکەی پـەروەردگاری نەپاراسـت (١٠) جـا خـوا بـە سـولەیمانی وت: (چـونکە هەڵوێسـتت وایـە و پەیمانەکـەم و فەرمانـەکانمت نەپاراسـت کـە پێمتبوویت، موڵکەکەت لێئەسێنم و ئەیدەم بە خزمەتکارەکەت (١١).

— فأقـام بنـو إسـرائيل بـين الكنعـانيين والحـثين والأمـوريين والفـرزيين والحـويين واليبوسيين (٥) واتخذوا بناتهم زوجات لهم وأعطـوا بنـاتهم لبنـيهم، وعبـدوا آلهتهم (٦) وصنع بنو إسـرائيل الشـر في عـيني الـرب، ونسـوا الـرب إلههـم، وعبدوا البعل والعشتاروت (٧) فغضب الرب على إسرائيل، وباعهم إلى يـد

كوشان رشعتائيم، ملك أدوم، واستعبد بنو إسرائيل لكوشان رشعتائيم ثماني سنين (٨) (القضاة / ٣) جا بەنو ئیسرائیل لەناو کەنعانی و حیسی و ئەموری و فیرزی و حویی و ئەلیبوسییەکاندا نیشتەجێ بوون (٥) وە لە کچەکانیان ژنیان هێنا و کچەکانی خۆیان دا بە کوڕەکانیان، وە خواکانیان پەرستن (٦) وە بەنو ئیسرائیل لە چاوی خوادا خراپەیان کرد، وە خوای یەزدانیان لەبیرکرد، وە بەعل و عەشتاروتیان پەرست (٧) جا خوا لە ئیسرائیل تووڕە بوو، وە فرۆشتنییە دەستی کوشان ریشعتائیم پاشای ئەدۆم، وە بەنو ئیسرائیلی کرد بە کۆیلەی کوشان ریشعتائیم بۆ هەشت ساڵ (٨).

- لە هەندێك لەم دەقانەدا ئەبێت دوو هاوسەرەکە لەسەر هەمان دین بن، وە نابێت ئیماندار هاوسەرگیری لەگەڵ بتپەرستدا بکات، وە ئەوە تاوانە و ئەبێتە هۆی سزادانی خوا. بەڵام لە هەندێکی تریاندا چەند عەبدێکی ئیماندار ئەو کارەیان کردووە و خوا سزای نەداون و ڕێی لێ نەگرتوون، بەڵکو هەندێکیان خوا خۆی فەرمانی پێکردوون وا بکەن. جا ئەم دەقانە پێکەوە دژیەکن و حوکمەکە ڕوون ناکەنەوە.

– إذا أقام أخوان معا، ثم مات أحدهما وليس له ابن، فلا تصر امرأة الميت إلى خارج، لرجل غريب، بل أخو رجلها يدخل عليها ويتخذها امرأة له، وهو يقوم نحوها بواجبه كأخي الرجل (٥) ويكون البكر الذي تلده منه هو الذي

يحمل اسم أخيه الميت، فلا يمحى اسمه من إسرائيل (٦) فإن لم يرض الرجل أن يتخذ امرأة أخيه، فلتصعد امرأة أخيه إلى باب المدينة إلى الشيوخ، وتقل: قد أبى أخو زوجي أن يقيم لأخيه اسما في إسرائيل، ولم يرضني زوجة (٧) فيستدعيه شيوخ مدينته ويكلمونه في ذلك. فإن أصر وقال: إني لا أرضى أن أتخذها (٨) تتقدم إليه امرأة أخيه حضرة الشيوخ وتخلع نعله من رجله، وتبصق في وجهه وتجيبه قائلة: هكذا يصنع بالرجل الذي لا يبني بيت أخيه (٩) فيدعى في إسرائيل بيت المخلوع النعل (١٠) (التثنية / ٢٥) گەر دوو برا پێکەوە ژیان وە یەکێکیان مرد و کوڕی نەبوو ئەوا ژنی مردووەکە بۆ دەرەوە نابێت بۆ پیاوێکی نامۆ، بەڵکو برای پیاوەکەی ئەچێتە لای و ئەیکات بە ژنی خۆی، وە واجبی خۆی بەرامبەری ئەکات وەك برای مێردەکەی (٥) وە نۆبەرەکەی ئەیبێت لێی ئەو ناوی برا مردووەکەی هەڵئەگرێت، جا ناوی ناسڕدرێتەوە لە ئیسرائیلدا (٦) جا گەر پیاوەکەی ڕازی نەبوو کە ژنی براکەی بهێنێت، ئەوا ژنی براکەی بچێتە دەرگای شارەکە بۆ لای پیرەکان و بڵێت: ئەوا برای مێردەکەم نایەوێت ناو بۆ براکەی دروستبکات لە ئیسرائیلدا وە منی ناوێت وەك ژنی (٧) جا پیرەکانی شارەکەی بانگی ئەکەن و قسەی لەگەڵ ئەکەن لەسەر ئەوە، جا گەر سوور بوو و وتی: من ئەو ژنە ناهێنم (٨) ژنی براکەی ئەچێتە پێشەوە لێی بە

ئامادە بوونی پیرەکان و پێڵاوی پیاوەکە دائەکەنێت و تف ئەکاتە دەموچاوی و وەڵامی ئەداتەوە و ئەڵێت: ئاوا لـە پیاوێـك ئـەکرێت کـە مـاڵی براکـەی دروستناکات (٩) جا لە ئیسـرائیلدا ناوئـەنرێت مـاڵی پـێڵاو داکەنراوەکـە (١٠).

– واتخذ يهوذا زوجة لعير بكره أسمها تامار (٦) وكان عير، بكر يهوذا، شريرا في عيني الرب، فأماته الرب (٧) فقال يهوذا لأونان: (( ادخل على امرأة أخيك وقم بواجب الصهر وأقم نسلا لأخيك )) (٨) وعلم أونـان أن النسـل لا يكـون له، فكان إذا دخل على امرأة أخيه، استمنى على الأرض، لـئلا يجعـل نسـلا لأخيه (٩) فقبح ما فعله في عيني الرب، فأماته أيضا (١٠) (( فقال يهـوذا لتامار كنته: (( أقيمي أرملة في بيت أبيك حتى يكـبر شـيلة ابـني )). لأنـه كان يقول: ((يخشى أن يموت هو أيضا كأخويه )). فمضـت تامـار وأقامـت في بيت أبيها (١١) (تكوين / ٣٨) یەهوذا ژنێکی بـۆ عـیر نۆبەرەکـەی هێنـا ناوی تامار بوو (٦) وە عیر نۆبەرەی یەهوذا بوو وە لە چـاوی خـوادا خـراپ بوو، جا خوا کوشتی (٧) جا یـەهوذا بـە ئۆنـانی وت: (بچـۆ بـۆ لای ژنـی براکەت وە ئەرکی برایەتی جێبەجێ بکە و نەوە بۆ براکەت بخـەرەوە) (٨) وە ئۆنان زانی کە نەوەکە بۆ ئەو نابێت، جا هـەر کاتێـك لەگـەڵ ژنـی براکـەی سەرجێیی بکردایە تۆواوەکەی ئەڕژاندە سەر زەوی بۆئەوەی نەوە بـۆ براکـەی

نەخاتەوە (٩) جا ئەوەی کردی زۆر ناشرین بوو لە چاوی خـوادا وە ئەویشـی کوشت (١٠) جا یەهوذا بە تاماری بووکی وت: (لە ماڵی باوکت بە بێوەژنی دانیشە تا شەیلەی کوڕم گەورە ئەبێت). چونکە ئەیوت: (ئەترسا ئەویش وەك دوو براکەی بمرێت). جا تامار ڕۆشت و لە ماڵی باوکی دانیشت (١١).

- بەپێی ئەم دەقانە گەر ئافرەت مێردی بمرێت ئەوا ئەبێت بـەزۆر و بـێ ڕەزامەندی شوو بکاتەوە بە برای مێردەکـەی و، بـۆی نییـە شـوو بـە یەکێکی تر بکات. وە پیاوەکەش بۆی نییە ناڕازی بێت. وە گـەر ئـەم دوو هاوسەرە منداڵیان ببێت ئـەوا منداڵەکـە ئەدرێتـە پـاڵ مێـردی یەکەم نەوەك باوکەکە کە مێردەکەی ئێسـتایەتی. وە بـەوەش بـاوانی منداڵەکە ئەشێوێت و کەسێك بە باوکی ئەزانێت کە بـاوکی نییـە. وە مێردی دووەم منداڵێك بەخێو ئەکات کە نە بە بـاوکی ئـەزانێت و نـە سۆزی بۆی هەیە، وە باوکەکە لە مافی باوکایەتی بێبـەش ئـەبێت. وە گەر پیاوەکە بەم زوڵمانە ڕازی نەبێت و ئەم ئافرەتـە نـەهێنێت، ئـەوا سوکایەتی پێئەکرێت و بە تاوانبار دائەنرێت و خوا سزای ئەدات.

– وصار لجدعون سـبعون ابنـا خرجـوا مـن صـلبه، لأنـه تـزوج نسـاء كـثيرات (القضاة ٨/ ٣٠) وە جیدعۆن حەفتا کوڕی بوو لـە پشـتی، چـونکە ژنێکـی زۆری هێنا.

– وتزوج داود أيضا سراري وزوجات من أورشليم، بعد مجيئه مـن حـبرون، وولـد أيضا لداود بنون وبنات (صموئيل الثـاني ٥/ ١٣) وه داود چـەند کـەنیزه و ژنێکی تری هێنا له ئۆرشەلیم دوای هاتنی له حیبرۆن، وه داود کوڕ و کچـی بوو.

– وأحب الملك سليمان نساء غريبة كثيرة مع ابنة فرعـون، .. (١) .. وكـان لـه سبع مئة زوجة وثلاث مئة سرية (٣) (الملوك الأول / ١١) وه سولەیمانی پاشا حەزی له ئافرەتانێکی بێگانەی زۆر کرد لەگەڵ کچەکەی فیرعەونـدا، .. (١) .. وه حەوت سەد ژن و سێ سەد کەنیزەی هەبوو (٣).

- بەپێی ئەم دەقانه بێت پیاو چەند ژنی بوێـت ئـەتوانێت بیهێنێـت لـه هەمان کات وه سنور نییه بۆ ژمارەیان. وه مافی هاوسەرەکان لەسـەر پیاوەکه دیارینەکراوه له: نەفەقه، جێی ژیان، دابەشکردنی شەوەکان.

– فقال شاول: " هذا ما تقولونه لداود: ليست رغبة الملك في المهر، ولكنـه يريـد مئة قلفة بن الفلسطينيين انتقاما من أعداء الملك ". وكان شاول قـد أضـمر أن يوقـع داود في يـد الفلسـطينيين (٢٥) فـأخبرت حاشـية شـاول داود بهـذا الكلام، فحسن الأمر في عيني داود أن يصاهر الملـك. فلـم تـتم الأيـام (٢٦) حتى قام داود وذهب هو ورجاله وقتل من الفلسطينيين مئتي رجل جاء داود بقلفهم، فسلمت بتمامها إلى الملك ليصاهره. فزوجه شاول ميكال ابنته (٢٧)

(صموئيل الأول / ١٨) جا شاول وتی: "ئاوا بە داود بڵێن: خۆشی پاشا لە شیربایی نییە، بەڵکو بە سەد پێستی سەری ئەندامی نێرینەی فەلەستینییەکانە، بۆ تۆڵەسەندن لە دوژمنانی پاشا". وە شاول ئەوەی لە دڵدابوو داود بخاتە دەست فەلەستینییەکان (٢٥) جا خزمەتکارەکانی شاول ئەو قسەیەیان بە داود وت، وە داودیش ئەوەی پێ باشبوو ببێت بە زاوای پاشا. جا پێش ئەوەی ماوەکە تەواوببێت (٢٦) داود هەستا خۆی و پیاوەکانی و دوو سەد پیاوی لە فەلەستینییەکان کوشت و گۆشتی سەری زەکەریانی هێنا، وە تەواوی هەمووی دا بە پاشا تا بیکات بە زاوای. جا شاول میکالی کچی دایە (٢٧).

- بەپێی ئەم دەقانە مارەیی ئافرەت مەرج نییە پارە یان شتێکی پاك و بەنرخ بێت. بەڵکو ئەشێ گۆشتی بڕدراوی زەکەری پیاو بێت. وە ئایا ئەو پارچە گۆشتانە ئەدرێن بە ئافرەتەکە یان بەکێ؟ وە چییان لێ ئەکات؟ ئەوانەش کتێب ڕوونی نەکردووەتەوە. وە ئەم دەقانە زیان بە پلە و پێگەی ئافرەت ئەدەن و ئافرەت بێ ڕێز و سوك ئەکەن.

– إذا اتخذ رجل امرأة ودخل عيها ثم أبغضها (١٣) فنسب إليها ما يحمل على الثرثرة، وأذاع عنها سمعة سيئة فقال: إني اتخذت هذه المرأة، فلما دنوت منها، لم أجدها عذراء (١٤) يأخذ الفتاة أبوها وأمها ويخرجان علامة بكارة

الفتاة إلى شيوخ المدينة، إلى الباب (١٥) ويقول أبوها للشيوخ: إني أعطيت ابنتي امرأة لهذا الرجل فأبغضها (١٦) وها هوذا قد نسب إليها ما يحمل على الثرثرة قائلا: لم أجد ابنتك عذراء. وهذه علامة بكارة ابنتي. ويبسطان المنديل أمام شيوخ المدينة (١٧) فيأخذ شيوخ المدينة ذلك الرجل ويؤدبونه (١٨) ويغرمونه مئة من الفضة يدفعونها إلى أبي الفتاة، لأن الرجل أذاع سمعة سيئة على عذراء من إسرائيل. وتكون له امرأة، ولا يستطيع أن يطلقها طول أيامه (١٩) (التثنية / ٢٢) گەر پیاوێك ژنێكی هێنا و لەگەڵی جووت بوو پاشان ڕقی لێی بووەوە (١٣) جا قسەی بۆ هەڵبەست، وە ناوبانگێكی خراپی دایە پاڵی و وتی: من ئەم ژنەم هێنا جا كە لێی نزیك بوومەوە پەردەی كچێنی نەبوو (١٤) باوك و دایكی كچەكە بەڵگەی كچێنی كچەكە ئەبەن بۆ پیرەكانی شارەكە بۆ لای دەرگاكە (١٥) وە باوكی بە پیرەكان ئەڵێت: من كچەكەمم داوە بەم پیاوە جا ڕقی لێیەتی (١٦) وە ئەوەتا قسەی بۆ هەڵبەستووە و ئەڵێت: كچەكەت پەردەی كچێنی نەبووە. وە ئەوە بەڵگەی كچێنی كچەكەمە. وە هەردووكیان جلەكە لەبەردەم پیرانی شارەكە ڕائەخەن (١٧) جا پیرانی شارەكە ئەو پیاوە ئەبەن و تەمبێی ئەكەن (١٨) وە سەد زیو غەرامەی ئەكەن و ئەیدەن بە باوكی كچەكە، چونكە

پیاوەکە ناوبانگی خراپی بڵاوکردووەتەوە لەسەر کچێکی پاکیزەی ئیسرائیل. وە ئافرەتەکە ئەبێت بە ژنی، وە ناتوانێت تەڵاقی بدات هەموو ژیانی (١٩).

- بەگوێرەی ئەم دەقانە بێت گەر پیاوێك نەتوانێت بیسەلمێنێت کە ژنەکەی کچ نەبووە کاتێك هێناویەتی، ئەوا سزا ئەدرێت و ئەو ئافرەتە بەزۆر ئەبێت بە ژنی و هەتا هەتایە ناشبێت لێی جیابێتەوە، هەرچەندە ڕقیشیان لەیەکتر بێت یان ئافرەتەکە داوێنپیسیشی کردبێت. چونکە ئەشێ بەڵگەی درۆ بهێنرێت لەلایەن کەسوکاری ئافرەتەکەوە تا بیسەلمێنن داوێنپاکە. بەمەش پیاوەکە بەزۆر لەگەڵ ئافرەتێکی لەشفرۆشدا ئەبێت. وە گەر ئافرەتەکە داوێنپاك بێت ئەوا زوڵمە لە ئافرەتەکە، چونکە بەزۆر لەگەڵ ئەو پیاوە درۆزنە بوختانکەرەیا تا مردن ئەمێنێتەوە و، لەبری ئەوەی حەقی بسەنرێت و دیفاع لە شەرەفی بکرێت بەو جۆرە سزا ئەدرێت.

— وقد قيل: ((من طلق امرأته، فليعطها كتاب طلاق )) (٣١) أما أنا فأقول لكم: من طلق امرأته، إلا في حالة الفحشاء عرضها للزنى، ومن تزوج مطلقة فقد زنى (٣٢) (متى / ٥) وە وتراوە: (هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات، با نوسراوی تەڵاقەکەی بداتێ) (٣١) بەڵام من پێتان ئەڵێم: هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات مەگەر لە حاڵەتی داوێنپیسیدا ئەوا وای لێئەکات

داوێنپیسی بکات، وە هەرکەس تەڵاقدراوێك بهێنێت ئەوا داوێنپیسی کردووە (٣٢).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت گەر ژن و پیاوێك بەیەکەوە نەگونجان، یان یەکیان بەدڵ نەبوو، یان بەزۆر بەیەکەوە بوون یان هەر هۆکارێك هەبوو وایان لێبکات بیانەوێت جیاببنەوە، ئەوا بۆیان نییە جیاببنەوە مەگەر لە یەك حاڵەتدا ئەویش گەر ئافرەتەکە داوێنپیسی بکات. وە ئەم دەقانە باسی ئەوەیان نەکردووە گەر پیاوەکە داوێنپیسی بکات ئافرەتەکە بۆی هەیە لێی جیاببێتەوە یان نا؟ وە باسی تۆبەکردن نەکراوە تیایدا، کە گەر ئافرەتەکە تۆبەی کرد لەو تاوانەی ئایا بۆی هەیە شوو بکاتەوە یان نا؟ وە ئەم دەقانە دژیەکن لەگەڵ ئەو دەقانەی پەیمانی کۆندا کە باسی ئەوە ئەکەن گەر ئافرەتی مێرددار داوێنپیسی بکات ئەوا لەگەڵ پیاوە داوێنپیسەکەدا ئەکوژرێن، وە باسی تەلاق نەکراوە لەوێدا (التثنية ٢٢/ ٢٢).

– بامرأة زانية أو مدنسة لا يتزوجوا، وبامرأة مطلقة من رجلها لا يتزوجوا، لأن الكاهن مقدس لإلهه (اللاويين ٢١/ ٧) بە ئافرەتی داوێنپیس و گلاو هاوسەرگیری نەکەن، وە بە ئافرەتێکی تەلاقدراو لە مێردەکەی هاوسەرگیری نەکەن، چونکە کاهین پیرۆزکراوە بۆ خوداکەی.

– وأما الأرملة أو المطلقة أو المدنسة أو الزانية، فلا يتخذها، بل ليتخذ من قومه امرأة بكرا (اللاويين ٢١/ ١٤) وە ئەمما بێوەژن یان تەڵاقدراو یان بێ ئابڕوو یان داوێنپیس با نەهێنێت، بەڵکو لە قەومەکەی ئافرەتێکی کچ بهێنێت.

– ومن تزوج مطلقة فقد زنى (متى ٥/ ٣٢) وە هەرکەس هاوسەرگیری لەگەڵ تەڵاقدراوێکدا بکات ئەوا داوێنپیسی کردووە.

- بەپێی ئەم دەقانە ئافرەتی تەڵاقدراو و بێوەژن کەمترن لە کچ و نابێت پیاوی دینەکە بیانهێنێت، وە ئەوانە لە ڕیزی لەشفرۆشدان و گەر بیانهێنێت پیرۆزی پیاوی دینەکە کەمئەبێتەوە، وە هەرکەس تەڵاقدراو بهێنێت داوێنپیسی کردووە.

– إن أغرى رجل بكرا لم تخطب فضاجعها، فليجعل لها مهرا فتكون زوجة له (١٦) فإن أبى أبوها أن يزوجها، فليزن له من الفضة مثل مهر الأبكار (١٧) (خروج / ٢٢) گەر پیاوێك کچێکی خەڵەتاند مارە نەبڕدرابێت و لەگەڵی جووت ببێت، با مارەییەکی بۆ دابنێت و ئەبێت بە ژنی (١٦) جا گەر باوکی کچەکە نەیویست بیداتێ، با لە زیو بۆی بکێشێت وەك مارەیی کچ (١٧).

- بەپێی ئەم دەقانە گەر پیاوێك داوێنپیسی لەگەڵ کچێکدا کرد ئەوا کچەکە ئەبێت بە ژنی، بێ ئەوەی کچەکە ڕەزامەندی وەرگیرێت.

– وأية امرأة كان لها علاقات جنسية مع رجل، فليستحما في الماء ويكونا نجسين حتى المساء (اللاويين ١٥/ ١٨) وە هەر ئافرەتێك کاری سەرجێیی لەگەڵ پیاوێکدا بکات، با خۆیان بشۆن لە ئاودا وە تا ئێوارە هەردووکیان گڵاو ئەبن.

- بەپێی ئەم دەقە ئافرەت و مێردەکەی گڵاو ئەبن گەر جووت بن.

– لنا أخت صغيرة لم ينم نهداها بعد، فماذا نصنع لأختنا في يوم خطبتها؟ (٨) لو كانت سورا لبنينا عليه صرحا من فضة، ولو كانت بابا لدعمناه بألواح من أرز (٩) (نشيد الأناشيد / ٨) خوشکێکی بچووکمان هەیە هێشتا مەمکی نەکردووە، چی بکەین بۆ خوشکەکەمان لە ڕۆژی مارەکردنەکەیدا؟ (٨) گەر شوورا بێت ئەوا قوڵلەی زیوی لەسەر بنیاد ئەنێین، وە گەر دەرگا بێت بە تەختەی ئورز دەوری ئەدەین (٩).

- ئەم دەقە پرسیار ئەکات، وە سەرەڕای سەیر و سەمەرەیی پرسیارەکە وەڵامی پرسیارەکەش ناداتەوە و بە سەرسوڕماوی خوێنەر جێدێڵێت. وە کاتێك خوای گەورە کتێبێك دائەبەزێنێت ڕێنیشاندەری مرۆڤەکان بێت وەڵامی پرسیارەکانیان ئەداتەوە، نەوەك لە مرۆڤە نەشارەزاکان

بپرسێت گەر فلان شت ڕوویدا چی بکەین؟ و چی دروستە؟ وە گەر پرسیارێکیشی کرد و مەبەستی لێی هاندانی مرۆڤ بوو بۆ بیرکردنەوە، ئەوا پرسیارەکان ئەبێت دەربارەی بابەتە گەورەکان بێت و بە ڕاستی وابکات خەڵك بیربکەنەوە (النمل ٥٩ - ٦٤)، (غاشیة ١٧ - ٢٠).

وە دەقێکی لەم جۆرە نە دەقێکە وامان لێبکات بە ئیمانماندا بچینەوە و بیربکەینەوە، نە دەقێکیشە حوکمێکمان فێربکات تا جێبەجێی بکەین و ژیانێکی ئاسانتر بەڕێ بکەین، یان لە تاوانێك دووربکەوینەوە و لە خوای گەورە نزیکببینەوە، یان مافی کەسێك بەسەرمانەوە بزانین تا وەك خۆی بیدەین بە کەسەکە.

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ (٧) (المؤمنون) وە ئەوانەی داوێنیان ئەپارێزن (٥) مەگەر لە خێزانەکانیان یان کەنیزەکانیان ئەوا ئەوان لۆمەیان ناکرێت (٦) جا هەرکەس لە غەیری ئەوانەدا دامێنی بەکاربێنێت ئەوا ئەوانە سنوور بەزێنن (٧) ﴾.

+ ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا (الإسراء - ٣٢) وە نزیك داوێنپیسی مەکەونەوە ئەوە بێزراوە و ڕێیەکی خراپە ﴾.

+ ﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ (البقرة - ٢٢٣) ئافرەتەکانتان کێڵگەن بۆتان جا هەرچۆن ئەتانەوێت بچنە کێڵگەکەتانەوە ﴾.

+ ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢) ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٣) (النور) داوێنپیسی مێ و نێر هەریەکەیان جەلد بکەن سەد قامچی، وە لە دینی خوادا بەزەییتان پیایانا نەیەتەوە، گەر ئیمانتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، وە با سزاکەیان کۆمەڵێك لە ئیمانداران ببینێت (٢) داوێنپیسی نێر مارە ناکات ئیللا ئافرەتی داوێنپیس یان موشریك، وە داوێنپیسی مێ مارەی ناکات ئیللا داوێنپیس یان موشریکی نێر، وە ئەوە حەرامکراوە لە ئیمانداران (٣) ﴾.

+ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ (النور - ١٩) ئەوانەی

حەزئەکەن داوێنپیسی بلاوببێتەوە لەناو ئیمانداراندا سزایەکی بەئێشیان هەیە لە دنیا و ئاخیرەتدا، وە خوا ئەزانێت و ئێوە نازانن ﴾.

+ ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (المائدة - ٣٣) پاداشتی ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەکەن و لە زەویدا خراپە ئەنێنەوە ئەوەیە بکوژرێن یان لە خاچ بدرێن یان دەست و قاچیان ڕاست و چەپ ببڕدرێت یان لە زەویدا دەربکرێن، ئەوە بۆیان سەرشۆڕییە لە دنیادا وە لە ئاخیرەتدا سزایەکی زۆر گەورەیان هەیە ﴾.

- ئەم دەقە پیرۆزانەی قورئان پێمان ئەڵێن کە ئەسڵ لە چوون بەلای شەهوەتدا حەرامێتییە مەگەر لەڕێی ژنهێنانەوە. وە حەرامە شەهوەتت لە ئافرەتێکدا بەتاڵ بکەیت مەگەر ئافرەتەکە ژن یان کەنیزەت بێت، وە لەگەڵ غەیریاندا تاوانە. وە تەعەداکەر و داوێنپیس سزا ئەدرێن، نەوەك ئافرەتەکەیان لێ مارەبکرێت و خەڵات بکرێن.

+ ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَمَقۡتٗا وَسَآءَ سَبِيلًا (٢٢) حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمۡ أُمَّهَٰتُكُمۡ وَبَنَاتُكُمۡ وَأَخَوَٰتُكُمۡ وَعَمَّٰتُكُمۡ وَخَٰلَٰتُكُمۡ وَبَنَاتُ ٱلۡأَخِ وَبَنَاتُ ٱلۡأُخۡتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن

نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمۡ تَكُونُواْ دَخَلۡتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ
وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ إِلَّا مَا قَدۡ
سَلَفَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا (٢٣) وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا
مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم
مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
عَلِيمًا حَكِيمٗا (٢٤) وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ
ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ
بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ
أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ
خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٢٥) يُرِيدُ
ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ
حَكِيمٞ (٢٦) وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن
تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا (٢٧) يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا
(٢٨) (النساء) وە ئەو ئافرەتانە مارە مەکەن کە باوانتان مارەیانکردوون
مەگەر ئەوەی لە پێشا کراوە، ئەوە داوێنپیسییە و بێزراوە و ڕێیەکی خراپە
(٢٢) حەرامکراوە لێتان دایکەکانتان وە کچەکانتان وە خوشکەکانتان وە
خوشکی باوکتان (پور) وە خوشکی دایکتان (میمك) وە کچی برا وە کچی
خوشك وە دایکەکانتان کە شیریان داونەتێ وە خوشکەکانتان لە شیرەوە وە

دایکی ژنەکانتان وە ئەو کچانەی کە بەخێویان ئەکەن هی ژنەکانتان گەر چووبوونە لای ژنەکەتان، وە گەر نەچووبوونە لایان ئەوا گوناحبار نین وە ژنی کوڕەکانتان کە لە پشتتانن وە کە دوو خوشك پێکەوە کۆبکەنەوە مەگەر ئەوەی پێشتر ڕوویداوە، بەدڵنیایی خوا لێبووردە و بەرەحمە (٢٣) وە ئافرەتانی مێرددداریش جگە لەوانەی کەنیزەتانن، حوکمی خوایە بۆتان، وە جگە لەوانە بۆتان حەڵاڵە کە بە سامانی خۆتان بیانهێنن، خۆتان داوێنپاك بکەن داوێن پیس مەبن، جا بەوەی کە سوودتان لێیان بینی ئەوا مارەییەکەیان بدەنێ، وە گوناحبار نین کە لەدوای فەرزەکە لەناو خۆتاندا ڕێبکەون بە زیادکردن یان گێڕانەوەی مارەییەکە، خوای گەورە زانا و کاربەجێیە (٢٤) وە هەرکەس لە ئێوە نەیتوانی لەبەر پارە داوێنپاکی باوەڕدار بهێنێت ئەوا با لە کەنیزە ئیماندارەکان بهێنێت، وە خوا زاناترە بە ئیمانتان هەمووتان لە پشتی یەکن، جا بە ئیزنی خاوەنەکانیان بیانهێنن، وە بەپێی عورف مارەییان بدەنێ، داوێنپاکەکان نەك زیناکارەکان یان ئەوانەی دۆستیان هەیە، جا گەر مارە بڕدران وە داوێنپیسییان کرد ئەوا نیوەی ئەوەیان لەسەرە کە لەسەر ئافرەتێکی ئازادە، ئەوە بۆ ئەوانەتانە کە ترسی تاوانی هەیە لە ئێوە، وە گەر سەبر بگرن ئەوە بۆتان چاکترە، وە خوا لێبووردە و بەرەحمە (٢٥) خوا ئەیەوێت بۆتان ڕوونبکاتەوە وە ڕێی

پێغەمبەرانی پێش خۆتان پیٚ نیشان بدات و لیٚتان خۆشبێت، وە خوا زانا و کاربەجێیە (٢٦) وە خوا ئەیەوێت لیٚتان خۆشبێت، وە ئەوانەی شوێن شەهوەت ئەکەون ئەیانەوێت لارییەکی زۆر لارببنەوە (٢٧) خوا ئەیەوێت ئاسانی بکات لەسەرتان، وە ئینسان بە لاوازی دروستکراوە (٢٨) ﴾.

+ ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ وَلَأَمَةٞ مُّؤۡمِنَةٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكَةٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤۡمِنُواْۚ وَلَعَبۡدٞ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ وَٱلۡمَغۡفِرَةِ بِإِذۡنِهِۦۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ (البقرة - ٢٢١) وە ئافرەتە موشریکەکان مەهێنن تا ئیمان دێنن، وە کەنیزەیەکی ئیماندار لە موشریکێك چاکترە گەر بەدڵیشتان بێت، وە ئافرەت مەدەن بە پیاوی موشریك، وە کۆیلەیەکی ئیماندار چاکترە لە موشریکێك گەر بەدڵیشتان بێت، ئەوانە بانگەواز ئەکەن بۆ ئاگر، وە خوا بانگەواز ئەکات بۆ بەهەشت و لێبووردن بە ئیزنی خۆی، وە ئایەتەکانی ڕوونئەکاتەوە بۆ خەڵك بەڵکو بیربکەنەوە ﴾.

+ ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ

(المائـدة - ٥) ئەمڕۆ پاکەکانتان بۆ حەڵاڵ کرا، وە خواردنی ئەوانەی کتێبیان دراوەتیێ حەڵاڵە بۆتان وە خواردنتان حەڵاڵـە بۆیـان، وە ئـافرەتی داوێنپـاکی ئیماندار و داوێنپاکی ئەوانەی کتێبیان دراوەتیێ لە پێشتاندا گـەر مارەییـان بدەنێ داوێنپاك نەك زیناکار یان ئەوانەی دۆستیان هەیە، وە هەرکەس کـوفر بکات بـە ئیمـان ئـەوا کردەوەکـانی بـەتاڵ بووەتـەوە وە لـە ئاخیرەتـدا لـە دۆڕاوەکانە ﴾.

+ ﴿ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (النـور - ٣) داوێنپیسـی نێـر مـارە ناکات ئیللا ئافرەتی داوێنپیس یان موشـریك، وە داوێنپیسـی مـێ مـارەی ناکـات ئـیللا داوێنپـیس یـان موشـریکی نێـر، وە ئـەوە حـەرامکراوە لـە ئیمانداران ﴾.

+ ﴿ وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ (البقرة - ٢٣٢) وە گەر ئافرەتانتان تەڵاقدا و عیددەیان تەواو بوو ئەوا ڕێگرییان مەکەن کە مێردەکانیان مارەیان بکەنەوە گەر بە چاکە ڕازی بوون لە نێوان خۆیاندا ﴾.

+ ﴿ وَإِذۡ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَأَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِ أَمۡسِكۡ عَلَيۡكَ زَوۡجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ وَتَخۡشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَىٰهُۖ

فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًاۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا (الأحزاب - ٣٧) وە کە بەوە دەڵێیت کە خوا نیعمەتی داوەتیٚ و تۆش نیعمەتت داوەتیٚ ژنەکەت تەڵاق مەدە و تەقوای خوا بکە، وە ئەوە لە نەفستدا ئەشاریتەوە کە خوا دەریئەخات وە لە خەڵك ئەترسیت وە خوا شایەنترە کە لێی بترسیت، جا کە زەید پێویستی پێی نەما لە تۆی مارە ئەکەین بۆئەوەی لەسەر ئیمانداران ناڕەحەتی نەبێت لە مارەکردنی ژنی ئەو کوڕانەی هەڵیانگرتوونەتەوە و کوڕی خۆیان نین گەر وازیان لێهێنان، وە کاری خوا جێبەجیٚ ئەبێت ﴾.

- ئەم ئایەتە پیرۆزانە پێمان ئەڵێن ئەسڵ لە ژنهێناندا حەڵاڵێتییە، وە هەر ئافرەتێکت بوێت بۆت حەڵاڵە مارەی بکەیت مەگەر ئەو ئافرەتانەی حەرامکراون. وە پیاوی موسوڵمان بۆی حەڵاڵە ئافرەتی موسوڵمان و ئەهلی کیتاب مارە بکات بە مەرجی خۆی. وە ئافرەتی موسوڵمان تەنها لەگەڵ موسوڵمان هاوسەرگیری ئەکات. وە داوێن پاك و داوێن پیس پێکەوە کۆنابنەوە. وە ئافرەت گەر مێردی بمرێت یان تەڵاق بدرێت ئەتوانێت شوو بکات بە هەر پیاوێك، وە بەزۆر نادرێت بە کەس وە دانانرێت بۆ کەسێکی تایبەت. وە هەرکەس ئەتوانێت

بیانهێنێت. وە پیاو كەمنابێتەوە گەر بێوەژن بێنێت، وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێوەژنی مارەكردووە. وە لە ئیسلامدا بێوەژن و لەشفرۆش وەك یەك نین، وە بێوەژن تاوانبار نییە.

+ ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ (النساء - ٣) وە گەر ترسان كە دادپەروەر نەبن لە كچە هەتیوەكاندا ئەوا مارەی بكەن لەو ئافرەتانەی بەدڵتانن دووان وە سیان وە چوار، جا گەر ترسان دادپەروەر نەبن ئەوا یەك دانە یان كەنیزەكانتان، ئەوە نزیكترە كە زوڵم نەكەن ﴾.

+ ﴿ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ (النساء - ٢٥) جا بە ئیزنی خاوەنەكانیان بیانهێنن، وە بەپێی عورف مارەییان بدەنێ، داوێنپاكەكان نەك زیناكارەكان یان ئەوانەی دۆستیان هەیە ﴾.

+ ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ (البقرة - ٢٥٦) زۆركردن نییە لە دیندا، لەبەرئەوەی ڕێگای ڕاست لە چەوتی ڕوونبووەوە ﴾.

+ ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (الروم - ٢١) وە لە

نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان خێزانی بۆ دروستکردوون تا بحەسێنەوە لەلایانا، وە لە نێوانتانا حۆشەویستی و سۆزی داناوە، ئا لەوەدا نیشانە هەیە بۆ قەومێك بیربکەنەوە ﴾.

- ئەم دەقە پیرۆزانەی قورئان ژمارەی ئەو ئافرەتانەمان بۆ دیاریئەکەن کە پیاو بۆی هەیە لە هەمان کاتدا هاوسەری بن. وە پێمان ئەڵێن کە ئەم بابەتە سنوردارە و سنورەکەش چوار ئافرەتە. وە لە ئیسلامدا زۆرلێکردن حەرامە. وە دوو هاوسەرەکە ئازادن لە ڕازیبوون یان ڕەتکردنەوەی یەکتر و، ڕەزامەندییان مەرجە بۆ دروستبوونی گرێبەستەکە ﴿ لا تُنْكَحُ الأيِّمُ حتَّى تُسْتَأْمَرَ، ولا تُنْكَحُ البِكْرُ حتَّى تُسْتَأْذَنَ. قالوا: يا رَسولَ اللَّهِ، وكيفَ إذْنُها؟ قالَ: أنْ تَسْكُتَ (صحيح البخاري - ٥١٣٦) ئافرەتێك کە پێشتر شووی کردبێت (ژن) مارە نابڕدرێت هەتا پێی ئەوترێت، وە ئافرەتێك کە پێشتر شووی نەکردبێت (کچ) مارە نابڕدرێت هەتا ئیزنی وەرنەگیرێت. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئیزن وەرگرتنی چۆنە؟ وتی: بێدەنگ بێت ﴾. وە هۆیەکی هاوسەرگیری بەسەربردنی ژیانە لەگەڵ هاوسەردا بە ئارامی، وە هاوسەر هۆی حەوانەوەیە لەسایەیدا. وە هاوسەرگیری بەزۆر ئەوەی تیا نییە.

+ ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢) نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْۖ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ (٢٢٣) (البقرة) وە پرسیاری خوێنی بێنوێژیت لێ ئەکەن، بڵێ ئەوە ئازارە جا لە ئافرەتان دووركەونەوە لە بێنوێژییاندا وە لەگەڵیان جووت مەبن هەتا پاك ئەبنەوە، جا كە خۆیان پاككردەوە بچنە لایان لەو شوێنەوە خوا فەرمانی پێتانكردووە، خوا تۆبەكاران و خۆ پاكڕاگرانی خۆشئەوێت (٢٢٢) ئافرەتەكانتان كێڵگەن بۆتان جا هەرچۆن ئەتانەوێت بچنە كێڵگەكەتانەوە، وە چاكە بۆخۆتان پێشبخەن، وە تەقوای خوا بكەن و بزانن كە پێی ئەگەنەوە، وە مژدە بە ئیمانداران بدە (٢٢٣) ﴾.

- قورئانی بەڕێز بە پیاو ئەڵێت ئەسڵ لە چوون بەلای خێزانتدا حەڵاڵێتییە، مەگەر لەو كاتە و بەو جۆرەی كە حەرامكراوە. وە كاتەكە كاتی سوڕی مانگانەی ئافرەتەكەیە كە جووتبوون تیایدا حەرامە و، غەیری ئەوە هەر تێكەڵاوییەكی تر حەڵاڵە. وە جۆرەكەش جووتبوونە لە كۆمەوە كە لە هەموو كاتێكدا حەرامە. وە ئافرەت

گلاو نییە، وە پیاوەکەی گلاو نابێت گەر بچێت بەلایدا ﴿ إنَّ المُسْلِمَ لا يَنْجُسُ (صحيح البخاري - ٢٨٣) موسوڵمان گلاو نابێت ﴾.

+ ﴿ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي ٱلسَّبِيلَ (٤) ٱدْعُوهُمْ لِأَبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (٥) (الأحزاب) وە ئەوانەی هەڵتانگرتوونەتەوە خوا نەیکردووە بە منداڵتان، ئەوە قسەی خۆتانە بە دەمتان، وە خوا حەق ئەڵێت و ئەو ڕێی ڕاستتان نیشان ئەدات (٤) بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن ئەوە دادپەروەرترە لای خوا، جا گەر باوکیانتان نەناسی ئەوا براتانن لە دیندا وە خزمەتکارتانن، وە گوناحبار نین لەوەدا کە بە هەڵە ئەیلێن بەلام لەوەدا کە دڵتان مەبەستێتی، وە خوا لێبووردە و بەرەحمە (٥) ﴾.

- ئەم دەقە پیرۆزە پێمان ئەڵێت کە منداڵ لە چ پیاوێك بووبێت ئەدرێتە پاڵ ئەو. وە حەرامە بدرێتە پاڵ پیاوێکی تر، ئەگەرچی پیاوەکەی تر لە منالییەوە بەخێویشی کردبێت و وەك منالّی خۆی مامەڵەی کردبێت. تەنانەت گەر نەشزانین باوکی منالّەکە کێیە.

+ ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ (النساء - ٣٤) پیاوان دەسەڵاتدارن بەسەر ئافرەتانەوە بەوەی خوا فەزڵی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکیاندا وە بەوەی کە ئەیبەخشن لە سامانیان، جا ئافرەتە چاکەکان گوێرایەڵن پارێزەری خۆیان و ماڵن ﴾.

+ ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا (النساء - ٤) وە مارەیی ئافرەتەکان بدەن بە پێخۆشبوونەوە، جا گەر ئافرەتەکان لە هەندێکی خۆشبوون بە دڵی خۆیان ئەوا بیخۆن نۆشتان بێت ﴾.

+ ﴿ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ (النساء - ٢٥) وە بەپێی عورف مارەییان بدەنێ ﴾.

+ ﴿ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (٢٧) قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ (٢٨) (القصص) پیاوەکە بە موسای وت من ئەمەوێت یەکێك لەم دوو کچەمت بدەمێ لەسەر ئەوەی هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکەیت، جا گەر دە ساڵت تەواوکرد ئەوە

چاکەی خۆتە، وە نامەوێت نارِەحەتیت بخەمە سەر خوا ویستی لێ بێت ئەمبینیت کە لە چاکەکارانم (٢٧) وتی ئەوە لە نێوان من و تۆدایە، هەر کام لە دوو ماوەکەم تەواو کرد ئەوا زوڵم لەسەر نییە، وە خوا لەسەر ئەوەی ئەیڵێین ئاگادارە (٢٨) ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا (الطلاق - ١) ئەی پێغەمبەر گەر ئافرەتانتان تەڵاقدا ئەوا لە کاتی خۆیاندا تەڵاقیان بدەن و ماوەکەی بژمێرن، وە تەقوای خوا پەروەردگارەکەتان بکەن، لەماڵەکانیان دەریانمەکەن وە با دەرنەچن مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن وە ئەوە سنووری خوایە، وە هەرکەس سنووری خوا ببەزێنێت ئەوا ستەمی لە خۆی کردووە، نازانیت بەڵکو خوا لەدوای ئەوە کارێك بکات لەنێوان ئەو دووانەدا ﴾.

+ ﴿ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰ (آل عمران - ٣٦) وە نێر وەك مێ نییە ﴾.

- ئەم دەقە پیرۆزانە ئەرك و مافی دوو هاوسەرەکەمان بەگشتی بۆ دیاریئەکەن، کە هی هەریەکەیان جیایە لەوی تر چونکە نێر و مێ وەك یەك نین. جا پیاو نەفەقە و بەخێوکردنی لەسەرە، وە لە

بەرامبەردا دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئافرەتەکەدا و بۆی حەڵاڵە. وە ئافرەت گوێرایەڵی مێردەکەی لەسەرە، وە لە بەرامبەردا مارەیی و جێی ژیانی هەیە. وە لە ئیسلامدا مارەیی ئەبێت شتی بەقیمەت بێت، وە شتی بێ نرخ و بێ کەڵك و حەرام قبوڵ نییە ﴿ جاءَتِ امْرَأَةٌ إلى النَّبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فقالَتْ: جِئْتُ أهَبُ نَفْسِي، فَقامَتْ طَوِيلًا، فَنَظَرَ وصَوَّبَ، فَلَمَّا طالَ مُقامُها، فقالَ رَجُلٌ: زَوِّجْنِيها إنْ لَمْ يَكُنْ لكَ بها حاجَةٌ، قالَ: عِنْدَكَ شيءٌ تُصْدِقُها؟ قالَ: لا، قالَ: انْظُرْ. فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فقالَ: واللَّهِ إنْ وجَدْتُ شيئًا، قالَ: اذْهَبْ فالْتَمِسْ ولو خاتَمًا مِن حَدِيدٍ. فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ قالَ: لا واللَّهِ ولا خاتَمًا مِن حَدِيدٍ. وعليه إزارٌ، ما عليه رِداءٌ، فقالَ: أُصْدِقُها إزارِي، فقالَ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: إزارُكَ إنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ منه شيءٌ، وإنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عليها منه شيءٌ. فَتَنَحَّى الرَّجُلُ فَجَلَسَ، فَرَآهُ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ مُوَلِّيًا، فأمَرَ به فَدُعِيَ، فقالَ: ما معكَ مِنَ القُرْآنِ؟ قالَ: سُورَةُ كَذا وكَذا، لِسُوَرٍ عَدَّدَها، قالَ: قدْ مَلَّكْتُكَها بما معكَ مِنَ القُرْآنِ (صحيح البخاري - ٥٨٧١) ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و وتی: هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم. جا زۆر مایەوە، پێغەمبەریش تەماشای کرد و لێی ڕووانی، جا کە مانەوەکەی درێژەی

کێشا پیاوێك وتی: لە منی مارە بکە گەر ئیشت پێی نییە. وتی: هیچت پێیە بە مارەیی بیدەیتیٚ؟ وتی: نەخێر. وتی: بچۆ بزانە. جا ڕۆشت و هاتەوە و وتی: واللە هیچم نەدۆزییەوە. وتی: برۆ ئەڵقەیەکی ئاسنیش بێت بیهێنە. ڕۆشت و هاتەوە و وتی: نا واللە ئەڵقەیەکی ئاسنیشم نییە. وە پارچە قوماشێکی پێوە بوو خۆی پیٚ داپۆشیبوو وە چارۆکەی پێوە نەبوو پشتی داپۆشێت، جا وتی: ئەم پارچە قوماشەی ئەدەمیٚ. پێغەمبەریش صلی اللە علیه وسلم وتی: قوماشەکە گەر بیدەیت بەو ئەوا هیچت لەبەرا نابێت، وە گەر خۆتی پیٚ داپۆشیت ئەو هیچی پیٚ نابێت. جا پیاوەکە لاچوو و دانیشت، وە پێغەمبەری خوا بینی ئەڕوات، جا فەرمانی کرد بانگیان کرد، جا وتی: چەندێك قورئانت پێیە؟ وتی: سورەتی فلاٚن و فلاٚن. چەند سورەتێکی ژمارد. وتی: ئەوا پێمدایت بەوەی کە پێتە لە قورئان (کە فێری بکەیت) ﴾.

+ ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٢٢٦) وَإِنۡ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ (٢٢٧) وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٢٨) ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ

أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن
يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا
فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ (٢٢٩) فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا
غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ
ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ (٢٣٠) وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ
أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖۚ وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ
ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
هُزُوٗاۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ
يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ (٢٣١) وَإِذَا
طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا
تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ
وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ ذَٰلِكُمۡ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ (٢٣٢)
وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ
وَعَلَى ٱلۡمَوۡلُودِ لَهُۥ رِزۡقُهُنَّ وَكِسۡوَتُهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفۡسٌ إِلَّا
وُسۡعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلۡوَارِثِ مِثۡلُ
ذَٰلِكَۗ فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ وَإِنۡ
أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا سَلَّمۡتُم مَّآ ءَاتَيۡتُم
بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ (٢٣٣) وَٱلَّذِينَ
يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ
فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱللَّهُ
بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ (٢٣٤) وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا عَرَّضۡتُم بِهِۦ مِنۡ خِطۡبَةِ

ٱلنِّسَآءِ أَوۡ أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗاۚ وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ (٢٣٥) لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ (٢٣٦) وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدۡ فَرَضۡتُمۡ لَهُنَّ فَرِيضَةٗ فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِۚ وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧)

(البقرة) ئەوانەی سوێند ئەخۆن نەچن بەلای خێزانیاندا تا چوار مانگ چاوەڕێ بن، جا گەر گەڕانەوە ئەوا خوا لێبووردە و بەرەحمە (٢٢٦) وە گەر تەلاقیان ویست ئەوا خوا بیسەر و زانایە (٢٢٧) وە تەلاقدراوان سێ حەیز چاوەڕێ ئەکەن، وە بۆیان نییە ئەوەی خوا لە رەحمیاندا دروستی کردووە بیشارنەوە گەر ئیمانیان بە خوا و قیامەت هەیە، وە مێردەکانیان لەپێشترن بە گێڕانەوەیان لەوەدا گەر ویستیان چاکسازی بکەن، وە وەك ئەوەیان بۆ هەیە کە لەسەریانە بەپێی عورف، وە پیاوان پلەیەك لەسەریانەوەن، وە خوا بالادەست و کاربەجێیە (٢٢٨) تەلاق دوو جارە جا یان خێزانەکەی بێنێتەوە یان بە چاکە وازی لێبێنێت، وە بۆتان حەلاڵ نییە هیچ لەوە ببەن کە داوتانە پێیان ئیللا کە بترسن نەتوانن سنوری خوا بپارێزن، جا گەر ترسان ئەو دووانە

نەتوانن سنوری خوا بپارێزن ئەوا گوناحیان لەسەر نییە گەر مارەییەکە بداتەوە، ئەوە سنووری خوایە جا مەیبەزێنن، وە هەرکەس سنووری خوا ببەزێنێت ئائەوانەن ستەمکاران (٢٢٩) جا گەر تەڵاقی بدات ئەوا بۆی حەڵاڵ نییە لەوەو دوا هەتا شوو بە یەکێکی تر نەکات، جا گەر ئەویش تەڵاقی دا ئەوا گوناحبار نین گەر بگەڕێنەوە گەر وابزانن سنووری خوا ئەپارێزن، وە ئەوە سنووری خوایە ڕوونیئەکاتەوە بۆ کەسانێك بزانن (٢٣٠) وە گەر ئافرەتتان تەڵاقدا و گەشتە کۆتایی عیددەکەیان ئەوا بیانگێڕنەوە بە چاکە یان وازیان لێبێنن بە چاکە، وە مەیانهێڵنەوە بە زەرەر زوڵم بکەن، وە هەرکەس وا بکات ئەوا ستەمی لە خۆی کردووە، وە ئایەتەکانی خوا بە گاڵتە مەگرن، وە یادی نیعمەتەکانی خوا بکەن بەسەرتانەوە وە ئەوەی بۆی دابەزاندوون لە کتێب و سوننەت ئامۆژگاریتان ئەکات پێی، وە تەقوای خوا بکەن وە بزانن کە خوا بە هەموو شتێك بەئاگایە (٢٣١) وە گەر ئافرەتانتان تەڵاقدا و عیددەیان تەواوبوو ئەوا ڕێگرییان مەکەن کە مێردەکانیان مارەیان بکەنەوە گەر بە چاکە ڕازی بوون لە نێوان خۆیاندا، ئەمە ئامۆژگاری ئەوەتانی پێئەکرێت کە ئیمانی بە خوا و قیامەتە، ئەوە بۆتان باشتر و پاکترە، وە خوا ئەزانێت و ئێوە نازانن (٢٣٢) وە دایکەکان دوو ساڵی تەواو شیری مناڵەکانیان ئەدەن بۆ ئەوانەی بیانەوێت شیردانەکە تەواو بکات، وە

لەسەر پیاوەکەیە خواردن و پۆشاکی منالّەکەی و ژنەکـە بـەپێی عـورف، وە هیچ نەفسێك ئەرك ناخرێتە سەری مەگەر بـەپێی توانـای، دایـك زەرەر لـە منالّ و پیاوەکە نادات وە پیاوەکەش زەرەر لە ئافرەتەکە نـادات، وە لەسـەر میراتگرەکانە بەهەمان شێوە، جا گەر ویستیان زووتر لە شـیری ببڕنـەوە بـە ڕەزامەندییان وە پرس و ڕای یـەکتر ئـەوا گوناحیـان لەسـەر نییـە، وە گـەر ویستتان ئافرەتی تر شیری بداتێ ئەوا گوناحتان لەسەر نییە گـەر بـە چـاکە حەقی شیردانەکە بدەن، وە تەقوای خوا بکەن وە بـزانن خـوا بینـەرە بـەوەی ئەیکەن (٢٣٣) وە ئەوانەتان ئەمرن و ژن بەجێئەهێڵن ژنەکان با چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕێ بکەن، جا کە گەشتنە ماوەکەیان ئـەوا گوناحتـان لەسـەر نییە ئافرەتەکە چی ئەکات بە چاکە و بەپێی عورف، وە خوا شارەزایە بەوەی ئەیکەن (٢٣٤) وە تاوانبار نین لەوەدا کە بـە ناڕاسـتەوخۆ داوای ئافرەتتـان کردووە لەماوەی عیددەیاندا، یان کە لە نەفسـی خۆتانـدا شـاردووتانەتەوە، خوا زانی کە باسیانئەکەن، بەڵام بە نهێنی ئەوەی دڵتانیان پێ مەڵێن مەگەر قسەیەکی باش بکەن، وە گرێبەستی مارەکردن مەکەن هەتا عیددەکە تـەواو ئەبێت، وە بزانن کە خوا ئەوەی لە نەفستاندایە ئەیزانێت جا ئاگـاداری بـن، وە بزانن کە خوا لێبووردە و لەسەرخۆیە (٢٣٥) گوناحتان لەسەر نییـە گـەر ئافرەتـان تـەڵاق بـدەن گـەر جیماعیانتـان نـەکردبن یـان مارەییتـان

دیارینەکردبێت، وە شتومەکیان بدەنێ لەسەر هەبوو بەپێی خۆی وە لەسەر نەبوو بەپێی خۆی بە چاکە و بەپێی عورف، حەقە لەسەر چاکەکاران (٢٣٦) وە گەر تەلاقتاندان پێش ئەوەی جیماعیان بکەن وە مارەییتان بۆیان دیاریکردبوو ئەوا نیوەی مارەییەکەیان هەیە مەگەر ئافرەتەکان لەوە خۆشبن یان ئەوەی گرێبەستی مارەییەکەی بەدەستە خۆشببێت، وە گەر خۆشبن ئەوە لە تەقواوە نزیکترە، وە ئەو چاکەیەی بەینتان بیرنەچێت، بەڕاستی خوا بینەرە بەوەی ئەیکەن (٢٣٧) ﴾.

+ ﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا (النساء - ٣٥)

وە گەر لە جیابوونەوەیان ترسان ئەوا پیاوێکی دادپەروەر لە کەسی پیاوەکە وە پیاوێکی دادپەروەر لە کەسی ژنەکە بنێرن گەر ئاشتەواییان بوێت ئەوا خوا نێوانیان ڕێکئەخات، بێگومان خوا زانا و شارەزایە ﴾.

+ ﴿ وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا (١٢٧) وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ

خَبِيرًا (١٢٨) وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (١٢٩) وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا (١٣٠) (النساء) وە پرسیارت لێئەکەن دەربارەی ئافرەتان، بڵێ خوا فێرتانئەکات تیایاندا وە ئەوەی بۆتان ئەخوێنرێتەوە لە قورئاندا، لە کچە بێ باوکەکاندا کە مارەیی تەواویان نادەنێ و ئەتانەوێت مارەیان بکەن، وە لە کوڕە بێ دەسەڵاتەکاندا، وە کە هەتیوەکان بە دادپەروەری سەرپەرشتی بکەن، وە هەر کارێکی چاك بکەن ئەوا خوا زانایە پێی (١٢٧) وە گەر ئافرەتێك ترسا لە دوورکەوتنەوە یان پشتتێکردنی پیاوەکەی ئەوا گوناحیان لەسەر نییە گەر سوڵح بکەن لەنێوان خۆیاندا، وە سوڵح باشترە، وە نەفسەکان ڕەزیلییان پێوەیە، وە گەر چاکسازی بکەن و تەقوا بکەن ئەوا خوا ئاگادارە بەوەی ئەیکەن (١٢٨) وە ناتوانن دادپەروەر بن لەنێوان ئافرەتاندا گەرچی هەوڵێش بدەن، جا با مەیلتان هەمووی نەچێت بەلای یەکێکیاندا و ئەوانی تر وەك هەڵواسراویان لێبێت، وە گەر چاکسازی بکەن و تەقوای خوا بکەن ئەوا خوا لێبووردە و بەرەحمە (١٢٩) وە گەر جیاببنەوە ئەوا خوا هەریەکەیان دەوڵەمەند ئەکات لە فراوانی فەزڵی خۆی، وە خوا فەزڵی فراوانە و کاربەجێیە (١٣٠) ﴾.

- ئەم دەقە پیرۆزانەی قورئان حوکمەکانی جیابوونەوە و بابەتەکانی دوای جیابوونەوە باسئەکەن. وە لە قورئاندا جیابوونەوە تاوان نییە، بەتایبەتی گەر دوو هاوسەرەکە پێکەوە نەگونجان. بەڵکو لەوانەیە ئەو جیابوونەوەیە بۆ هەردوو لا چاکتر بێت و هەریەکە لەو باشتر بدۆزێتەوە. وە قورئان حاڵەتەکانی جیابوونەوە و ماف و ئەرکی هەر لایەك و چەند بابەتێکی تری گرنگی باسکردووە. وە جیابوونەوە واتای دوژمنایەتی و ڕقێکی نەبڕاوە نییە لە نێوان ژن و پیاوەکە و خێزانەکانیان. وە گەر منداڵیش هەبێت لەنێوانیاندا ئەوا دوای جیابوونەوەشیان هەر منالّی ئەمانن و ئەمان دایك و باوکیانن. وە قورئانی پیرۆز هانمان ئەدات کە هەتا ئەتوانین هەوڵی چاکسازی بدەین و نەهێڵین جیابوونەوە ڕووبدات. بەڵام گەر چارەسەر نەبوو وە هەر ویستیان جیاببنەوە ئەوا خوای گەورە کار بۆ هەردووکیان ئاسان ئەکات خێزانی تر دروست بکەن.

+ ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ (٤) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٥) وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ

ٱلصَّـٰدِقِينَ (٦) وَٱلۡخَٰمِسَـةُ أَنَّ لَعۡنَـتَ ٱللَّهِ عَلَيۡـهِ إِن كَـانَ مِـنَ ٱلۡكَٰـذِبِينَ (٧)
وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡـهَدَ أَرۡبَـعَ شَـهَٰدَٰتِۭ بِـٱللَّهِ إِنَّـهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ (٨)
وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ (٩) وَلَوۡلَا فَضۡلُ
ٱللَّهِ عَلَـيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُـهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَـوَّابٌ حَكِـيمٌ (١٠) (النــور) وە ئەوانـــەی داوێنپاکەکان تۆمەتبار ئەکەن بە داوێنپیسی پاشان چـوار شـایەت نـاهێنن ئەوا هەشـتا قامچـییان لێـدەن وە هـەرگیز شـایەتییان لـێ وەرمـەگرن، وە ئەوانەن لەڕێ دەرچووەکان (٤) جگـە لەوانـەی تۆبـە ئەکـەن دوای ئـەوە وە چاکسازی ئەکەن، ئەوا خوا لێبووردە و بەرەحمە (٥) وە ئەوانـەی ژنـەکانیان تۆمەتبار ئەکەن بە داوێنپیسی و شایەتیان نییە جگە لە خۆیان ئەوا شایەتی خۆیان چوار جار سوێند خواردنـە بـە الله کـە ئـەو لـە ڕاسـتگۆکانە (٦) وە پێنجەم جار ئەڵێت کە لەعنەتی الله ی لەسەر بێت گەر لە درۆزنان بێت (٧) وە ئافرەتەکە سزای لەسەر لائەچێت بەوەی چوار جار سوێند بە الله بخوات کە پیاوەکە درۆزنە (٨) وە پێنجەم جار ئەڵێت کە غەزەبی الله لەسەر خۆی بێت گەر پیاوەکە ڕاستبکات (٩) وە گەر فەزڵ و ڕەحمەتی خوا لەسەرتان نەبوایـە ئەم کارە ئاوا ئاسان نەئەبوو، وە خوا لێبووردە و کاربەجێیە (١٠) ﴾.

+ ﴿ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ (النـور - ١٣) گەر لە بانگەشەکەیاندا ڕاست ئەکـەن بـا چـوار

شایەت بهێنن، جا گەر شایەتەکانیان نەهێنا ئائەوانە لای خـوا درۆزنـەکانن .

- لەم دەقە پیرۆزانەی قورئانـدا تۆمـەتبارکردنی پیـاو یـان ئـافرەت بـە داوێنپیسی بە ناحەق تاوانە و سزای توندیشی تیایە. وە سەلماندنی ئەو دەعوایە پێویستی بە چوار شایەتە کـە بەچـاو تاوانەکـەیان بینیبێـت لەکاتی ڕوودانیدا، ئینجا تاوانەکـە لەسـەر کەسـەکە ئەچەسـپێت، وە تەنها بە بانگەشە و قسە نابێـت. چـونکە شـەرەف و داوێـنی خـەڵك گرانە، وە کەم نییە کەسێك هەسـتێ و خـەڵك تۆمـەتبار بکـات بـەو تاوانە گەورەیە. وە گەر هاتوو پیاوێك هاوسەرەکەی تۆمـەتبارکرد بـە داوێنپیسی یان بەپێچەوانەوە، ئەوا بەزۆر بەیەکەوە دایاننانێین. بەڵکو چوار شایەت یان بەڵگە یان ئیعـتیرافی هاوسـەرەکەی ئـەهێنێت، یـان لیعان ئەکەن بەو جۆرەی لـە ئایەتـە پیرۆزەکانـدا هـاتووە، وە لەیـەك جیائەکرێنەوە بۆ هەتاهەتایە و بەیەکـەوە نامێننـەوە ﴿ أَنَّ رَجُلًا مِـنَ الأنْصَارِ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، فأحْلَفَهُما النبـيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، ثُـمَّ فَـرَّقَ بيْنَهُمَا (صحيح البخاري - ٥٣٠٦) پیاوێك لە ئەنصار ژنەکەی خـۆی تۆمەتبار کرد بە داوێنپیسی، وە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم سوێندی هەردووکیانی دا، پاشان جیایکردنەوە ﴾. وە گەر سـەلما

بانگەشەکەرەکە درۆزنە یان نەیتوانی بەڵگە بێنێت یان لیعانی نەکرد ئەوا سزائەدرێت ﴿ أنَّ هِلالَ بنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ بشَرِيكِ ابْنِ سَحْماءَ، فقالَ النَّبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: البَيِّنَةَ أوْ حَدٌّ في ظَهْرِكَ (صحيح البخاري - ٤٧٤٧) هیلالی کوڕی ئومەییە ژنەکەی تۆمەتبار کرد بە داوێنپیسی لەلای پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بە شەریکی کوڕی سەحمائ، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: یان بەڵگە ئەهێنیت یان پشتت جەلد ئەکرێت ﴾.

# بابەتی سێیەم

## دەقەکان دەربارەی ئافرەت

ئافرەت لە کۆنەوە تا ئێستا دینەکان قسەیان لەسەر کردووە. وە بەگشتی ڕاجیا بوون لەسەر ئەوەی مرۆڤە یان نا؟[٥] وە رۆحی هەیە یان نا؟[٥] وە مافی هەیە یان نا؟[٢٢] وە زیاترە یان کەمترە یان یەکسانە بە پیاو؟[٥] [٢٣] وە سەردەمانێك پیاو سەرشۆڕ و خەمبار بووە گەر کچی ببوایە، وە قەت دوعای ئەوەی نەکردووە کچی ببێت[٢٣] ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ (٥٨) يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ (٥٩) (النحل) وە گەر یەکێکیان مژدەی پێبدرێت بەوەی مێینەیەکی بووە ڕووی ڕەش ئەبێت هەموو ڕۆژەکە وە خەفەتبارە (٥٨) خۆی ئەشارێتەوە لە خەڵکەکە لە خراپی ئەوەی پێی وتراوە، ئایا بیهێڵێتەوە بە سەرشۆڕی یان لە خۆڵدا بیشارێتەوە، بەڕاستی خراپترین بڕیاریان داوە (٥٩) ﴾.

جا با بزانین ئیسلام و یەهودیەت و نەصرانییەت چۆن باسی ئافرەتیان کردووە و چۆن ئافرەت ئەبینن؟ وە ببینین کام دەقانە دەقی خوای گەورەیە لە باسکردنی ئەم مەخلوقەیدا؟

یەکەم/ ئافرەت وەك بوونەوەرێك.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– وكانت الحية أحيل جميع حيوانات الحقول التي صنعها الرب الإله. فقالت للمرأة: (( أيقينا قال الله: لا تأكلا من جميع أشجار الجنة؟ )) (١) فقالت المرأة للحية: (( من ثمر أشجار الجنة نأكل (٢) وأما ثمر الشجرة التي في وسط الجنة، فقال الله: لا تأكلا منه ولا تمساه كيلا تموتا )) (٣) فقالت الحية للمرأة: (( موتا لا تموتان (٤) فالله عالم أنكما في يوم تأكلان منه تنفتح أعينكما وتصيران كآلهة تعرفان الخير والشر )) (٥) ورأت المرأة أن الشجرة طيبة للأكل ومتعة للعيون وأن الشجرة منية للتعقل. فأخذت من ثمرها وأكلت وأعطت أيضا زوجها الذي معها فأكل (٦) فآنفتحت أعينهما فعرفا أنهما عريانان. فخاطا من ورق التين وصنعا لهما منه مآزر (٧) فسمعا وقع خطى الرب الإله وهو يتمشى في الجنة عند نسيم النهار، فآختبأ الإنسان وامرأته من وجه الرب الإله فيما بين أشجار الجنة (٨) فنادى الرب الإله الإنسان وقال له: ((أين أنت؟ )) (٩) قال: (( إني سمعت وقع خطاك في الجنة فخفت لأني عريان فاختبأت )) (١٠) قال: (( فمن أعلمك أنك عريان؟ هل أكلت من الشجرة التي أمرتك ألا تأكل منها؟ )) (١١) فقال الإنسان: (( المرأة التي جعلتها

معي هي أعطتني من الشجرة فأكلت )) (١٢) فقال الرب الإله للمرأة: (( ماذا فعلت؟ )) فقالت المرأة: (( الحية أغوتني فأكلت )) (١٣) (تكوين / ٣)

وە مار فێڵبازترین ئاژەڵە کێوییەکان بوو کە خوا دروستی کردبوو. جا بە ئافرەتەکەی وت: (ئایا بە دڵنیایی خوا وتی: لە هەموو درەختەکانی باخچەکە مەخۆن) (١) جا ئافرەتەکە بە مارەکەی وت: (لە بەری درەختەکانی باخەکە ئەخۆین (٢) بەڵام لە درەختەکەی ناوەڕاستی باخەکە ناخۆین خوا وتی: لێی مەخۆن و دەستی لێ مەدەن بۆئەوەی نەمرن) (٣) جا مارەکە بە ئافرەتەکەی وت: (بە مردن نامرن (٤) بەڵکو خوا ئەزانێت هەردووکتان ئەو کاتەی لێی ئەخۆن چاوتان ئەکرێتەوە و وەك خواتان لێدێت باش و خراپ ئەزانن) (٥) وە ئافرەتەکە بینی کە دارەکە بۆ خواردن باشە وە چێژە بۆ بینین وە دارەکە هۆی ئاقڵبوونە. جا لە بەرەکەی برد و خواردی وە دایشی بە مێردەکەی کە لەگەڵیدا بوو جا خواردی (٦) جا چاویان کرایەوە و زانییان کە ڕووتن. جا لە گەڵای هەنجیر جلیان دووری و پۆشاکیان دروستکرد (٧) وە گوێیان لە تەپەی هەنگاونانی خوا بوو کە لە باخەکەدا ئەهات و ئەچوو لەکاتی شنەبای ڕۆژدا،جا ئینسان و ژنەکەی خۆیان شاردەوە لە ڕووی خوا لەنێوان درەختەکانی باخەکە (٨) جا پەروەردگاری یەزدان بانگی ئینسانی کرد و پێی وت: (تۆ لەکوێیت؟) (٩) وتی: (گوێم لە دەنگی

هەنگاوەکانت بوو لە باخەکەدا جا ترسام چونکە ڕووتم وە خۆم شاردەوە) (١٠) وتی: (جا کێ پێی وتیت کە ڕووتیت؟ ئایا لە درەختەکەت خوارد کە پێم وتبوویت کە لێی نەخۆیت؟) (١١) جا ئینسان وتی: (ئەو ئافرەتەی لەگەڵمدا داتناوە ئەو لە درەختەکەی دامێ و خواردم) (١٢) جا پەروەردگاری یەزدان بە ئافرەتەکەی وت: (چیت کرد؟) جا ئافرەتەکە وتی: (مارەکە خەڵەتاندمی و خواردم) (١٣).

- بەپێی ئەم دەقانە ئافرەت یەکەم جار تاوانی کرد و سەرپێچی خوای کرد، وە ئەو بوو سەرەتا پیاوی هاندا تاوان بکات.

— وقال للمرأة: لأكثرن مشقات حملك تكثيرا. فبالمشقة تلدين البنين وإلى رجلك تنقاد أشواقك وهو يسودك (تكوين ٣/ ١٦) وە خوا بە ئافرەتی وت: نارەحەتییەکانی سکپڕیت زۆرئەکەم. جا بە ژانەوە منداڵت ئەبێت وە بۆ مێردەکەت سۆزت ئەبێت و ئەو بەسەرتدا زاڵئەبێت.

- بەگوێرەی ئەم دەقە ئازاری منداڵبوون و ئارەزووکردنی ئافرەت بۆ مێردەکەی سزایە بەسەریەوە. هەروەها کە پیاو دەسەڵاتی بەسەر ژنەکەیدا هەیە. وە هەموو ئەمانە بۆ هەموو ئافرەتێکە. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت ئافرەت هەر لە لەدایکبوونیەوە تاوانبار و بوغزێنراوە

لەلایەن خواوە، وە بە بەردەوامیش سزا ئـەدرێت لەسـەر تاوانێـك كـە نەیكردووە.

— وقال الرب لموسى: (( اذهب إلى الشعب وقدسه اليوم وغدا، وليغسلوا ثيـابهم (١٠) ويكونوا مستعدين لليوم الثالث، فإنه في اليوم الثالث ينزل الرب أمـام الشعب كله على جبل سيناء (١١) وضع حدا للشعب من حواليـه وقـل لهـم: احذروا أن تصعدوا الجبل أو تمسوا طرفه، فإن كل من مسى الجبل يقتل قـتلا (١٢) لا تمسه يد، وإلا يرجم رجمـا أو يرمـى رميـا بالسـهام، بهيمـة كـان أو إنسانا، ولا يحيا. وحين ينفخ في البوق يصعدون الجبـل )) (١٣) فنـزل موسـى من الجبل إلى الشعب وقدسه، وغسلوا ثيابهم (١٤) وقال للشـعب: (( كونـوا مستعدين لليوم الثالث، ولا تقربوا امرأة )) (١٥) (خروج / ١٩) وە خوا بـە موسای وت: (بڕۆ بۆ لای خەڵکەكە و ئەمڕۆ و سبەی پیرۆزیـان بكـە، وە بـا جلەكانیان بشۆن (١٠) وە با ئامادە بن بۆ ڕۆژی سـێیەم، چـونكە لـە ڕۆژی سێیەمدا خوا دائەبەزێت لە بەردەم هەموو گەلەكە لەسەر شاخی سینا (١١) وە سنورێك دابنێ بۆ گەلەكە لە چوار دەوری و پێیان بڵێ: وریـا بـن نەچـنە سەر شاخەكە یان دەست لە قەراغەكەی بدەن، چونكە هەركـەس دەسـت لـە شـاخەكە بـدات ئـەمرێت (١٢) هـیچ دەسـتێك بـەری نەكـەوێت، ئـەگینا بەردباران ئەكرێت یان بە تیر تیرباران ئەكرێت، ئاژەڵ بێـت یـان ئینسـان، وە

ناڑی. وه كاتێك فوو ئەكرێت به كەڕەنادا سەرئەكەون بۆ شاخەكە) (١٣) جا موسا له شاخەكە دابەزی بۆ لای گەلەكە و پیرۆزی كردن، وه جلەكانیان شت (١٤) وه به گەلەكەی وت: (ئامادەی ڕۆژی سێیەم بن، وه لەگەڵ ئافرەتدا جووت مەبن) (١٥).

- وخاطب الرب موسى قائلا: (١) (( كلم بني إسرائيل وقل لهم: (( أية امرأة حبلت فولدت ذكرا تكون نجسة سبعة أيام، كأيام طمثها تكون أيام نجاستها (٢) وفي اليوم الثامن تختن قلفة المولود (٣) وثلاثة وثلاثين يوما تظل في تطهير دمها. لا تمس شيئا من الأقداس ولا تدخل المقدس، حتى تتم أيام طهرها (٤) فإن ولدت أنثى، تكون نجسة أسبوعين كما في طمثها، وستة وستين يوما تظل في تطهير دمها (٥) وعند اكتمال أيام طهرها، لذكر كان أو لأنثى، تأتي بحمل حولي محرقة، وبفرخ حمام أو بيمامة ذبيحة خطيئة، إلى باب خيمة الموعد، إلى الكاهن (٦) فيقربهما أمام الرب ويكفر عن المرأة، فتطهر من سيلان دمها. هذه شريعة الوالدة ذكرا وأنثى (٧) فإن لم يكن في يدها ثمن حمل، فلتأخذ زوجي يمام أو فرخي حمام، أحدهما محرقة والآخر ذبيحة خطيئة، فيكفر عنها الكاهن فتطهر (٨) (اللاويين / ١٢) وه خوا قسەی لەگەڵ موسادا كرد و وتی: (١) قسه لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا بكە و پێیان بڵێ: (هەر ئافرەتێك سك هەڵگرێت و نێرێكی ببێت حەوت ڕۆژ گڵاو ئەبێت،

وە ڕۆژانی سووڕی مانگانەی ڕۆژانی گڵاوییەکەی ئەبێت (٢) وە لە ڕۆژی هەشتەمدا گۆشتی زەکەری لەدایکبووەکە خەتەنە ئەکرێت (٣) وە سی و سێ ڕۆژ لە پاکبوونەوەی خوێندا ئەبێت. دەست لە هیچ پیرۆزێکەوە نەدات و ناچێتە جێی پیرۆز هەتا ڕۆژەکانی پاکێتیی تەواو ئەبێت (٤) وە گەر مێیەکی ببێت دوو هەفتە گڵاو ئەبێت وەك لە کاتی سووڕی مانگانەیدا، وە شەست و شەش ڕۆژ لە پاککردنەوەی خوێنەکەیدا ئەبێت (٥) وە لە کاتی تەواو بوونی ڕۆژەکانی پاکبوونەوەیدا بۆ نێر یان مێ، بەرخێك دێنێتە جێی سووتاندن، وە بێچووە کۆترێکیش یان کوکوختییەك سەربڕدراوی تاوان بۆ بەردەم چادری چاوپێکەوتن بۆ کاهینەکە (٦) جا ئەویش پێشکەشی دەکات لەبەردەم خوادا و کەفارەت بۆ ئافرەتەکە ئەکات، وە لە خوێنلێچوونەکەی پاك ئەبێتەوە. ئەمە ڕێنمایی دایکە نێر بێت یان مێ (٧) جا گەر نرخی بەرخێکی لەدەستدا نەبوو، ئەوا با دوو کوکوختی یان دوو بێچووە کۆتر ببات، یەکێکیان بۆ سووتاندن وە ئەوی تریان سەربڕدراوی تاوان، جا کاهینەکە کەفارەتی بۆ ئەکات و پاك ئەبێتەوە (٨).

— وأية امرأة كان بها سيلان، أي سيلان دم من جسدها، تبقى سبعة أيام في نجاسة طمثها، وكل من لمسها يكون نجسا حتى المساء (١٩) وكل ما تضجع عليه في طمثها يكون نجسا، وكل ما تجلس عليه يكون نجسا (٢٠) وكل من

مس مضجعها يغسل ثيابه ويستحم في الماء ويكون نجسا حتى المساء (٢١) ومن مس شيئا مما تجلس عليه يغسل ثيابه ويستحم في الماء ويكون نجسا حتى المساء (٢٢) وإن كان على مضجعها أو على ما هي جالسة عليه شيء، فإن مسه يكون نجسا حتى المساء (٢٣) وإن ضاجعها رجل فصارت عليه نجاسة طمثها، يكون نجسا سبعة أيام، وكل مضجع يضجع عليه يكون نجسا (٢٤) وأية امرأة سال دمها أياما كثيرة في غير وقت طمثها أو امتد السيلان إلى ما بعد وقت طمثها، تكون في جميع أيام سيلان نجاستها كما في أيام نجاسة طمثها: إنها نجسة (٢٥) وكل مضجع تضجع عليه كل أيام سيلانها يكون لها كمضجع نجاسة طمثها، وكل ما تجلس عليه يكون نجسا كنجاسة طمثها (٢٦) وكل من مس شيئا منها يكون نجسا، فيغسل ثيابه ويستحم في الماء، ويكون نجسا حتى المساء (٢٧) وإذا طهرت من سيلانها، فلتحسب لها سبعة أيام، وبعد ذلك تطهر (٢٨) وفي اليوم الثامن تأخذ لها زوجي يمام أو فرخي حمام وتأتي بهما إلى الكاهن إلى باب خيمة الموعد (٢٩) فيضع الكاهن أحدهما ذبيحة خطيئة والآخر محرقة، ويكفر عنها الكاهن سيلان نجاستها أمام الرب (٣٠) فاعزلا بني إسرائيل عن نجاستهم، لئلا يهلكوا في نجاستهم، بتنجيسهم مسكني الذي بينهم )) (٣١) هذه شريعة من به سيلان، ومن يخرج منه سيلان منوي، فيتنجس بهما (٣٢)

والحائض في نجاسة طمثها، ومن به سيلان مـن ذكـر أو أنثـى، والرجـل الـذي يضـاجع منجسـة (٣٣) (اللاويـين / ١٥) وە هـەر ئافرەتێـك خوێنلێچـوونی هەبوو، واتە دەرهاتنی خـوێن لـە لەشـییەوە، ئـەوا حـەوت ڕۆژ لـە گـڵاوی خوێنەکەیدا ئەبێت، وە هەرکەس دەست لە ئافرەتەکە بدات تا ئێـوارە گـڵاو ئەبێت (١٩) وە هەرشتێك لەسەری ڕابکشێت لە خوێنەکەیدا گـڵاو ئـەبێت، وە هەرشتێك لەسەری دانیشێت گڵاو ئەبێت (٢٠) وە هەرکـەس دەسـت لـە جێی پاڵکەوتنەکەی بدات جلەکانی ئەشوات و خۆی ئەشوات لە ئاودا وە تـا ئێوارە گڵاو ئەبێت (٢١) وە هەرکەس دەست لە شتێك بـدات کـە لەسـەری دانیشتبێت جلەکانی ئەشوات و خۆی ئەشوات لە ئاودا وە تـا ئێـوارە گـڵاو ئەبێت (٢٢) وە گەر لەسەر ئەو شتەی لەسەری پاڵکەوتووە یـان دانیشـتووە شتێك هەبێت و دەستی لێیدابێت ئەوا هـەتا ئێـوارە گـڵاو ئـەبێت (٢٣) وە گەر پیاوێك لەگەڵی جووت ببێت و گڵاوی خوێنەکەی بەری بکـەوێت، ئـەوا حەوت ڕۆژ گڵاو ئەبێت، وە هەر جێیەك لێی پاڵبکەوێت گـڵاو ئـەبێت (٢٤) وە هەر ئافرەتێك ڕۆژانێکی زۆر خوێنی لـێ بـڕوات لـە دەرەوەی ڕۆژەکـانی خوێنی یان درێژ بووەوە بۆ دەرەوەی مـاوەی سـووڕەکەی، ئـەوا لـە هـەموو ڕۆژەکانی خوێنلێچوونە گڵاوەکەیدا وەك ڕۆژانی گڵاویی سـووڕەکەی دەبێـت، ئـەو ئافرەتـە گـڵاوە (٢٥) وە هـەر جێیـەك لەسـەری پاڵبکـەوێت هـەموو

ڕۆژەکانی خوێنلێچوونەکەی بۆی وەك جێی گڵاویی سوورەکەیەتی، وە هەرشتێك لەسەری دانیشێت گڵاو ئەبێت وەك گڵاویی سوورەکەی (٢٦) وە هەرکەس دەست لە شتێکی بدات گڵاو ئەبێت، جا جلەکانی ئەشوات و لە ئاودا خۆی ئەشوات، وە تا ئێوارە گڵاو ئەبێت (٢٧) وە گەر لە خوێنلێچوونەکەی پاك بووەوە، با حەوت ڕۆژی بۆ بژمێردرێت، وە دوای ئەوە پاك ئەبێتەوە (٢٨) وە لە ڕۆژی هەشتەمدا دوو کوکوختی یان دوو بێچووە کۆتر ئەبات و دەیانهێنێتە لای کاهینەکە بۆ لای دەرگای چادری چاوپێکەوتنەکە (٢٩) وە کاهینەکە یەکێکیان ئەکات بە قوربانی تاوان و ئەوی تر ئەسووتێنێت، وە کاهینەکە کەفارەتی خوێنلێچوونی گڵاوییەکەی ئەدات لەبەردەم خوادا (٣٠) جا بەنی ئیسرائیل لە گڵاوییەکەیان جیا بکەنەوە، نەوەك لە گڵاویی خۆیاندا لەناو بچن، بە گڵاوکردنی نشینگەکەم لەناویاندا) (٣١) ئەمە ڕێنمایی ئەو کەسەیە کە لێچوونی هەیە، وە ئەوەی تۆواوی لێ ئەچێت، پێی گڵاو ئەبێت (٣٢) وە حەیزدار لە گڵاویی سوورەکەیدا، وە ئەوەی لێچوونی هەیە لە نێر یان مێ، وە ئەو پیاوەی کە لەگەڵ ژنێك جووت ببێت کە گڵاوە (٣٣).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت ئافرەت سەرچاوە و هۆی گڵاوبوونە. وە گەر ئافرەت منداڵی ببێت گڵاو ئەبێت، وە گەر منداڵەکە کچ بێت

گڵاوییەکەی دوو قاتە. وە ئافرەت ئەبێت کەفارەتەکەی بدات تا پاك ببێتەوە. وە ئافرەت گەر بکەوێتە سوڕی مانگانەیەوە ئەوا خۆی و هەر شتێك بەری بکەوێت گڵاوە. وە ئافرەت هەمان حوکمی هەیە گەر خوێنی نەزیفیشی لێوە هات، وە ئەبێت کەفارەتی بدات و بچێت بۆ لای پیاوی دینەکە تا لێی خۆشبێت. وە گەر ئەم گڵاوییەی ئافرەتان پاکنەکرێتەوە بەو جۆرە ئەوا ئەو قەومە تیائەچن.

– وإذا كانت المرأة لا تغطي رأسها فلتقص شعرها، ولكن إذا كان من العار على المرأة أن تكون مقصوصة الشعر أو محلوقته فعليها أن تغطي رأسها (٦) أما الرجل فما عليه أن يغطي رأسه، لأنه صورة الله ومجده، وأما المرأة فهي مجد الرجل (٧) فليس الرجل من المرأة، بل المرأة من الرجل (٨) ولم يخلق الرجل من أجل المرأة، بل خلقت المرأة من أجل الرجل (٩) (كورنثوس الأول / ١١) وە گەر ئافرەت سەری دانەپۆشی ئەوا با قژی ببڕێت، بەڵام گەر شەرم بێت لەسەر ئافرەت کە قژی بڕدراو بێت یان تاشراو بێت ئەوا لەسەریێتی سەری داپۆشێت (٦) بەڵام پیاو لەسەری نییە سەری داپۆشێت، چونکە وێنە و شکۆی خوایە، بەڵام ئافرەت شکۆی پیاوە (٧) جا پیاو لە ئافرەتەوە نییە، بەڵکو ئافرەت لە پیاوەوەیە (٨) وە پیاو بۆ ئافرەت دروستنەکراوە بەڵکو ئافرەت بۆ پیاو دروستکراوە (٩).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت گەر ئافرەت سەری ڕووت بوو ئەوا سزاکەی ئەوەیە شێوەی بشێوێنرێت.

– ولتصمت النساء في الجماعات، شأنها في جميع كنائس القديسين، فإنه لا يؤذن لهن بالتكلم. وعليهن أن يخضعن كما تقول الشريعة أيضا (٣٤) فإن رغبن في تعلم شيء، فليسألن أزواجهن في البيت، لأنه من غير اللائق للمرأة أن تتكلم في الجماعة (٣٥) (كورنثوس الأول / ١٤) وە با ئافرەت بێدەنگ بێت لە کۆبوونەوەکاندا هاوشێوە لە هەموو کڵێسای پیرۆزەکاندا، چونکە ڕێیان نادرێت قسە بکەن. وە لەسەریانە کە ملکەچ بن وەك تەوراتیش دەیڵێت (٣٤) جا گەر ویستیان شتێك فێربن با لە ماڵەوە لە مێردەکانیان بپرسن، چونکە نەگونجاوە بۆ ئافرەت کە لە ناو کۆمەڵدا قسە بکات (٣٥).

- بەپێی ئەم دەقانە ئافرەت ئەبێت بێدەنگ بێت و بۆی نییە پرسیار بکات و قسە بکات لە مەجلیس یان کەنیسەدا. وە تەنها لە ماڵەوە لە مێردەکەی ئەپرسێت.

– فقال شيوخ الجماعة: ((ماذا نصنع بالذين بقوا من حيث النساء، فقد انقطعت النساء من بنيامين؟ )) (١٦) وقالوا: ((إن ميراث بنيامين يكون للناجين، فلا يمحى سبط من إسرائيل (١٧) أما نحن فليس لنا أن نزوجهم من بناتنا (( لأن بني إسرائيل كانوا قد حلفوا قائلين: ((ملعون من يعطي

بنيامين زوجة)) (١٨) ثم قالوا: ((قد حان عيد الرب السنوي في شيلو (التي إلى شمال بيت إيل، شرقي الطريق الصاعد من بيت إيل إلى شكيم، وجنوبي لبونة))) (١٩) فأوصوا بني بنيامين وقالوا لهم: ((انطلقوا واكمنوا في الكروم (٢٠) وترصدوا. فإذا خرجت بنات شيلو للرقص معا، فاخرجوا من الكروم واخطفوا كل واحد امرأته من بنات شيلو، وانطلقوا إلى أرض بنيامين (٢١) فإذا جاءنا آباؤهن وإخوتهن للشكوى، نقول لهم: هبونا إياهن، لأننا لم نأخذ لكل واحد امرأة في الحرب، ولأنكم لم تعطوهم أنتم، حتى لا تكونوا قد أثمتم )) (٢٢) ففعل بنو بنيامين كذلك، واتخذوا نساء بحسب عددهم من الراقصات اللواتي اختطفوهن، وانصرفوا ورجعوا إلى ميراثهم، وأعادوا بناء المدن وسكنوها (٢٣) وحينئذ انصرف بنو إسرائيل من هناك، كل واحد إلى سبطه وعشيرته، وخرجوا من هناك، كل واحد إلى ميراثه (٢٤) وفي تلك الأيام، لم يكن لبني إسرائيل ملك، وكان كل إنسان منهم يحلى ما حسن في عينيه (٢٥) (القضاة / ٢١) جا پیرانی کۆمەڵەکە وتیان: (چی بکەین بۆ ئەوانەی تر لەڕووی ژنەوە؟ چونکە ئافرەت بڕاوە لە نەوەی بنیامین) (١٦) وە وتیان: (میراتی بنیامین بۆ دەربازبووەکانە، جا هیچ هۆزێك لە ئیسرائیل ناسڕدرێتەوە (١٧) ئەمما ئێمە بۆمان نییە لە کچەکانی خۆمانیان بدەینێ) چونکە بەنی ئیسرائیل سوێندیان خواردبوو وتبوویان: (ئەوەی ژن بدات بە

بنیامین مەلعونە) (١٨) پاشان وتیان: (وا کاتی جەژنی ساڵانەی خوا هاتووە لە شیلۆ) کە ئەکەوێتە باکوری بەیت ئیلەوە لە ڕۆژهەلاتی ڕێگاکەی بەرز ئەبێتەوە لە بەیت ئیلەوە بۆ شەکیم باشوری لەبونە (١٩) جا نەسیحەتی نەوەکانی بنیامینیان کرد و پێیان وتن: (بڕۆن و خۆتان لە ڕەزەکاندا بشارنەوە (٢٠) وە چاوەڕێ بن. جا کە کچانی شیلۆ دەرچوون بۆ سەماکردن پێکەوە، ئەوا لە ڕەزەکانەوە دەرچن و هەریەکە ژنێك بۆخۆی بفڕێنێت لە کچەکانی شیلۆ، وە دەرچن بۆ زەوی بنیامین (٢١) جا گەر باوکەکانیان یان براکانیان هاتن بۆ لامان بۆ سکاڵا، پێیان ئەڵێین: کچەکانمان بدەنێ، چونکە بۆ هیچیان لە شەڕدا ئافرەتمان نەبردووە، وە چونکە ئێوەش نەتانداون پێمان بۆ ئەوەی گوناحبار نەبن) (٢٢) جا نەوەکانی بنیامین وایانکرد، وە بەگوێرەی ژمارەیان ئافرەتیان برد لە سەماکەرەکان لەوانەی کە فڕاندبوویانن، وە ڕۆشتن و گەڕانەوە بۆ میراتییەکەیان، وە شارەکانیان ئاوەدانکردەوە و نیشتەجێی بوون (٢٣) وە ئەوسا بەنو ئیسرائیل لەوێ ڕۆشتن، هەریەکەیان بۆ هۆز و عەشرەتەکەی، وە لەوێ دەرچوون هەریەکە بۆ میراتەکەی (٢٤) وە لەو ڕۆژانەدا بەنی ئیسرائیل پاشایان نەبوو، وە هەر مرۆڤێکیان ئەوەی ئەکرد کە خۆی پێی باش بوو (٢٥).

- بەپێی ئەم دەقانە بێت گەر ژنت دەستنەکەوت یان کەس ژنی نەدایتێ، ئەوا بچۆ ئافرەتێك بدۆزەرەوە و هەڵیگرە. وە گەر دواییش کەسوکاری هاتن بڵێ تازە شتەکە ڕوویداوە و بمدەنێ.

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ (٣٤) وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ (٣٦) فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (٣٧) قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (٣٨) وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٣٩) (البقرة) وە کاتێك بە فریشتەکانمان وت کڕنوش بۆ ئادەم ببەن هەموو کڕنوشیان برد ئیبلیس نەبێت نەیبرد و لوتبەرز بوو وە لە کافران بوو (٣٤) وە وتمان ئەی ئادەم تۆ و ژنەکەت بچنە بەهەشتەوە، وە تیایا بخۆن بێ ماندووبوون چیتان بوێت، وە نزیك ئەم دارە مەکەونەوە ئەگینا لە

ستەمکاران ئەبن (٣٥) جا شەیتان پێــی خلیســکاندن لێــی جــا دەریهێنــان لەوەی تیایبوون، وە وتمان دابەزن هــەنێکتان بــۆ ئــەوی تــر دوژمنــە، وە لــە زەویدا نیشتەجێ بن و پێداویستیتان هەیە تا قیامەت (٣٦) جــا ئــادەم لــە پەروەردگارییەوە چەند وشەیەکی وەرگرت و ئەویش لێی خۆشبوو، هەر ئــەوە لێبووردە و بەرەحم (٣٧) وتمان هەمووتان دابەزنە سەر زەوی، جا لــە منــەوە هیدایەتتان بۆ دێت جا هەرکەس شوێن هیدایەتەکەم بکــەوێت ئــەوا ترســیان لەســەر نییــە و خەفــەتیش نــاخۆن (٣٨) وە ئەوانــەی کوفریــان کــرد و ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە ئائەوانە هاوەڵانی ئاگرن ئەوان تیایا ئەمێننەوە بە نەمری (٣٩) ﴾.

+ ﴿ وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (١٩) فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ (٢٠) وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ (٢١) فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ (٢٢) قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٢٣) قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ

(٢٤) قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ (٢٥) يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (٢٦) يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ (٢٧) (الأعراف) وە ئەی ئادەم تۆ و خێزانەکەت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن جا بخۆن لە هەر شتێك بتانەوێت، وە نزیکی ئەو دارە مەکەونەوە ئەگینا لە ستەمکاران ئەبن (١٩) جا شەیتان وەسوەسەی بۆ کردن تا ئەوەیان بۆ دەرخات کە شاردرابووەوە لە عەورەتیان، وە وتی پەروەردگارتان ڕێی لێ نەگرتوون لەو دارە ئیللا بۆ ئەوە نەبێت کە ببن بە فریشتە یان ببن بە نەمر (٢٠) وە سوێندی بۆ خواردن کە من لە ئامۆژگاریکەرانتانم (٢١) جا نزمیکردنەوە بە فێڵ، جا کاتێك تامی درەختەکەیان کرد عەورەتیان بۆیان دەرکەوت، وە بە گەڵای دارەکانی بەهەشت دایانپۆشی، وە پەروەردگاریان بانگیکردن ئەی نەهیم لێ نەکردن لەو دارە وە پێم وتن کە شەیتان بۆتان دوژمنێکی ڕوونە (٢٢) وتیان پەروەردگارمان زوڵممان لە خۆمان کرد وە گەر لێمان خۆشنەبیت و ڕەحممان پێنەکەیت لە دۆڕاوەکان ئەبین (٢٣) وتی دابەزن لە ئاسمان هەندێکتان ئەبن بە دوژمنی هەندێکتان، وە لە زەویدا جێگیر ئەبن و هۆکاری ژیانتان هەیە تا

قیامەت (٢٤) وتی تیایا ئەژین و تیایا ئەمرن و لێوەی دەرئەهێنرێن (٢٥)
ئەی نەوەی ئادەم جلمان بۆ دابەزاندوون عەورەتتان ئەشارێتەوە و ڕازاوەییە،
وە جلی تەقوا باشترینە، ئەوە لە نیشانەكانی خوایە بەڵكو یادبكەنەوە (٢٦)
ئەی نەوەی ئادەم شەیتان فێڵتان لێ نەكات وەك چۆن باوك و دایكتانی لە
بەهەشت دەركرد پۆشاكی لەبەریان داكەند بۆئەوەی عەورەتی یەكیان نیشان
بدات، ئەو ئەتانبینێت خۆی و پۆلەكەی بە شێوەیەك كە ئێوە نایانبینن، ئێمە
شەیتانەكانمان كردووە بە دۆستی ئەوانەی ئیمان ناهێنن (٢٧) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا (١١٥) وَإِذْ
قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ (١١٦) فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ
هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ (١١٧) إِنَّ لَكَ
أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ (١١٨) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ
(١١٩) فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ
وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ (١٢٠) فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ
عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ (١٢١) ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ
فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ (١٢٢) قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ
فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ (١٢٣) وَمَنْ
أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ

(١٢٤) (طه) وە بە دڵنیایی ئامۆژگاری ئادەممان کرد پێشتر جا بیریچوو وە سووربوونمان نەبینی لێوەی لەسەر تاوان (١١٥) وە کە بە فریشتەکانمان وت سوجدە بۆ ئادەم ببەن جا سوجدەیان برد جگە لە ئیبلیس ڕەتیکردەوە (١١٦) جا وتمان ئەی ئادەم ئا ئەمە دوژمنە بۆ تۆ و خێزانەکەت، جا با لە بەهەشت دەرتاننەکات ئیتر ماندوو بیت (١١٧) تۆ بۆت هەیە تیایا برسی نەبیت و ڕووت نەبیت (١١٨) وە تۆ تینوو نابیت تیایا وە تیشکی خۆرت بەرناکەوێت (١١٩) جا شەیتان وەسوەسەی بۆ کرد وتی ئەی ئادەم ئایا داری نەمری و موڵکێکی تەواو نەبووت پێ نیشان بدەم (١٢٠) جا لێیان خوارد جا عەورەتیان بۆیان دەرکەوت، وە بە گەڵای بەهەشت دایانپۆشی، وە ئادەم سەرپێچی خوای کرد جا ژیانی تێکچوو (١٢١) پاشان پەروەردگاری هەڵیبژارد وە لێی خۆشبوو وە هیدایەتی دا (١٢٢) وتی هەمووتان لێی دابەزن، هەنێکتان ئەبنە دوژمنی هەنێکتان، جا هیدایەتتان لە منەوە بۆ دێت جا هەرکەس شوێن هیدایەتم بکەوێت ئەوا وێڵ نابێت و بەدبەخت نابێت (١٢٣) وە هەرکەس پشتبکاتە دینەکەم ئەوا ژیانێکی تەنگی هەیە، وە لە قیامەتدا بە کوێری حەشری ئەکەین (١٢٤) ﴾.

- ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەمان فێرئەکەن کە خوای گەورە ڕێزی لە ئادەم گرت، وە خۆی و خێزانەکەی کردە بەهەشتەوە و لە

هەردووکیانی قەدەغە کرد لە دارەکە بخۆن، وە شەیتان هەردووکیانی فریودا. وە قورئان تاوانەکەی نەخستووەتە ملی ئافرەتەکە بەتەنیا بەڵکو هەردووکیانی بە تاوانبار داناوە، بەڵکو لە جێیەکدا تەنها ئاماژە بۆ ئادەم ئەکات علیه السلام. وە خوای گەورە تۆبەی فێری ئادەم کرد و ئەویش علیه السلام تۆبەی کرد لە تاوانەکەی و، خوای گەورەش لە خۆی و خێزانەکەشی خۆشبوو، وە سزای خۆیان و نەوەکانیانی نەداوە.

- جێی باسە کە کتێب وای دەرئەخات کە خوای گەورە درۆی لەگەڵ ئادەم و خێزانەکەیدا کردبێت لە هۆکاری قەدەغەکردنی بەری دارەکەدا، بەوەی گەر لێی بخۆن ئەمرن، لەکاتێکدا کە لە دارەکەیان خوارد نەمردن. وە شەیتان قسەکەی ڕاست دەرچوو بەوەی فێری خێر و شەڕ بوون. بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا شەیتان درۆی کرد و وتی دارەکە هی نەمریی و بوونە بە فریشتە، وە بەدرۆوە سوێنیشی خوارد.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ (الحجرات - ١٣)

ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە، وە کردوومانن

بە گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خـوا بەتەقواترینتانـە، بێگومان خوا زۆر زانا و شارەزایە ﴾.

+ ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ (٢٠) وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢١) وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ (٢٢) (الروم) وە لە ئایەتەکانی خوا ئەوەیـە کـە لـە خـۆڵ دروسـتیکردوون پاشان ئێوە مرۆڤن و بڵاو ئەبنەوە (٢٠) وە لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان خێزانـی بـۆ دروسـتکردوون تـا بحەسـێنەوە لـەلایانا، وە لـە نێوانتانا حۆشەویستی و سۆزی داناوە، ئا لەوەدا نیشانە هەیـە بـۆ قـەومێك بیربکەنـەوە (٢١) وە لـە نیشـانەکانی ئەوەیـە کـە ئاسمانـەکان و زەوی دروستکردووە وە جیاوازی زمانتان و ڕەنگتان، بە دڵنیـاییی لەوانـەدا بەڵگـە هەیە بۆ ئەوانەی ئەزانن (٢٢) ﴾.

+ ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ (١٤) ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ (١٦) (المؤمنون) وە بێگومان ئینسانمان لە دەرهێنـراوی گـڵ دروسـتکردووە

(١٢) پاشـان کردوومانـە بـە تۆوێـك لـە جێیـەکى جـێگیردا (١٣) پاشـان تۆوەکەمان کردووە بە هەڵواسراو جا هەڵواسـراوەکەمان کـردووە بـە پارچـە گۆشت جا پارچە گۆشتەکەمان کرد بە ئێسقان جا ئێسقانەکەمان داپۆشى بە گۆشت، پاشان رۆحمان کرد بە بەریا و بوو بە مرۆڤێکى تر، جا خوا بەرەکەتى زۆرە و باشترین دروستکەرە (١٤) پاشان ئێوە دواى ئەوە ئەمرن (١٥) پاشان ئێوە ڕۆژى هەڵسانەوە زیندووئەکرێنەوە (١٦) ﴾.

+ ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِي وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ (لقمان - ١٤) وە نەسـیحەتى مرۆڤمان کرد بە دایك و باوکى کە سوپاسـى مـن وە دایـك و باوکـت بکـە گەڕانەوە بۆ لاى منە ﴾.

+ ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ ۖ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ (الأحقاف - ١٥) وە ئامۆژگارى مرۆڤمان کردووە کە لەگەڵ دایك و باوکیدا چاکەکار بێت، دایکى بـە ناڕەحـەتى هـەڵیگرت و بـە ناڕەحـەتى داینا، وە هەڵگرتن و لەشیربڕینەوەى سـى مانگـە، هـەتا ئەگاتـە ئەوپـەڕى پێگەیشتن و ئەگات بە چـل سـاڵ ئـەڵێت پـەروەردگارم یارمـەتیم بـدە کـە

سوپاست بکەم لەسەر ئەو نیعمەتەی داوتە پێم وە بە باوك و دایکم وە کە کاری چاك بکەم ڕازیبیت پێی وە نەوەکانم چاك بکە، من بۆ لای تۆ گەڕامەوە وە من لە موسوڵمانانم ﴾.

+ ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا (الإسراء - ١٥) کێ هیدایەت وەرگرێت ئەوا بۆخۆی هیدایەت وەرئەگرێت، وە کێ گومڕابێت خراپەکەی بۆ خۆیەتی، وە هیچ کەسێك تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت، وە سزای هیچ قەومێك نادەین تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین ﴾.

+ ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ (فاطر - ١٨) وە هیچ کەس تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت، وە گەر تاوان زۆرێك داوا بکات تاوانەکانی کە هەڵیگرتوون بۆی هەڵگرن ئەوا هیچی لێ هەڵناگرێت ئەگەر نزیك و دۆستیشی بێت، تۆ بە دڵنیایی ئەوانە ئاگادار ئەکەیت کە بە نهێنی لە پەروەردگاریان ئەترسن وە نوێژ ئەکەن، وە هەرکەس خۆی پاکبکاتەوە ئەوا بۆ خۆی پاکئەکاتەوە، وە سەرئەنجام بۆ لای خوایە ﴾.

+ ﴿ خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۚ يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ (٦) إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (٧) (الزمر) لە یەك نەفس دروستیکردوون پاشان لەوەوە جووتەکەی دروستکرد وە لە ئاژەڵانیش هەشت جۆر جووتی بۆتان دابەزاندووە، لە سکی دایکتاندا دروستتان ئەکات قۆناغ دوای قۆناغ لە سێ تاریکاییدا، ئەوە الله یە پەروەردگارتان موڵك هی ئەوە، هیچ خوایەکی حەق نییە جگە لەو، جا چۆن لە عیبادەتی لائەدەن (٦) گەر کوفر بکەن ئەوا خوا پێویستی پێتان نییە، وە بە کوفر ڕازی نییە بۆ عەبدەکانی، وە گەر سوپاس بکەن لێتان ڕازی ئەبێت، وە هیچ نەفسێك تاوانی نەفسێکی تر هەڵناگرێت، پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە وە پێتان ئەڵێت ئەوەی ئەتانکرد، ئەو زانایە بەوەی لە سنگەکاندایە (٧) ﴾.

+ ﴿ قُل لَّا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّآ أَجۡرَمۡنَا وَلَا نُسۡـَٔلُ عَمَّا تَعۡمَلُونَ (سبأ - ٢٥) بڵێ پرسیار و موحاسەبەی ئەوە ناکرێن کە ئێمە کردوومانە، وە ئێمەش موحاسەبە ناکرێین لەسەر ئەوەی ئەیکەن ﴾.

+ ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ (١٢) وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ (١٣) (العنكبوت) وە كافران بە ئیماندارانیان وت شوێن ڕێگەکەمان بکەون وە ئێمە تاوانەکانتان هەڵئەگرین، وە ئەوان هیچ تاوانێکیان هەڵناگرن، ئەوان درۆزنن (١٢) وە قورساییەکانیان هەڵئەگرن وە قورسایی تر لەگەڵ قورساییەکانیاندا، وە لێپرسینەوەیان ئەکرێت لە قیامەتدا لەسەر ئەوەی هەڵیانئەبەست (١٣) ﴾.

- دەقە پیرۆزەکانی قورئان پێمان ئەڵێن کە مرۆڤ لە نێر و مێیەکەوە دروستبوون لە گڵ، وە دواتر بڵاوبوونەتەوە و بوون بە نەتەوەی جیاواز. وە ئەسڵ ئەوەیە مرۆڤ نێر و مێی بەڕێزە، وە بەڕێزترینیشیان لای خوا ئەوەیانە خوا بناسێ و لێی بترسێت و گوێرایەڵی بێت. وە خوای گەورە ئافرەتی بۆ پیاو دروستکردووە و لەخۆیەتی و هۆی ئارامی و حەوانەوەیە، وە لە فیترەتە سۆز و ڕەحم لەنێوانیاندا هەبێت. وە منداڵبوون بۆ خستنەوەی وەچە و نەوەیە نەوەك سزا بێت. وە منداڵ ئەبێت بیر لەوە بکاتەوە دایکی بەسك هەڵیگرتووە و پێوەی ماندوو بووە تا بوویەتی و گەورەی کردووە، وە ئەبێت چاکەکار بێت بەرامبەر

دایك و باوكی. وە كەس تـاوانی كەسـێكی تـر هـەڵناگرێت تەنانـەت ئەگەر خزم و كەسی نزیكی یەكیش بن، یان هەردوو لا ڕازیش بـن. وە لە ئیسلامدا ئازار و بەڵا و ناڕەحەتی دنیا مەرج نییە هەمیشـە سـزا بێت، بەڵكو ئەشێ تاقیكردنەوە بێت یان هۆی سـڕینەوەی تـاوان یـان بەرزبوونەوەی پلەی عەبدەكە بێت ﴿ عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إنَّ أمْـرَهُ كُلَّـهُ خَيْرٌ، وليسَ ذاكَ لأَحَدٍ إلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إنْ أصابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكانَ خَيْـرًا له، وإنْ أصابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكانَ خَيْرًا له (صحيح مسلم - ٢٩٩٩) حاڵی ئیماندار چەند سەیرە، هەموو حاڵی خێـرە، وە ئـەوە بـۆ كـەس نییە جگە لە ئیماندار، گەر خۆشییەكی تووشبێت شـوكر ئـەكات جـا ئەوە خێرە بۆی، وە گەر زەرەرێكی تووشبێت سەبر ئـەگرێت جـا ئـەوە خێرە بۆی ﴾، ﴿ ما مِن مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً، فَما فَوْقَهـا إلَّـا كُتِبَـتْ لـه بهَا دَرَجَةٌ، وَمُحِيَتْ عنْه بهَا خَطِيئَـةٌ (صـحيح مسـلم - ٢٥٧٢) هـیچ موسوڵمانێك نییە دڕكێكی پیا بچێت یان لە سەروو ئەوەوە ئیللا بەوە پلەیەكی بۆ ئەنوسرێت، وە تـاوانێكی پـێ ئەسـڕدرێتەوە ﴾، ﴿ والمـرأةُ تمـوتُ بجُمـعٍ شـهيدٌ (صـحيح ابـن حبـان - ٣١٨٩) وە ئـافرەت لــە دووگیانیدا ئەمرێت شەهیدە ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗا (الحج - ٥) ئەی خەڵکینە گەر لە گوماندان لە زیندووبوونەوە ئەوا ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروستکردووە پاشان لە دڵۆپە تۆوێك پاشان لە پارچە خوێنێکی هەڵواسراو پاشان لە پارچە گۆشتێك شێوەدار و بێ شێوە تا بۆتان ڕوونبکەینەوە، وە چیمان بوێت ئەوە لە ڕەحمەکاندا جێگیر ئەکەین تا کاتێکی دیاریکراو، پاشان بە کۆرپەیی دەرتانئەکەین پاشان تا بگەنە ئەوپەڕی تواناتان، وە تیاتانە ئەمرێندرێت و تیاتانە ئەگەیەنرێت بە ئەوپەڕی تەمەن تا دوای توانا و زانین هیچ نەزانێت ﴾.

+ ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ (٢٠) وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٢١) (الروم) وە لە ئایەتەکانی خوا ئەوەیە کە لە خۆڵ دروستیکردوون پاشان ئێوە مرۆڤن و بڵاو ئەبنەوە (٢٠) وە لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان خێزانی بۆ دروستکردوون تا بحەسێنەوە لەلایانا، وە لە نێوانتانا حۆشەویستی و سۆزی داناوە، ئا لەوەدا نیشانە هەیە بۆ قەومێك بیربکەنەوە (٢١) ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا (١) وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا (٢) وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ (٣) (النساء) ئەی خەڵکینە تەقوای پەروەردگارتان بکەن کە دروستیکردوون لە یەك نەفس وە لەو جووتەکەی دروستکرد وە لەوانەوە پیاوان و ژنانێکی زۆری بڵاوکردووەتەوە، وە تەقوای ئەو خوایە بکەن کە بەو داوای شت ئەکەن وە سیلەی رەحم بکەن، بە دڵنیاییی خوا چاودێرە بەسەرتانەوە (١) وە بە هەتیوەکان بدەن پارەکانیان، وە پیس بە پاك مەگۆڕن، وە پارەکانیان مەدەنە پاڵ ئەوانەی خۆتان، ئەوە تاوانێکی گەورەیە (٢) وە گەر ترسان کە دادپەروەر نەبن لە کچە هەتیوەکاندا ئەوا مارەی بکەن لەو ئافرەتانەی بەدڵتانن دووان وە سیان وە چوار، جا گەر ترسان دادپەروەر نەبن ئەوا یەك دانە یان کەنیزەکەکانتان، ئەوە نزیکترە کە زوڵم نەکەن (٣) ﴾.

+ ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ

ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢) نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢٢٣) (البقرة) وە پرسیاری خوێنی بێنوێـژیت لـێ ئەکـەن، بڵـێ ئەوە ئازارە جا لە ئافرەتان دووركەونەوە لە بێنوێژییاندا وە لەگەڵیان جـووت مەبن هەتا پاك ئەبنەوە، جا كە خۆیان پاككردەوە بچنە لایان لـەو شـوێنەوە خوا فەرمانی پێتانكردووە، خـوا تۆبـەكاران و خـۆ پـاكڕاگرانی خۆشـئەوێت (٢٢٢) ئافرەتـەكانتان كێڵگـەن بۆتـان جـا هەرچـۆن ئەتانـەوێت بچـنە كێڵگەكەتانەوە، وە چاكە بۆخۆتان پێشبخەن، وە تەقوای خوا بكـەن و بـزانن كە پێی ئەگەنەوە، وە مژدە بە ئیمانداران بدە (٢٢٣) ﴾.

+ ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ (٧) (المؤمنون) وە ئەوانەی داوێنیان ئەپارێزن (٥) مەگەر لـە خێزانـەكانیان یان كەنیزەكانیان ئەوا ئەوان لۆمەیان ناكرێت (٦) جا هەركـەس لـە غـەیری ئەوانەدا دامێنی بەكاربێنێت ئەوا ئەوانە سنوور بەزێنن (٧) ﴾.

+ ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ (لقمان - ١٤) وە نەسـیحەتی

مرۆڤمان کرد بە دایك و باوکی کە سوپاسی من وە دایك و باوکت بکە گەڕانەوە بۆ لای منە ﴾.

- بەپێی دەقەکانی قورئانی پیرۆز مرۆڤ لە گڵە وە لە ئیسلامدا گڵ پاکە، کەواتە ئەسڵی مرۆڤ پاکێتییە بە نێر و مێیەوە. وە لە قورئاندا ئاسایی و حەڵاڵە پیاو بچێت بەلای خێزانیدا و، لە هیچ جێیەکدا نەهاتووە کە بەوە گڵاو ئەبێت. وە لە قورئانی پیرۆزدا منداڵبوون شتێکی ئاساییە و، نە ئافرەتەکە و نە منداڵەکە و نە هەر شتێك بەر ئافرەتەکە بکەوێت گڵاوە. وە لە ئیسلامدا خوێنی زەیستانی و سوڕی مانگانەکە گڵاوە نەوەك ئافرەتەکە خۆی. وە هیچ کەفارەتێك لەسەر ئافرەت نییە بەهۆی منداڵبوون یان خوێنەوە ﴿ فَخَرَجْنَا معهُ، حتَّى أَتَيْنَا ذَا الحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بنَ أَبِي بَكْرٍ، فأرْسَلَتْ إلى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: كيفَ أَصْنَعُ؟ قالَ: اغْتَسِلِي، وَاسْتَثْفِرِي بثَوْبٍ وَأَحْرِمِي (صحيح مسلم - ١٢١٨) لەگەڵ پێغەمبەر دەرچووین و کە هاتینە ذەلحولەیفە ئەسمائی کچی عومەیس محمدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، جا ناردی بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە: چی بکەم؟ وتی: غوسڵ دەربکە، وە خۆت بپێچە بە جلێك و ئیحرام بکە ﴾، ﴿ جاءَتِ امْرَأَةٌ إلى النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه

وسلَّمَ، فقالَتْ: إحْدانا يُصِيبُ ثَوْبَها مِن دَمِ الحَيْضَةِ، كيفَ تَصْنَعُ بهِ؟ قالَ: تَحُتُّه، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بالماءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ (صحيح مسلم - ٢٩١) ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئافرەتێکمان خوێنی حەیز بەر جلی ئەکەوێت، چی لێبکات؟ وتی: ئەیپریوێنێت پاشان بە ئاو ئەیشوات پاشان ئاوی پیا ئەپرژێنێت، پاشان نوێژی تیا ئەکات ﴾. وە زۆر ئاساییە ئافرەت لە کاتی سوڕی مانگانەیدا تێکەڵاوی خێزانەکەی ببێت و لەگەڵیان دانیشێت و بخەوێت. وە ئەو شتەی کە لە مێردەکەی حەرامە لەو کاتەیا تەنیا جووتبوونێتی لەگەڵیا ﴿ كانَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يَقْرَأُ القُرْآنَ ورَأْسُهُ في حَجْرِي وأنا حائِضٌ (صحيح البخاري - ٧٥٤٩) (عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قورئانی ئەخوێند و سەری لە باوەشمدا بوو وە من لە سووڕی مانگانەدا بووم ﴾، ﴿ قالَ لي رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: ناوِلِينِي الخُمْرَةَ مِنَ المَسْجِدِ، قالَتْ فَقُلتُ: إنِّي حائِضٌ، فقالَ: إنَّ حَيْضَتَكِ ليسَتْ في يَدِكِ (صحيح مسلم - ٢٩٨) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی وتم: لە مزگەوتەکە حەسیرەکەم بۆ بێنە. وتی وتم: من لە حەیزدام. وتی: حەیزەکەت لە دەستتدا نییە ﴾، ﴿ وكُنْتُ أنا مِمَّنْ

أهَلَّ بعُمْرَةٍ، فأدْرَكَنِي يَوْمُ عَرَفَةَ وأنا حائِضٌ، فَشَكَوْتُ إلى النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فقالَ: دَعِي عُمْرَتَكِ، وانْقُضِي رَأْسَكِ، وامْتَشِطِي وأَهِلِّي بحَجٍّ (صحيح البخاري - ٣١٧) وە من ئیهلالی عومرەم کردبوو، جا ڕۆژی عەرەفەم بەسەردا هات و لە سووڕی مانگانەدا بووم، جا گلەیم بردە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و وتی: واز لە عومرەکەت بێنە، وە قژت بکەرەوە وە شانەی بکە وە ئیهلالی حەج بکە ﴾، ﴿ قَدِمْتُ مَكَّةَ وأَنَا حَائِضٌ، ولَمْ أَطُفْ بالبَيْتِ ولَا بيْنَ الصَّفَا والمَرْوَةِ قالَتْ: فَشَكَوْتُ ذلكَ إلى رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، قالَ: افْعَلِي كما يَفْعَلُ الحَاجُّ غيرَ أَنْ لا تَطُوفي بالبَيْتِ حتَّى تَطْهُرِي (صحيح البخاري - ١٦٥٠) هاتمە مەککە و لە حەیزدا بووم وە تەوافی کەعبەم نەکردبوو وە تەوافی صەفا و مەروەش، جا گلەیی ئەوەم لەلای پێغەمبەری خوا کرد صلى الله عليه وسلم. وتی: هەموو ئەوە بکە کە حاجی ئەیکات جگە لەوەی تەوافی کەعبە بکەیت هەتا پاك ئەبیتەوە ﴾، ﴿ كانَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يُصَلِّي وأَنَا إلى جَنْبِهِ نَائِمَةٌ، فَإِذَا سَجَدَ أصَابَنِي ثَوْبُهُ وأَنَا حَائِضٌ (صحيح البخاري - ٥١٨) پێغەمبەری خوا نوێژی ئەکرد و من لە تەنیشتیا خەوتبووم، جا گەر سوجدەی ببردایە جلەکەی بەرم ئەکەوت وە من لە سووڕی مانگانەدا

بووم ﴾، ﴿ كانَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يُبَاشِرُنِي وأَنَا حَائِضٌ، وكانَ يُخْرِجُ رَأْسَهُ مِنَ المَسْجِدِ وهو مُعْتَكِفٌ، فأغْسِلُهُ وأَنَا حَائِضٌ (صحيح البخاري - ٢٠٣٠) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مامەڵەی ئەکردم و من لە سووڕی مانگانەدا بووم، وە سەری لە مزگەوتەکەوە دەرئەهێنا و لە ئیعتیکافدا بوو، جا بۆیم ئەشت و من لە حەیزدا بووم ﴾، ﴿ وكانَ يَأْمُرُنِي، فأتَّزِرُ، فيُبَاشِرُنِي وأَنَا حَائِضٌ (صحيح البخاري - ٣٠٠) وە فەرمانی پێئەکردم و لە ناوك بۆ ئەژنۆم دائەپۆشی، جا تێکەڵاوم ئەبوو وە من لە سووڕی مانگانەدا بووم ﴾، ﴿ كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ وأَنَا حَائِضٌ (صحيح البخاري - ٥٩٢٥) قژی پێغەمبەری خوام دائەهێنا صلى الله عليه وسلم وە من لە حەیزدا بووم ﴾، ﴿ كُنْتُ أشْرَبُ وأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فَيَضَعُ فَاهُ علَى مَوْضِعِ فِيَّ، فَيَشْرَبُ، وأَتَعَرَّقُ العَرْقَ وأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فَيَضَعُ فَاهُ علَى مَوْضِعِ فِيَّ (صحيح مسلم - ٣٠٠) من ئاوم ئەخواردەوە و لە حەیزدا بووم پاشان ئەمدایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جا دەمی ئەنایە سەر شوێنی دەمم و ئەیخواردەوە، وە گۆشتی سەر ئێسقانم ئەخوارد و لە حەیزدا بووم پاشان ئەمدایە

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جا دەمی ئەخستە سەر جێی دەمم ﴾، ﴿ أَنَّ اليَهُودَ كَانُوا إِذَا حَاضَتِ المَرْأَةُ فِيهِم لَمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي البُيُوتِ فَسَأَلَ أَصْحَابُ النبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسَلَّمَ النبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فأنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ المَحِيضِ قُلْ هو أذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ في المَحِيضِ} ﴿البقرة: ٢٢٢﴾ إلى آخِرِ الآيَةِ، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: اصْنَعُوا كُلَّ شيءٍ إلَّا النِّكَاحَ (صحيح مسلم - ٣٠٢) یەهود گەر ئافرەت تیایان بکەوتایەتە سەر خوێن نانیان لەگەڵ نەئەخوارد، وە لە ماڵدا لەگەڵیان دانەئەنیشتن، جا هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە پێغەمبەریان پرسی صلى الله عليه وسلم جا خوای گەورەش ئەمەی دابەزاند (وە پرسیاری سووڕی مانگانەت لێ ئەکەن، بڵێ ئەوە ئازارە جا لە جووتبوونی ئافرەتان دووربکەونەوە لە سووڕی مانگانەدا) تا کۆتایی ئایەتەکە، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: هەموو شتێك پێکەوە بکەن جگە لە جووتبوون ﴾، ﴿ إِنَّ الْمُسْلِمَ لا يَنْجُسُ (صحيح البخاري - ٢٨٣) موسوڵمان گڵاو نابێت ﴾. وە خۆپاککردنەوە لە خوێنی زەیستانی و سوڕی مانگانە تەنها بە خۆشتن (غوسڵ) و پاککردنەوەی جل و شوێنە پیسبووەکانە بەو خوێنە و،

پێویستی بە کەفارەت و ڕەزامەندی و لێخۆشبوونی مەلا و شێخ و پیاوی دینەکە نییە. وە خوێنی نەزیفیش تەنها دەستنوێژ ئەشکێنێت و هیچ کەفارەت و لێخۆشبوونی ناوێت ﴿ قُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، إنِّي امْرَأَةٌ أشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي فأنْقُضُهُ لِغُسْلِ الجَنَابَةِ؟ قالَ: لَا. إنَّما يَكْفِيكِ أنْ تَحْثِي علَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ المَاءَ فَتَطْهُرِينَ (صحيح مسلم - ٣٣٠) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من ئافرەتێکم قژم ئەبەستم و بۆ غوسڵی لەشگرانی ئەیکەمەوە. وتی: نەخێر، تەنها ئەوەندەت بەسە کە سێ مشت ئاو بکەیت بە سەرتدا پاشان ئاو بە خۆتدا ئەکەیت وە پاکئەبیتەوە ﴾، ﴿ فقالَتْ: إحْدانا يُصِيبُ ثَوْبَها مِن دَمِ الحَيْضَةِ، كيفَ تَصْنَعُ بهِ؟ قالَ: تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بالماءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ (صحيح مسلم - ٢٩١) ئافرەتێك وتی: یەکێکمان خوێنی حەیز بەر جلی ئەکەوێت، چی لێبکات؟ وتی: ئەیپریوێنێت پاشان بە ئاو ئەیشوات پاشان ئاوی پیا ئەپرژێنێت، پاشان نوێژی تیا ئەکات ﴾، ﴿ يا رَسولَ اللَّهِ، إنِّي لا أطْهُرُ أفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ فَقالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: إنَّما ذَلِكِ عِرْقٌ وليسَ بالحَيْضَةِ، فَإِذَا أقْبَلَتِ الحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا، فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وصَلِّي (صحيح البخاري - ٣٠٦) ئەی پێغەمبەری خوا من پاکنابمەوە لە

خوێن ئایا واز لە نوێژ بهێنم؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئەوە برینە و حەیز نییە، جا کە حەیزەکە هات ئەوا واز لە نوێژ بهێنە، جا کە ماوەکەی تەواو بوو خوێنەکە لە خۆت بشۆ و نوێژ بکە .

+ ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ (النور - ٣١) وە بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ چاویان نزم بکەن وە داوێنیان بپارێزن وە جوانییەکانیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی دەرکەوتووە لە جل، وە با لەچکەکانیان بەربەنەوە بەسەر سنگیاندا وە با جوانییەکانیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردەکانیان یان باوکیان یان باوکی مێردەکانیان یان کوڕەکانیان یان کوڕی مێردەکانیان یان براکانیان یان کوڕی براکانیان یان کوڕی خوشکەکانیان یان ئافرەتەکانیان یان کەنیزەکانیان یان خزمەتکارەکان کە ئارەزووی ئافرەت ناکەن لە پیاوان یان ئەو منداڵانەی هێشتا عەورەتی ئافرەت نابینن، وە با پێیەکانیان نەدەن بە زەویدا تا بزانرێت چی ئەشارنەوە

لە جوانییەکانیان، وە هەمووتان تۆبەی خوا بکەن ئەی ئیمانداران بەڵکو سەرفراز بن ﴾.

+ ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ (الأحزاب - ٣٣) وە لە ماڵەکانتانا جێگیر بن ئافرەتان وە خۆتان مەڕازێننەوە خۆ ڕازاندنەوەی نەفامی یەکەمجار ﴾.

+ ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (٢٦) يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ (٢٧) وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٢٨) (الأعراف) ئەی نەوەی ئادەم جلمان بۆ دابەزاندوون عەورەتتان ئەشارێتەوە و ڕازاوەییە، وە جلی تەقوا باشترینە، ئەوە لە نیشانەکانی خوایە بەڵکو یادبکەنەوە (٢٦) ئەی نەوەی ئادەم شەیتان فێڵتان لێ نەکات وەك چۆن باوك و دایکتانی لە بەهەشت دەرکرد پۆشاکی لەبەریان داکەند بۆئەوەی عەورەتی یەکیان نیشان بدات، ئەو ئەتانبینێت خۆی و پۆلەکەی بە شێوەیەك کە ئێوە نایانبینن، ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە دۆستی ئەوانەی ئیمان ناهێنن (٢٧) وە گەر بەدڕەوشتییەکیان بکردایە

ئەیانوت باو و باپیرانمان لەسەریان بینیوە و خوا فەرمانی پێمان کردووە، بلّێ خوا فەرمان ناکات بە بەدڕەوشتی، ئایا شتێك لەسەر خوا ئەلّێن کە نایزانن (٢٨) ﴾.

+ ﴿ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا (١١٧) لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا (١١٨) وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا (١١٩) يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا (١٢٠) (النساء) ئەوانەی هاواریان ئەکەن غەیری خوا ناوی مێینەن، وە هاواری هیچ ناکەن غەیری شەیتانێکی هەلّگەڕاوە (١١٧) خوا بە لەعنەتی کردووە، وە وتی لە عەبدەکانت بەشێك گومڕا ئەکەم (١١٨) وە سەریان لێ ئەشێوێنم وە ئاواتیان ئەدەمێ وە فەرمانیان پێ ئەکەم جا گوێی ئاژەلّەکان ئەبڕن وە فەرمانیان پێ ئەکەم جا دروستکراوی خوا ئەگۆڕن، وە هەرکەس شەیتان بکات بە پشتیوان بەبێ خوا ئەوا دۆڕاوە دۆڕانێکی ئاشکرا (١١٩) پەیمانیان ئەداتێ و هیوایان ئەداتێ، وە غەیری بەتالّ هیچ بەلّێنێکیان ناداتێ (١٢٠) ﴾.

- ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز فەرمان بە ئافرەت ئەکەن کە خۆی داپۆشێت، وە لەشی خۆی دەرنەخات وەك سەردەمی نەفامی. وە خۆ ڕووتکردنەوە ویستی شەیتانە. وە هەروەها گۆڕینی دروستکراوەکانی خوای گەورەش کاری شەیتانە. وە سزای ئافرەت گەر سەری دانەپۆشێت سەرتاشین و شێواندنی شێوەی نییە وەك لە کتێبدایە. وە شێواندن و گۆڕینی دروستکراوی خوای گەورە مردوو و زیندوویان حەرامە ﴿ كانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ إذَا أَمَّرَ أَمِيرًا علَى جَيْشٍ، أَوْ سَرِيَّةٍ، أَوْصَاهُ في خَاصَّتِهِ بتَقْوَى اللهِ، وَمَن معهُ مِنَ المُسْلِمِينَ خَيْرًا، ثُمَّ قالَ: اغْزُوا باسْمِ اللهِ في سَبيلِ اللهِ، قَاتِلُوا مَن كَفَرَ باللَّهِ، اغْزُوا وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تَمْثُلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا (صحيح مسلم - ١٧٣١) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەر ئەمیرێکی دانایە لەسەر سوپایەك یان تاقمێك ئامۆژگاری ئەکرد بە تایبەتی کە تەقوای خوا بکات وە ئامۆژگاری باشی ئەو موسوڵمانانەشی ئەکرد لەگەڵیدا بوون، پاشان ئەیوت: بە ناوی خواوە غەزا بکەن لەپێناو خوادا، شەڕی ئەوە بکەن کە کوفری بە خوا کردووە، غەزا بکەن و زیادەڕەوی مەکەن وە غەدر مەکەن وە جەستە مەشێوێنن وە ساوا مەکوژن ﴾.

+ ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ (المجادلة - ١) خوا بە دڵنیایی قسەی ئەو ئافرەتەی بیست کە مشتومڕ ئەکات لە مێردەکەیدا و گازندەی هێناوەتە لای خوا، وە خوا گفتوگۆکەتان ئەبیستێت، بەدڵنیایی خوا بیسەر و بینەرە ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ (المتحنة - ١٠) ئەی ئیمانداران گەر ئافرەتە ئیماندارەکان هاتنە لاتان کۆچیان کردبوو ئەوا تاقییان بکەنەوە، خوا زاناترە بە ئیمانیان، جا گەر زانیتان کە ئیماندارن ئەوا مەیانگێڕنەوە بۆ کافران ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (المتحنة - ١٢) ئەی پێغەمبەر گەر ئافرەتانی ئیماندار هاتنە لات بەیعەتت بدەنێ لەسەر ئەوەی کە هیچ هاوەڵێك دانەنێن بۆ خوا وە دزی نەکەن وە داوێنپیسی نەکەن وە منداڵەکانیان نەکوژن وە بوهتانیش نەکەن لەناو دەست و قاچیاندا وە لە چاکەدا سەرپێچیت نەکەن،

ئەوا بەیعەتیان لێ وەربگرە وە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لە خوا، بەدڵنیایی خوا لێبووردە و بەرەحمە ﴾.

+ ﴿ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا (مريم - ٢٦) جا بخۆ و بخۆرەوە و چاوڕۆشنبە پێی، جا گەر بەشەرێکت بینی بڵێ من نەزرم بۆ خوا کردووە بەڕۆژووم لە قسەکردن جا قسە لەگەڵ هیچ ئینسانێك ناکەم ﴾.

+ ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ (٧١) قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ (٧٢) قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ (٧٣) (هود) وە ژنەکەی ئیبراهیم بەپێوە بوو جا پێکەنی وە موژدەمان پێدا بە ئیسحاق وە لە دوای ئیسحاق یەعقوب (٧١) وتی هاوار بۆ خۆم ئایا مناڵم ئەبێت وە من پیرم و ئەوەش مێردەکەمە پیرە، ئەوە شتێکی سەیرە (٧٢) وتیان ئایا لە ئیشی خوا سەرت سوڕئەمێنێ، رەحمەتی خوا و بەرەکەتی لەسەرتان ئەی خانەوادەی پێغەمبەرایەتی، خوا سوپاسکراو و بەرزە (٧٣) ﴾.

+ ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدۡيَنَ وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ

ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ (القصص - ٢٣) وە کاتێك موسا هاتە لای ئاوی مەدیەن کۆمەڵە خەڵکێکی بینی ئاوی ئاژەڵەکانیان ئەدا، وە جیا لەوان دوو ئافرەتی بینی ڕێیان لە ئاژەڵەکانیان ئەگرت، وتی ئەوە چیتانە، وتیان ئاوی ئاژەڵەکانمان نادەین تا شوانەکان ئەڕۆن، وە باوکمان پیرێکی بەساڵاچووە ﴾.

- لەم ئایەتە پیرۆزانەوە فێرئەبین کە ئاساییە ئافرەت بەگوێرەی پێویست و زەرورەت لە مەجلیس و ناو خەڵکا قسە بکات، وە پرسیار بکات و شت فێربێت. وە مەرج نییە تەنها لە مێردەکەی بپرسێت. وە چەندین جار ئافرەتان هاتوونەتە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئەویش سەردانی کردوون، وە پرسیاریان لێی کردووە و ئەویش وەڵامی داونەتەوە ﴿ قالتِ النِّسَاءُ للنبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ، فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمًا مِن نَفْسِكَ، فَوَعَدَهُنَّ يَوْمًا لَقِيَهُنَّ فِيهِ، فَوَعَظَهُنَّ وأَمَرَهُنَّ، فَكانَ فِيما قَالَ لهنَّ: ما مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ ثَلَاثَةً مِن ولَدِهَا، إلَّا كانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ فَقالتِ امْرَأَةٌ: واثْنَتَيْنِ؟ فَقَالَ: واثْنَتَيْنِ (صحيح البخاري - ١٠١) ئافرەتان بە پێغەمبەری خوایان وت صلی الله علیه وسلم: پیاوان بەسەرماندا زاڵ بوون لە بینینتدا، جا ڕۆژێکمان بۆ دابنێ بتبینین. جا مەوعیدی ڕۆژێکی دانێ و تیایا بینینی، جا ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێیان کرد، وە لەوەی پێیانی

وت: هیچ ئافرەتێك لە ئێوە نییە سێ منداڵی بمرێت ئیللا ئەبێت بە پۆشەری لە ئاگر. جا ئافرەتێك وتی: ئەی دوو منداڵ؟ وتی: دوو منداڵیش ». ﴿ كُنْتُ في المَسْجِدِ، فَرَأَيْتُ النبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فَقَالَ: تَصَدَّقْنَ ولو مِن حُلِيِّكُنَّ. وكَانَتْ زَيْنَبُ تُنْفِقُ علَى عبدِ اللهِ وأَيْتَامٍ في حَجْرِهَا، قَالَ: فَقَالَتْ لِعَبْدِ اللهِ: سَلْ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: أَيَجْزِي عَنِّي أنْ أُنْفِقَ عَلَيْكَ وعلَى أيْتَامٍ في حَجْرِي مِنَ الصَّدَقَةِ؟ فَقَالَ: سَلِي أنْتِ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَانْطَلَقْتُ إلى النبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَوَجَدْتُ امْرَأَةً مِنَ الأنْصَارِ علَى البَابِ، حَاجَتُهَا مِثْلُ حَاجَتِي، فَمَرَّ عَلَيْنَا بلَالٌ، فَقُلْنَا: سَلِ النبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: أَيَجْزِي عَنِّي أنْ أُنْفِقَ علَى زَوْجِي وأَيْتَامٍ لي في حَجْرِي؟ وقُلْنَا: لا تُخْبِرْ بنَا، فَدَخَلَ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: مَن هُمَا؟ قَالَ: زَيْنَبُ، قَالَ: أيُّ الزَّيَانِبِ؟ قَالَ: امْرَأَةُ عبدِ اللَّهِ، قَالَ: نَعَمْ، لَهَا أجْرَانِ: أجْرُ القَرَابَةِ، وأَجْرُ الصَّدَقَةِ (صحيح البخاري - ١٤٦٦) لە مزگەوت بووم پێغەمبەری خوام بینی صلى الله عليه وسلم وتی: ئافرەتەکان ببەخشن لە ماڵ ئەگەرچی لە خشڵەکانیشتان بێت. وە زەینەب نەفەقەی عەبدوڵای مێردی و چەند هەتیوێکی ئەکێشا لەلای خۆی بوون، جا بە عەبدوڵای وت: لە پێغەمبەری خوا بپرسە صلى الله عليه وسلم: ئایا بۆم بەسە کە

نەفەقەی تۆ و چەند هەتیویێك بکەم کە لەلامن لە خێرکردن؟ وتی: تۆ لێی بپرسە. جا دەرچووم بۆ لای پێغەمبەر و ئافرەتێکی ئەنصارم بینی لای دەرگاکەی بوو هەمان ئیشی منی هەبوو، جا بیلال بەلاماندا ڕۆشت و پێمان وت: لە پێغەمبەری خوا بپرسە صلی الله علیه وسلم: ئایا ئەوە بۆم بەسە کە لە مێرد و چەند هەتیوێکدا ببەخشم کە لەلامن وەك لەوەی خێر بکەم؟ وە وتمان: ئاشکرامان مەکە. جا چووە ژوورەوە و پرسیاری کرد، پێغەمبەریش وتی: ئەو دووانە کێن؟ وتی: زەینەب. وتی: کام زەینەب؟ وتی: ژنەکەی عەبدولاّ. وتی: بەڵێ دوو جار خێری ئەگات، خێری نزیکایەتی و خێری بەخشین ﴾، ﴿ أنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ قالَتْ: يا رَسولَ اللَّهِ، إنَّ اللَّهَ لا يَسْتَحِي مِنَ الحَقِّ، هلْ علَى المَرْأَةِ غُسْلٌ إذَا احْتَلَمَتْ؟ قالَ: نَعَمْ، إذَا رَأَتِ المَاءَ. فَضَحِكَتْ أُمُّ سَلَمَةَ، فَقالَتْ: أتَحْتَلِمُ المَرْأَةُ؟ فَقالَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: فَبِمَ شَبَهُ الوَلَدِ (صحيح البخاري - ٦٠٩١) دایکی سولەیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوا شەرم لە حەق ناکات، ئایا ئافرەت غوسڵی لەسەرە گەر لە خەویدا ڕەحەت ببێت؟ وتی: بەڵێ، گەر هەستا و ئاوی بینی. جا دایکی سولەیم پێکەنی و وتی: بۆ ئافرەت ئاوی لێ دێت؟ جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی بەچی منالّەکەی لەو

ئەچێت؟ ﴾، ﴿ مَرَّ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ بامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقالَ: اتَّقِي اللَّهَ واصْبِرِي قالَتْ: إلَيْكَ عَنِّي، فإنَّكَ لَمْ تُصَبْ بمُصِيبَتِي، ولَمْ تَعْرِفْهُ، فقِيلَ لَهَا: إنَّه النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فأتَتْ بَابَ النبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدَهُ بَوَّابِينَ، فَقالَتْ: لَمْ أعْرِفْكَ، فَقالَ: إنَّما الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى (صحيح البخاري - ١٢٨٣) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەسەر ئافرەتێکدا ڕۆشت لەلای قەبرێکدا ئەگریا، جا وتی: تەقوای خوا بکە و سەبر بگرە. وتی: وازم لێبێنە، تۆ ئەوەت بەسەر نەهاتووە کە تووشی من بووە و نازانی چۆنە. جا پێی وترا: ئەوە پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم. جا هاتە بەر دەرگای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و دەرگاوانی نەبینی لەوێ، جا وتی: نەمناسیت. جا وتی: سەبرگرتن لە یەکەم خورپەدایە ﴾، ﴿ أنَّ هِنْدَ بنْتَ عُتْبَةَ، قالَتْ: يا رَسولَ اللَّهِ إنَّ أبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ وليسَ يُعْطِينِي ما يَكْفِينِي ووَلَدِي، إلَّا ما أخَذْتُ منه وهو لا يَعْلَمُ، فَقالَ: خُذِي ما يَكْفِيكِ ووَلَدَكِ، بالمَعروفِ (صحيح البخاري - ٥٣٦٤) هیندی کچی عوتبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکی سوفیان پیاوێکی زۆر بەخیلە وە پێویستی خۆم و منداڵەکەمم ناداتێ، مەگەر ئەوەی کە لێی ئەبەم و پێی نازانێت. جا وتی: هێندەی

پێویستی خۆت و منداڵەکەت ببە بەگوێرەی عورف ﴾، ﴿ قُلتُ: يا رَسولَ اللّهِ، إنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي فأنْقُضُهُ لِغُسْلِ الجَنابَةِ؟ قالَ: لا. إنَّما يَكْفِيكِ أنْ تَحْثِي علَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ المَاءَ فَتَطْهُرِينَ (صحيح مسلم - ٣٣٠) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من ئافرەتێکم قژم ئەبەستم و بۆ غوسڵی لەشگرانی ئەیکەمەوە. وتی: نەخێر، تەنها ئەوەندەت بەسە کە سێ مشت ئاو بکەیت بە سەرتدا پاشان ئاو بە خۆتدا ئەکەیت وە پاکئەبیتەوە ﴾، ﴿ فقالَتْ: إحْدانا يُصِيبُ ثَوْبَها مِن دَمِ الحَيْضَةِ، كيفَ تَصْنَعُ بهِ؟ قالَ: تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بالماءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ (صحيح مسلم - ٢٩١) ئافرەتێك وتی: یەکێکمان خوێنی حەیز بەر جلی ئەکەوێت، چی لێبکات؟ وتی: ئەیپریوێنێت پاشان بە ئاو ئەیشوات پاشان ئاوی پیا ئەپرژێنێت، پاشان نوێژی تیا ئەکات ﴾، ﴿ فَخَرَجْنَا معهُ، حتَّى أَتَيْنَا ذَا الحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بنَ أَبِي بَكْرٍ، فأرْسَلَتْ إلى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: كيفَ أَصْنَعُ؟ قالَ: اغْتَسِلِي، وَاسْتَثْفِرِي بثَوْبٍ وَأَحْرِمِي (صحيح مسلم - ١٢١٨) لەگەڵ پێغەمبەر دەرچووین و کە هاتینە ذەلحولەیفە ئەسمائی کچی عومەیس محمدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، جا ناردی بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە: چی

بکەم؟ وتی: غوسڵ دەربکە، وە خۆت بپێچە بە جلێك و ئیحرام بکە ﴾، ﴿ يا رَسولَ اللَّهِ، إنِّي لا أطْهُرُ أفَأَدَعُ الصَّلَاةَ، فَقالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللّهُ عليه وسلَّمَ: إنَّما ذَلِكِ عِرْقٌ وليسَ بالحَيْضَةِ، فَإِذَا أقْبَلَتِ الحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا، فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وصَلِّي (صحيح البخاري - ٣٠٦) ئەی پێغەمبەری خوا من پاکنابمەوە لە خوێن ئایا واز لە نوێژ بهێنم؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئەوە برینە و حەیز نییە، جا کە حەیزەکە هات ئەوا واز لە نوێژ بهێنە، جا کە ماوەکەی تەواو بوو خوێنەکە لە خۆت بشۆ و نوێژ بکە ﴾.

+ ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ (النساء - ٣) ئەوا مارەی بکەن لەو ئافرەتانەی بەدڵتانن دووان وە سیان وە چوار، جا گەر ترسان دادپەروەر نەبن ئەوا یەك دانە یان کەنیزەکەکانتان ﴾.

+ ﴿ وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ (النساء - ٢٥) وە هەرکەس لە ئێوە نەیتوانی لەبەر پارە داوێنپاکی باوەڕدار بهێنێت ئەوا با لە کەنیزە ئیماندارەکان بهێنێت، وە خوا زاناترە بە ئیمانتان هەمووتان لە

پشتی یەکن، جا بە ئیزنی خاوەنەکانیان بیانهێنن، وە بەپێی عورف مارەییان بدەنێ ﴾.

+ ﴿ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا (البقرة - ٢٣٥) خوا زانی کە باسیانئەکەن، بەڵام بە نهێنی ئەوەی دڵتانیان پێ مەڵێن مەگەر قسەیەکی باش بکەن ﴾.

+ ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ (البقرة - ٢٢٩) تەڵاق دوو جارە جا یان خێزانەکەی بێنێتەوە یان بە چاکە وازی لێبێنێت ﴾.

+ ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا (الإسراء - ٣٢) وە نزیك داوێنپیسی مەکەونەوە ئەوە بێزراوە و ڕێیەکی خراپە ﴾.

+ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ (النور - ١٩) ئەوانەی حەزئەکەن داوێنپیسی بڵاو ببێتەوە لەناو ئیمانداراندا سزایەکی بەئێشیان هەیە لە دنیا و ئاخیرەتدا ﴾.

+ ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (المائدة - ٣٣) پاداشتی ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەکەن و لە زەویدا خراپە ئەنێنەوە ئەوەیە بکوژرێن یان لە خاچ بدرێن یان دەست و قاچیان

ڕاست و چەپ ببڕدرێت یان لە زەویدا دەربکرێن، ئەوە بۆیان سەرشۆڕییە لە دنیادا وە لە ئاخیرەتدا سزایەکی زۆر گەورەیان هەیە ﴾.

+ ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (النور - ٢) داوێنپیسی مێ و نێر هەریەکەیان جەلد بکەن سەد قامچی، وە لە دینی خوادا بەزەییتان پیایانا نەیەتەوە، گەر ئیمانتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، وە با سزاکەیان کۆمەڵێك لە ئیمانداران ببینێت ﴾.

+ ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ (الأعراف - ٢٨) وە گەر بەدڕەوشتییەکیان بکردایە ئەیانوت باو و باپیرانمان لەسەریان بینیوە و خوا فەرمانی پێمان کردووە، بڵێ خوا فەرمان ناکات بە بەدڕەوشتی، ئایا شتێك لەسەر خوا ئەڵێن کە نایزانن ﴾.

● دەقەکانی قورئانی پیرۆز پێمان ئەڵێن کە ڕێی شەرعی هەیە بۆ زەواج. جیاواز لە کتێب کە لەبەرئەوەی ڕێی دروست نییە بۆیە شوێنکەوتووەکانی بەلای فراندن و زەواجی بەزۆردا ئەچن. وە لە ئیسلامدا ئافرەت قیمەتی هەیە و شتێك نییە کەی ویستت دانەیەك

ببەیت و بیفڕێنیت و کەی نەتویست فڕێی بدەیت. بەڵکو گەر ئافرەتێکت ویست ئەچیتە داوای، وە گەر پێکەوە نەگونجان تەڵاق هەیە. وە لە قورئانی پیرۆزدا قسەکردنیش بەتەنیا و بێ ئاگاداری کەسوکاری ئافرەتەکە حەرامە چجا ڕفاندن و هەڵگرتنی. وە فڕاندن تاوانێکی گەورەیە و سزایەکی توندی هەیە چونکە خراپەکردنە لەسەر زەویدا (إفساد) وە نەهێشتنی ئەمانە لەناو خەڵکدا. وە زیناکردن تاوانێکی گەورەیە و سزاکەشی توندە.

دووەم/ پێگەی ئافرەت لە بەرامبەر پیاودا.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– فوصل أبيملك إلى البرج فهاجمه، وتقدم إلى باب البرج ليحرقه بالنار (٥٢) فألقت امرأة رحى طاحون على رأس أبيملك، فحطمت جمجمته (٥٣) فدعا لساعته بالفتى حامل سلاحه وقال له: ((استل سيفك واقتلني، لئلا يقال عني: إن امرأة قتلته)). فطعنه الفتى فمات (٥٤) (القضاة / ٩) جا ئەبیمەلیك گەیشتە قوللەکە و هێرشی کردە سەری، وە چووە پێشەوە بۆ دەرگای قوللەکە تا بیسوتێنێت بە ئاگر (٥٢) جا ژنێك بەرداشی ساوەری

فڕێدا بەسەر سەری ئەبیمەلیکدا، جا کەللەی سەری شکاند (٥٣) جا زوو بانگی کوڕەکەی کرد کە چەکەکەی هەڵگرتبوو وە پێی وت: (شمشێرەکە دەرکە و بمکوژە، تا پێم نەوترێت: ئافرەتێك کوشتی). جا کوڕەکە شمشێرەکەی پیاکرد و مرد (٥٤).

– وكان ان الملك داود شاخ وطعن في السن، وكانوا يغطونه بالثياب فلا يدفأ (١) فقال له خدمه: (( ليبحث لسيدنا الملك عن فتاة عذراء تقوم أمام الملك، فتعنى به وتضجع في حضنك، فيدفأ سيدنا الملك )) (٢) فبحثوا عن فتاة جميلة في جميع أراضي إسرائيل، فوجدوا أبيشاج الشونمية، فاتوا بها الملك (٣) وكانت الفتاة جميلة جدا، فكانت تعنى بالملك وتخدمه، ولكن الملك لم يعرفها (٤) (الملوك الأول / ١) وە داودی پاشا پیربوو وە تەمەنی زۆربوو، وە بە جل دایانئەپۆشی و گەرم نەئەبووەوە (١) جا خزمەتکارەکانی پێیان وت: (با بۆ پاشامان بگەڕێین بۆ کچێکی عازەب لەبەردەم پاشا دانیشێت، جا خزمەتی بکات و لە باوەشت پاڵبکەوێت، ئەوکات پاشای سەرۆکمان گەرمی ئەبێتەوە) (٢) جا بەدوای کچێکی جواندا گەڕان لە هەموو زەوی ئیسرائیلدا، جا ئەبیشاجی شونێمیان دۆزییەوە، وە هێنایان بۆ پاشا (٣) وە کچەکە زۆر جوان بوو جا خزمەتی پاشای ئەکرد و گرنگی ئەدا پێی، بەڵام پاشا لەگەڵی جووت نەبوو (٤).

– فلما طابت أنفسهم، إذا رجال المدينة، قوم لا خير فيهم، قد أحاطوا بالبيت وأخذوا يقرعون الباب، وقالوا للشيخ صاحب البيت: ((أخرج الرجل الذي دخل بيتك لنعرفه )) (٢٢) فخرج إليهم الرجل صاحب البيت وقال لهم: ((أسألكم، يا إخوتي، ألا تفعلوا شرا، بعدما دخل هذا الرجل بيتي، لا تفعلوا هذه الفاحشة (٢٣) هذه ابنتي العذراء وسريته أخرجهما إليكم، فاغتصبوهما واصنعوا بهما ما حسن في أعينكم، ولا تصنعوا بهذا الرجل هذا الأمر الفاحش)) (٢٤) (القضاة / ١٩) جا کاتێك نەفسیان ئیسراحەتی کرد، پیاوانی شارەکە کەسانێك کە خێریان تیا نەبوو چواردەوری ماڵەکەیان دا و لە دەرگاکەیان دا، وە بە پیاوە پیرەکەی خاوەن ماڵەکەیان وت: (ئەو پیاوە دەرکە کە هاتووەتە ماڵەکەتەوە با لەگەڵی جووت بین) (٢٢) جا پیاوی خاوەن ماڵەکە چووە دەرەوە بۆ لایان و پێی وتن: (داواتان لێئەکەم براکانم کە خراپە نەکەن دوای ئەوەی ئەم پیاوە هاتووەتە ماڵەکەمەوە، ئەم بەدڕەوشتییە مەکەن (٢٣) ئەمە کچەکەمە شووی نەکردووە و کەنیزەی پیاوەکە بۆتان دەرئەهێنم، لاقەیان بکەن و چیتان پێ باش بوو لێیان بکەن، وە بەم پیاوە ئەو کارە پیسە مەکەن) (٢٤) .

– فليس الرجل من المرأة، بل المرأة من الرجل (٨) ولم يخلق الرجل من أجل المرأة، بل خلقت المرأة من أجل الرجل (٩) (كورنثوس الأول / ١١) جا پیاو

لە ئافرەتەوە نییە، بەڵکو ئافرەت لە پیاوەوەیە (٨) وە پیاو بۆ ئافرەت دروستنەکراوە بەڵکو ئافرەت بۆ پیاو دروستکراوە (٩).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا (الإسراء - ٧٠) وە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم ناوە، وە هەڵمانگرتوون لە وشکانی و دەریا وە رزقماندا‌ون لە پاکەکان، وە فەزڵمانداون بەسەر زۆرێك لەوانەدا کە دروستمانکردوون ﴾.
+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ (الحجرات - ١٣) ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە، وە کردوومانن بە گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خوا بەتەقواترینتانە، بێگومان خوا زۆر زانا و شارەزایە ﴾.
+ ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (الروم - ٢١) وە لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان خێزانی بۆ دروستکردوون تا

بحەسێنەوە لەلایانا، وە لە نێوانتانا حۆشەویستی و سۆزی داناوە، ئـا لـەوەدا نیشانە هەیە بۆ قەومێك بیربکەنەوە ﴾.

+ ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَا (الأعـراف - ١٨٩) ئـەوە خوایـە دروسـتیکردوون لـە یـەك نـەفس وە لـەو خێزانەکەی دروستکردووە تا ئارام بێت لەلای ﴾.

+ ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا (النسـاء - ١٢٤) وە هەرکـەس کـاری چاك بکات لە نێر یان مێ وە ئیماندار بێت ئائەوانـە ئەچـنە بەهەشـتەوە وە هێندەی پەردەی ناوکە خورمایەك ستەمیان لێ ناکرێت ﴾.

+ ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ (٥٨) يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ (٥٩) (النحل) وە گـەر یـەکێکیان مـژدەی پێبـدرێت بەوەی مێینەیەکی بووە ڕووی ڕەش ئـەبێت هـەموو ڕۆژەکـە وە خەفـەتبارە (٥٨) خۆی ئەشارێتەوە لە خەڵکەکە لە خراپـی ئـەوەی پێـی وتـراوە، ئایـا بیهێڵێتەوە بە سەرشۆڕی یـان لـە خۆڵـدا بیشـارێتەوە، بەڕاسـتی خـراپترین بڕیاریان داوە (٥٩) ﴾.

لە کتێبدا ئافرەت لەخوار پیاوەوەیە، وە سەرشۆڕییە بۆ پیاو ئافرەت بیکوژێت. وە ئافرەت خزمەتکاری پیاوە با پیاوەکە نامەحرەمیش بێت. وە وەك کەلوپەل و دەرمان و دیاریی مامەڵە ئەکرێت نەك وەك مرۆڤ. وە ئاساییە لە تۆڵەی پیاودا بدرێت نەك تەنها بە مارەکردن بەڵکو بە تەعەدا و لاقەکردنیش. بەڵام ئافرەت لە قورئانی بەڕێزدا ڕێزدارە. وە ئەوە نەفامەکانن کە سەرشۆڕن بە ئافرەتەکانیان و زیندەبەچاڵیان ئەکەن. وە لە ئیسلامدا ئەسڵ ئەوەیە نێر و مێ خوشك و برای یەکن. وە واجبە پیاو لەگەڵ خێزانیدا باش بێت. وە لەگەڵ ئەمانەشدا نێر و مێ جیاوازن و وەك یەك نین لەڕووی ئەرك و مافەوە، بە دادپەروەری مامەڵەیان ئەکرێت نەك یەکسانی ﴿ إنَّما النِّساءُ شقائقُ الرِّجالِ (صحيح أبي داود - ٢٣٦) ئافرەتان خوشکی پیاوانن ﴾، ﴿ خيرُكم خيرُكم لأهلِه وأنا خيرُكم لأهلِي (صحيح ابن ماجه - ١٦٢١) باشترینتان باشترینتانە بۆ خێزانەکەی، وە من باشترینتانم بۆ خێزانەکەم ﴾، ﴿ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰ (آل عمران - ٣٦) وە نێر وەك مێ نییە ﴾، ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ (النساء - ٣٤) پیاوان دەسەڵاتدارن بەسەر ئافرەتانەوە بەوەی خوا فەزڵی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکیاندا وە بەوەی کە ئەیبەخشن لە سامانیان ﴾، ﴿ عن عمر: كُنَّا في الجاهِلِيَّةِ لا نَعُدُّ النِّساءَ شيئًا، فَلَمَّا جاءَ الإسْلامُ وذَكَرَهُنَّ اللَّهُ، رَأَيْنا لهنَّ بذلكَ علينا حَقًّا، مِن غيرِ أنْ نُدْخِلَهُنَّ في شيءٍ مِن أُمُورِنا (صحيح

البخاري - ٥٨٤٣) لە عومەری کوڕی خەطـابەوە: لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەتمان بە هیچ نەئەزانی، جا کاتێك ئیسلام هات و خوا باسی کردن، بـەوە بینیمـانن کـە مافیان بەسەرمانەوە هەیە، بەبێ ئەوەی بیانخەینە ناو هیچ شتێك لە کارەکانمانـەوە .

# بابەتی چوارەم

## دەقەکان دەربارەی بابەتی تر

یەکەم/ خۆکوشتن.

کتێبی جولەکە و گاورەکان:

– فوصل أبيملك إلى البرج فهاجمه، وتقدم إلى باب البرج ليحرقه بالنار (٥٢) فألقت امرأة رحى طاحون على رأس أبيملك، فحطمت جمجمته (٥٣) فدعا لساعته بالفتى حامل سلاحه وقال له: ((استل سيفك واقتلني، لئلا يقال عني: إن امرأة قتلته )). فطعنه الفتى فمات (٥٤) (القضاة / ٩) جا ئەبیمەلیك گەیشتە قوڵڵەکە و هێرشی کردە سەری، وە چووە پێشەوە بۆ دەرگای قوڵڵەکە تا بیسوتێنێت بە ئاگر (٥٢) جا ژنێك بەرداشی ساوەری فڕێدا بەسەر سەری ئەبیمەلیکدا، جا کەللەی سەری شکاند (٥٣) جا زوو بانگی کوڕەکەی کرد کە چەکەکەی هەڵگرتبوو وە پێی وت: (شمشێرەکە دەرکە و بمکوژە، تا پێم نەوترێت: ئافرەتێك کوشتی). جا کوڕەکە شمشێرەکەی پیاکرد و مرد (٥٤).

– فدعا شمشون الرب وقال: ((أيها السيد الرب، اذكرني وشددني هذه المرة أيضا، يا الله، لأنتقم لعيني من الفلسطينيين انتقاما واحدا )) (٢٨) ثم تلمس شمشون العمودين اللذين في الوسط، والقائم عليهما البيت. واتكأ عليهما، آخذا أحدهما بيمينه والآخر بشماله (٢٩) وقال: ((لتمت نفسي مع الفلسطينيين )). ودفع بشدة، فسقط البيت على الأقطاب وعلى كل الشعب الذي في البيت. فكان الموتى الذين قتلهم في موته أكثر من الذين قتلهم في حياته (٣٠) (القضاة / ١٦) جا شەمشون هاواری خوای کرد و وتی: (ئەی پەروەردگاری باڵادەست، یادم بکە وە ئەم جارەش بەهێزم بکە، ئەی خوا بۆئەوەی تۆڵەی چاوم بکەم لە فەلەستینییەکان یەك جار) (٢٨) پاشان شەمشون دوو کۆڵەکەکەی گرت کە لە ناوەڕاستدا بوون و پەرستگاکەی لەسەر وەستابوو. وە خۆی دا بەسەریاندا یەکێکی بە دەستی ڕاست گرتبوو ئەوی تر بە چەپ (٢٩) وە وتی: (با منیش لەگەڵ فەلەستینییەکاندا بمرم). وە بە توندی پاڵی نا، جا پەرستگاکە بەسەر لاکانیدا ڕما وە بەسەر هەموو خەڵکەکەی ناوی. جا ئەو کوژراوانەی کوشتنی لە مردنەکەیدا زۆرتر بوون لەوانەی لە ژیانیدا کوشتنی (٣٠).

– واشتد القتال على شاول، فأدركه الرماة بالقسي وأثخنوه بالجراح (٣) فقال شاول لحامل سلاحه: "استل سيفك واطعني به لئلا يأتي هؤلاء القلف

ويطعنوني ويشنعوا في ". فأبى حامل سلاحه، لأنه خاف خوفا شديدا. فأخذ شاول سيفه وسقط عليه (٤) ولما رأى حامل سلاحه أن قد مات شاول، سقط هو أيضا على سيفه ومات معه (٥) (صموئيل الأول / ٣١) وە شەڕ لەسەر شاول توند بوو، وە تیرهاوێژەکان گەشتنە سەری وە بە سەختی برینداریان کرد (٣) جا شاول بە چەکهەڵگرەکەیی وت: "شمشێرەکەت دەرکە و پیامدا بکە بۆئەوەی ئەو خەتەنەنەکراوانە نەیەن و بمکوژن و سوکایەتیم پێ بکەن". جا چەکهەڵگرەکەی ڕەتیکردەوە چونکە ترسێکی زۆر ترسا. جا شاول شمشێرەکەی برد و کەوت بەسەریدا (٤) وە کاتێك چەکهەڵگرەکەی بینی کە شاول مرد، ئەویش کەوت بەسەر شمشێرەکەیدا و مرد لەگەڵیدا (٥).

قورئانی پیرۆز:

+ ﴿ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا (٢٩) وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا (٣٠) (النساء) وە خۆتان مەکوژن، بێ گومان خوا بەرەحمە پێتان (٢٩) وە هەرکەس وا بکات بە دوژمنکاری و زوڵم ئەوا ئەیگەیەنین بە ئاگر، وە ئەوە لەسەر خوا ئاسانە (٣٠) ﴾.

+ ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ (البقرة - ١٩٥) وە لەپێناو خوادا ببەخشن وە بە دەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە وە چاکە بکەن، بەدڵنیایی خوا چاکەکارانی خۆشئەوێت ﴾.

لە دەقەکانی کتێبدا خۆکوشتن (انتحار) شتێکی ئاساییە، وە چەند جارێك دووبارە بووەتەوە و خواش سەرزەنشتی ئەوانەی نەکردووە کە وایانکردووە. بەڵام قورئانی پیرۆز حەرامی کردووە کە مرۆڤ خۆی بکوژێت. وە لە ئیسلامدا هەرکەس بەچی خۆی بکوژێت بەوە سزا ئەدرێت لە جەهەننەما ﴿ مَن تَرَدَّى مِن جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَهو في نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فيه خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَن تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَسُمُّهُ في يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ في نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَن قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، فَحَدِيدَتُهُ في يَدِهِ يَجَأُ بِهَا في بَطْنِهِ في نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا (صحيح البخاري - ٥٧٧٨) هەرکەس لە شاخێکەوە خۆی فڕێبدات و خۆی بکوژێت، ئەوا لە ئاگری جەهەننەمدایە بە نەمری تیایا فڕێئەدرێت، وە هەرکەس ژەهرێك بخوات و خۆی بکوژێت، ئەوا ژەهرەکە لە دەستیدایە ئەیخوات لە ئاگری جەهەننەمدا بە

نەمرى تيايدا، وه هەركەس بە ئاسنێك خۆى بكوژێت، ئەوا ئاسنەكە لە دەستيدايە سكى پىٚ كون ئەكات لە ئاگرى جەهەننەمدا بە نەمرى ﴾.

دووەم/ كىٚ ناچێتە بەهەشتەوە.

كتێبى جولەكە و گاورەكان:

– لا يدخل مرضوض الخصيتين ولا مجبوب في جماعة الرب (١) ولا يدخل نغل في جماعة الرب، ولو في الجيل العاشر فلا يدخل منه أحد في جماعة الرب (٢) (التثنية / ٢٣) گون پووكاوه و ئەندامى نێرينە بڕدراوه ناچنە كۆمەڵەى خواوه (١) وه زۆڵ ناچێنە ناو كۆمەڵەى خواوه، گەرچى لە نەوەى دەيەميشى بێت ئەوا هيچ كەسى ناچێتە كۆمەڵى خواوه (٢).

قورئانى پیرۆز:

+ ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا (١٢٣) وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا

(١٢٤) (النساء) چوونە بەهەشت بە هیوای ئێوە نییە وە بە هیوای خاوەنانی کتێب نییە، هەرکەس خراپە بکات پاداشت ئەدرێت پێی وە بەبێ خوا هیچ پشتیوان و سەرخەرێك نادۆزێتەوە (١٢٣) وە هەرکەس لە کاری چاکە بکات لە نێر یان مێ وە ئیماندار بێت ئائەوانە ئەچنە بەهەشتەوە وە هێندەی تویکڵی سەر ناوکە خورمایەك ستەمیان لێ ناکرێت (١٢٤) ﴾.

+ ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ (النحل - ٩٧) هەرکەس چاکە بکات لە نێر یان مێ وە ئیماندار بێت ئەوا ژیانێکی سەرکەوتوو ئەیژیێنین، وە پاداشتیان ئەدەینەوە بە چاکتر لەوەی ئەیانکرد ﴾.

+ ﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ (غافر - ٤٠) هەرکەس خراپەیەك بکات ئەوا تەنها بە هاوشێوەی پاداشت ئەدرێت، وە هەرکەس چاکە بکات لە نێر و مێ وە ئیماندار بێت ئائەوانە ئەچنە بەهەشتەوە بەبێ حساب رزقیان ئەدرێت ﴾.

+ ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (الأعراف - ٣٦) وە ئەوانەی ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە وە لووتبەرز بوون پێی ئائەوانە هاوەڵانی ئاگرن، ئەوان تیایا نەمرن ﴾.

+ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ (الأعراف - ٤٠) ئەوانەی ئایەتەکانمانیان بەدرۆخستەوە و لووتبەرز بوون پێیان دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە وە ناچنە بەهەشتەوە هەتا حوشتر ئەچێت بە کونی دەرزیدا، وە بەو جۆرە پاداشتی تاوانباران ئەدەین ﴾.

+ ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا (مريم - ٦٠) ئیللا ئەوەی تۆبەی کرد وە ئیمانی هێنا وە چاکەی کرد، جا ئەوانە ئەچنە بەهەشتەوە وە هیچ زوڵمیان لێناکرێت ﴾.

+ ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا (الفرقان - ٧٠) جگە لەوەی تۆبە بکات وە ئیمان بهێنێت وە کاری چاك بکات جا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ ئەگۆڕێت بە چاکە، وە خوا لێبووردە و بەرەحمە ﴾.

+ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ (الحجرات - ١٣) ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە، وە کردوومانن بە گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خوا بەتەقواترینتانە، بێگومان خوا زۆر زانا و شارەزایە ﴾.

بەپێی دەقەکانی کتێب بێت کەسانێك هەربەوەنەی لەشیان عەیبێکی تیایە یان باوانیان تاوانیان کردووە خوا لێیان تووڕەیە و ناچنە بەهەشتەوە، هەرچەندە باسی ئەوە نەکراوە تاوانیان کردبێت، نەك هەر خۆیان بەڵکو چەند نەوەیەکیشیان. بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا هەرکەس ئیمانی هەبێت و کرداری باشی هەبێت بەهەشتییە. وە هەرکەس کافربێت ناچێتە بەهەشتەوە. وە ئەوانەی تاوانبارن گەر تۆبە بکەن خوای گەورە لێیان ئەبورێت. وە ئەوەی لای خوای گەورە گرنگە ئیمان و کردارە نەوەك لەش و لار و شێوە ﴿ إنَّ اللَّهَ لا يَنْظُرُ إلى صُوَرِكُمْ وأَمْوالِكُمْ، ولَكِنْ يَنْظُرُ إلى قُلُوبِكُمْ وأَعْمالِكُمْ (صحيح مسلم - ٢٥٦٤) خوا سەیری شێوە و پارەتان ناکات، بەڵام سەیری دڵ و کردارتان ئەکات ﴾. وە لە ئیسلامدا کەس تاوانی باوانی هەڵناگرێت و لەسەری سزا نادرێت.

دوای ئەوەی دەقەکانی قورئانی پیرۆز و کتێبمان هێنا و خستماننە ڕوو وە قسەمان لەسەرکردن و بەراوردمان کردن بەیەکتر، ئێستا جوولەکە و گاورەکـان یـان غـەیری ئەوان ئەشێ چەند بابەتێك بوروژێنن و بیکەن بە پرسیار و شوبهە لێمان.

یەکەم/ زۆربەی ئەو دەقانەی هێناوتە لە کتێبەوە لە پەیمانی کۆنـەوەن، وە پـەیمانی نویێ دواتر هاتووە و دەقی لەو جۆرەی تیا نییە. جا گەر پەیمانی کـۆن بەڵگـە بێـت بەسەر جوولەکەوە ئیتر چۆن ئەیکەیت بە بەڵگە بەسەر گاورەکانەوە؟

وەڵام/

١. بۆ گاورەکـانیش پـەیمانی کـۆن بەڵگەیـە و ماڵـە بەسـەریانەوە، وە ئـەبێت باوەڕیان پێـی هـەبێت و دەقـەکانی جێبـەجێ بکـەن. چـونکە هـەر بـەپێی دەقەکانی خۆیان هەم مەسیح پێی وتوون کە ئەو نەهاتووە شـەریعەتی پـێش خۆی بسـڕێتەوە بـەڵکو هـاتووە تـەواوی بکـات، وە تەنانـەت یـەك پـیتی تـەوراتیش نافـەوتێت و هـەمووی دێتـە دی (متـی ٥/ ١٧، ١٨). وە هـەم پۆڵس و نوسەرانی پەیمانی نـویێ و زانـا گاورەکـان دەقـەکانی پـەیمانی کـۆن ئـەهێنن وەك بەڵگـەی سـەلماندنی بیروباوەڕیـان لەسـەر مەسـیحەکەیان

(کورنثوس الأولی ١/ ١٩). وە تا ئێستاش گاورەکان پێکەوە لەگەڵ پەیمانی نوێدا چاپیان ئەکەن و پێیان ئەڵێن کتێبی پیرۆز.

٢. گەر بڵێین پەیمانی کۆن بە هاتنی پەیمانی نوێ کاری پێناکرێت، ئەوا ئەپرسین: ئایا پەیمانی کۆن کاتێك کە کاری پێئەکرا قسەی خوا بوو؟ ئایا ئەوانەی تیایەتی حەق بوو یان بەتاڵ؟ وە ئایا خوای گەورە هەڵە ئەکات و قسەی بەتاڵ و زوڵم ئەکات؟

٣. گریمان پەیمانی کۆن بەڵگە نییە بەسەر گاورەکانەوە، ئەی چی بڵێین لەسەر ئەو دەقانەی کە لە پەیمانی نوێوە هێنامان؟ جا بە ڕەتکردنەوەی پەیمانی کۆن پەیمانی نوێ نابێت بە قسەی خوا و حەق، چونکە گەر یەك هەڵە یان یەك دژیەکی یان یەك دەستکاری لە هەر کتێبێکدا هەبێت ئەوا ئەو کتێبە هی خوای گەورە نییە (النساء - ٨٢).

دووەم/ دەقەکانی کتێب بەشێکیان بەڕووکەش وەرناگیرێن، بەڵکو واتای قووڵ لە پشتیانەوەیە و وەك ڕواڵەتەکەیان ناشرین نین. جا ئەبێت واتا قووڵەکانیان وەرگرین و مامەڵە لەگەڵ ڕواڵەتیان نەکەین.

وەلام/

١. گەر کتێبێك قسە و کەلامی خوای گـەورە بێـت ئـەوا لـە بنەڕەتـدا ئـەبێت دووربێت لە هەموو دەستەواژەیەکی ناشرین و کەموکورت و بـیٚ کـەلْك. وە ئەبێت لە بەرزترین ئاستی ڕەوانبێژی و زمانەوانی و دەربڕیندا بێت. نەك لـە قسە و چیرۆکی کەسی نەفام بچێت.

٢. گەر کتێب قسەی خوایە، ئایا خـوا وشـە و دەسـتەواژەی جـوانتر و ڕێکـتری دەستنەکەوت لەوانە دایانبەزێنێت بۆ مرۆڤایەتی؟ وە بۆچی لەبری واتا جوانە ڕاستەکە دەستەواژەی ناشرین و هەڵەی بەکارهێناوە؟

٣. ئەبێت کاتێك باسی واتای قووڵ یان دوور لە ڕووکەش بکەین لـە دەقەکانـدا کە دەقەکان ئەگەری واتای تر هەڵگرن. وە ئـەبێت هـەم بەڵگـەمان هـەبێت لەسەر بوونی واتای تر، هەم بەڵگەمان هەبێت بۆ دیاریکردنی واتاکـەی تـر. نەك لەخۆمانەوە بیٚ بەڵگە واتـا بـۆ دەقـەکان دانـێین دوور لـە واتـا ڕوون و ڕوواڵەتییەکە. وە کەسێك کە قسـە ئـەکات ئەسـڵ ئەوەیـە مەبەسـتی لـەو واتایەیە کە بەو وشانە دەریئەبڕێت، نەوەك مەبەستی شـتێك بێـت و وشـەی تری بۆ بەکارهێنابێت مەگەر بە بەڵگە.

سێیەم/ بۆچی دەقە باش و جوانەکانی کتێبت نەهێناوە و تەنها تەرکیزت لە خراپەکان کردووە؟ خۆ کتێبی جوولەکە و گاورەکان هەموو دەقەکانی خراپ و ناشرین نین.

وەڵام/

١. ئەم قسەیە دانپیانانە بەوەی کتێب دەقی خراپ و ناشرینی تیایە. وە گەر کتێبێك لەلای خواوە بێت هەمووی ئەبێت جوان و باش بێت، نەوەك باشەکەی ڕێژەیی بێت.

٢. ئێمە لە باسی سەلماندنی ئەوەداین کە کتێبی جوولەکە و گاورەکانی ئەمڕۆ بەردەستە کەلامی خوا نییە، نەوەك ئایا کتێب قسەی جوانی تیایە یان نا؟ جا بۆیە ئەو دەقانە ئەهێنین کە بانگەشەکەمان ئەسەلمێنن و پشتڕاستی ئەکەنەوە. وە دەقێك پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە نەبێت خۆمان و خوێنەری پێوە مەشغوڵ ناکەین.

چوارەم/ قورئان دەقە خراپەکانی لە کتێبەوە وەرنەگرتووە، بەڵام دەقە باشەکانی لێیانەوە وەرگرتووە.

وەڵام/

١. ئەم قسەیەش دانپیانانە بەوەی کتێب دەقی خراپ و ناشرینی تیایە.

٢. قورئانی پیرۆز زۆر دەقی تیایە کە لە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکدا نییە. وە زۆر وردەکاری تیایە کە نە کتێب و نە غەیری ئەو باسیان نەکردوون. وە پڕە لەو دەقانەی کە پێچەوانەی بیروباوەڕی سەردەمی دابەزینی بووە. جا لەناو ئەم هەموو دەقانەدا گەر بنەڕەتی باوەڕێك یان کەسێك یان چیرۆکێك لەنێوان قورئانی پیرۆز و کتێبدا هاوبەش بێت، ئەمە واتای ئەوە نییە قورئان لە کتێبەوە یان سەرچاوەی ترەوە ئەو شتەی وەرگرتووە. بەتایبەتی گەر لە وردەکارییەکاندا جیاوازی هەبوو، یان زانیاری زیاتر لە قورئاندا هاتبوو لەسەری. بەڵکو ئەوە بەڵگەی ئەوەیە قورئان لە سەرچاوەی ترەوە شتی وەرنەگرتووە وە سەربەخۆیە تیایان. بۆنموونە: قورئان و کتێب باسی خوای گەورە ئەکەن، بەڵام هەریەکە بەجۆرێکی جیاواز وەسفی ئەکەن. وە باسی چەند پێغەمبەرێك ئەکەن، بەڵام هەریەکە بەجۆرێکی تەواو جیاواز باسیان ئەکەن. وە ڕووداوی ئادەم و دارەکە باس ئەکەن، وە ئەمیشیان جیاواز باسکراوە. جا گەر قورئان ئەو بابەتانەی لە کتێبەوە وەرگرتایە ئەوا دەقاودەق وەك کتێب ئەیگێڕانەوە نەوەك جیاواز و وردتر.

٣. هەندێك دەقی كەم هەن لە كتێبدا كە خوای گـەورە دایبەزانـدوون بـۆ بـەنی ئیسرائیل و دەستكاری نەكراون. وە لە قورئاندا پشتڕاستی ئەوە هـاتووە كـە دەقی لەو جۆرە دابەزیوە بۆیان. وە ئەمە لێوەرگرتن نییە بەڵكو لەلایەكـەوە باسكردنی حەقیقەتێكە، لەلایەكی تریشەوە خـوای گـەورە دووبـارە هـەمان حوكمی بە عەرەبی لە قورئاندا دابەزاندووەتەوە. بۆنموونە: قیصـاص، سـزای داوێنپیسی.

٤. قورئانی پیرۆز باسی لەوە كردووە كە ئەهلی كیتـاب دەقـەكانی كتێبەكـەیان ئەشارنەوە (الأنعام - ٩١). جا گەر شتێك شاردراوە بێـت لـەكوێوە قورئـان لێیەوە وەرئەگرێت؟ وە گـەر جوولەكـە دەقـەكانیان لـە قەومەكـەی خۆیـان بشارنەوە چۆن غـەیری ئـەوان دەسـتیان ئەكـەوێت؟ بەتایبـەتی كـە زمـانی دەقەكانیان عیبری بووە نەك عەرەبی، وە عەرەب نەشارەزا بوون بـە عیـبری (صحيح البخاري - ٤٤٨٥).

٥. قورئانی پیرۆز باسی لـەوە كـردووە كـە كتێـب دەسـتكاریكراوە (النسـاء - ٤٦)، (البقرة - ٧٩). جا گەر قورئان لێیەوە شت وەرگرێت بۆچی بانگەشەی ئەوە ئەكات كە دەستكاریكراوە و دەستنوسی مرۆڤەكانـە؟ چـونكە هـەمان قسە بە قورئانیش ئەوترێت كە دەستكاریكراو و قسەی مرۆڤە.

پێنجەم/ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەفەرموێت ئەهلی کیتاب بەدرۆ مەخەنەوە. ئیتر چۆن تۆ دەق و هەواڵەکانیان بەدرۆئەخەیتەوە؟

وەڵام/

١. دەقی فەرموودەکە بەم شێوەیەیە: ﴿ كَانَ أَهْلُ الكِتَابِ يَقْرَؤُونَ التَّوْرَاةَ بالعِبْرَانِيَّةِ، ويُفَسِّرُونَهَا بالعَرَبِيَّةِ لأهْلِ الإسْلَامِ، فَقالَ رَسولُ اللَّهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: لا تُصَدِّقُوا أهْلَ الكِتَابِ ولا تُكَذِّبُوهُمْ، وقُولوا: {آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا} ﴿البقرة: ١٣٦﴾ الآيَةَ (صحيح البخاري - ٤٤٨٥) خاوەنانی کتێب تەوراتیان بە عیبرانی ئەخوێند، وە بە عەرەبی تەفسیریان ئەکرد بۆ موسوڵمانان، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: باوەڕ بە خاوەنانی کتێب مەکەن وە بەدرۆشیان مەخەنەوە، وە بڵێن: باوەڕمان بە الله هەیە وە بەوەی بۆمان دابەزیوە ﴾.

٢. بەپێی سیاقی فەرموودەکە گەر ئەهلی کیتاب هاتن تەفسیری دەقەکانیان کرد و دەقەکانمان نەزانین نە باوەڕ بە تەفسیرەکانیان ئەکەین و نە بەدرۆی ئەخەینەوە. چونکە نازانین بەڕاستی وەریانگێڕاوە یان نا. ئەمەش ئیشکردنە بەو ئایەتە پیرۆزەی قورئان کە گەر فاسقێك هەواڵی بۆمان هێنا حوکم نەیەین تا دڵنیا ئەبینەوە لە هەواڵەکە (الحجرات - ٦). وە لە ریوایەتەکەدا

قسە لەسەر دەقە عیبرانییەکەی کتێبەکەیان نییە بەڵکو حوکمەکە لەسەر تەفسیرەکەیانە کە بە عەرەبی بووە.

٣. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هەر جێیەکدا زانیبێتی کە ئەهلی کیتاب درۆئەکەن بەدرۆی خستوونەتەوە و پێچەوانەیان جووڵاوەتەوە. وە نەیفەرمووە ئەوانیش کتێبیان هەیە و بەدرۆناخرێنەوە. وە گەر ڕاستیان کردبێت بەڕاستی داناون و پشتڕاستی کردوونەتەوە ﴿ خالِفوا اليهودَ والنَّصارى فإنَّهم لا يُصَلُّون في خِفافِهم ولا في نِعالِهم (صحيح ابن حبان - ٢١٨٦) پێچەوانەی یەهود و نەصارا بجولێنەوە، جا ئەوان لە خوفف و نەعلەکانیاندا نوێژ ناکەن ﴾، ﴿ أنَّ اليَهُودَ كَانُوا إذَا حَاضَتِ المَرْأَةُ فيهم لَمْ يُؤَاكِلُوهَا، ولَمْ يُجَامِعُوهُنَّ في البُيُوتِ فَسَأَلَ أصْحَابُ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فأنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ المَحِيضِ قُلْ هو أذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ في المَحِيضِ} ﴿البقرة: ٢٢٢﴾ إلى آخِرِ الآيَةِ، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: اصْنَعُوا كُلَّ شيءٍ إلَّا النِّكَاحَ، فَبَلَغَ ذلكَ اليَهُودَ، فَقالوا: ما يُرِيدُ هذا الرَّجُلُ أنْ يَدَعَ مِن أمْرِنَا شيئًا إلَّا خَالَفَنَا فِيهِ (صحيح مسلم - ٣٠٢) یەهود گەر ئافرەت تیایان بکەوتایەتە سەر خوێن نانیان لەگەڵ نەئەخوارد، وە لە ماڵدا لەگەڵیان دانەئەنیشتن، جا هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە پێغەمبەریان پرسی صلی الله

عليه وسلم جا خوای گەورەش ئەمەی دابەزاند (وە پرسیاری سووڕی مانگانەت لێ ئەکەن، بڵێ ئەوە ئازارە جا لە جووتبوونی ئافرەتان دووربکەونەوە لە سووڕی مانگانەدا) تا کۆتایی ئایەتەکە، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: هەموو شتێك پێکەوە بکەن جگە لە جووتبوون. جا ئەوە بە جوولەکە گەشتەوە و وتیان: ئەم پیاوە نایەوێت واز لە هیچ شتێکمان بهێنێت ئیللا پێچەوانەمان بجوولێتەوە تیایا ﴾، ﴿ جَاءَ حَبْرٌ مِنَ اليَهُودِ، فَقالَ: إنَّه إذَا كانَ يَوْمُ القِيَامَةِ جَعَلَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ علَى إصْبَعٍ، والأرَضِينَ علَى إصْبَعٍ، والمَاءَ والثَّرَى علَى إصْبَعٍ، والخَلَائِقَ علَى إصْبَعٍ، ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ، ثُمَّ يقولُ: أنَا المَلِكُ أنَا المَلِكُ، فَلقَدْ رَأَيْتُ النبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يَضْحَكُ حتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَعَجُّبًا وتَصْدِيقًا لِقَوْلِهِ، ثُمَّ قالَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: {وَما قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ} (صحيح البخاري - ٧٥١٣)

زانایەکی یەهود هات و وتی: گەر ڕۆژی قیامەت بێت خوا ئاسمانەکان ئەخاتە سەر پەنجەیەکی، وە زەوییەکانیش لەسەر پەنجەیەکی، وە ئاو و خۆڵ لەسەر پەنجەیەك، وە دروستکراوەکان لەسەر پەنجەیەك، پاشان ئەیانهەژێنێت، پاشان ئەڵێت: من پاشام من پاشام. جا پێغەمبەرم بینی صلى الله عليه وسلم پێئەکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوت بە سەرسوڕمان و بەڕاستدانانی قسەکەی، پاشان پێغەمبەری خوا وتی: وە بە حەقی خۆی قەدری خوایان

نـەگرتووە ﴾، ﴿ عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهَـا: أَنَّ يَهُودِيَّـةً دَخَلَـتْ عَلَيْهَـا، فَذَكَرَتْ عَذَابَ القَبْرِ، فَقالَتْ لَهَا: أعَاذَكِ اللَّهُ مِن عَذَابِ القَبْرِ، فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ عن عَذَابِ القَبْرِ، فَقـالَ: نَعَـمْ، عَـذَابُ القَبْـرِ. قالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: فَما رَأَيْتُ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ بَعْـدُ صَلَّى صَلَاةً إلَّـا تَعَـوَّذَ مِـن عَـذَابِ القَبْـرِ (صحيح البخاري - ١٣٧٢) لـە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت کە ئـافرەتێکی یـەهودی چـووە لای و باسـی سزای گۆڕی کرد، جا پێی وت: خوا لە سزای قەبر بتپارێزێت. جا عائیشە لە پێغەمبەری خوای پرسی صلی الله علیه وسلم دەربارەی سزای قەبر. جا وتی: بەڵێ سزای قەبر ڕاستە. عائیشە ڕەزای خوای لێبێت وتی: پێغەمبەری خـوام نەبینی لە دوای ئەوەوە نوێژێك بکات ئیللا پەنای ئەگرت لە سزای قـەبر ﴾.

وە لە قورئانی پیرۆزیشدا گەر کافران ڕاستیان وتبێت خوای گەورە پشتڕاستی کردوونەتەوە، وە گەر درۆیان کردبێت بەدرۆی خستوونەتەوە ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَـةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُـواْ بِمَـا قَـالُواْۘ بَلۡ يَـدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَـآءُ (المائدة - ٦٤) وە یەهود وتیان دەستی خوا نووقـاوە، دەسـتیان بنووقێت وە بەوە بەلەعنەتکران کە وتیان، بـەڵکو هـەردوو دەسـتی کـراوەن چـۆنی بوێـت ئەبەخشـێت ﴾، ﴿ وَقَالَـتِ ٱلۡيَهُـودُ عُزَيۡـرٌ ٱبۡـنُ ٱللَّهِ وَقَالَـتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلۡمَسِـيحُ ٱبۡـنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِـكَ قَـوۡلُهُم بِـأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَـٰهِـُٔونَ قَـوۡلَ ٱلَّـذِينَ

كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ (التوبة - ٣٠) وە یەهود وتیان عوزەیر کوڕی خوایە وە نەصرانییەکان وتیان مەسیح کوڕی خوایە، ئەوە قسەی دەمیانە، هاوشێوەی قسەی ئەوانە ئەکەن کە پێشتر کوفریان کرد، خوا لەناویان ببات چۆن لە حەق لائەدەن ﴾، ﴿ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ (النمل - ٣٤) وتی پاشاکان گەر بچنە شارێکەوە تێکی ئەدەن و دەسەڵاتدار و بەعیززەتەکانی خەڵکەکە زەلیل ئەکەن، وە ئەوە پیشەیانە ﴾. جا لەمەوە ئەڵێین دەق و هەواڵەکانی ئەهلی کیتاب سێ حوکم ئەیانگرێتەوە: یەکەمیان گەر دەقێك هات لەلایانەوە پێچەوانەی دەقەکانمان بوو یان بەدرۆخرابووەوە ڕەتیئەکەینەوە. دووەمیان گەر دەقێك هات و دەقەکانی ئێمە پشتڕاستی کردەوە بەڕاستی دائەنێین. سێیەمیان گەر دەقێك هات و نە پێچەوانە و نە پشتڕاستکرابووەوە لامان، ئەوا نە بەدرۆی ئەخەینەوە و نە بەڕاستیشی ئەزانین.

شەشەم/ بەشێك لەو دەقانەی هێناوتە تەنها گێڕانەوەی چیرۆکە و، مەرج نییە واتای ئەوە بێت خوا پێیان ڕازییە.

وەڵام/ گـەر وابێـت و خـوای گـەورە بـە قسـەیەك یـان کردارێـك ڕازی نـەبێت و بیگێڕێتەوە، ئەوا ئەبێت خوای گەورە سەرزەنشتی کەسەکە یان کردارەکـە بکـات، وە سیاقەکە هی زەمکردن بێت، وە تاوانبارەکان سزا بدرێن. نەوەك بە بێـدەنگی و بێ باسکردنی حوکمەکە بەسەر چیرۆکەکەیا تێپەڕێت. جا یان خوا لەو شتانە ڕازییە بۆیە لێیان بێدەنگ بووە، یان کتێب قسەی خوای گـەورە نییـە بـەڵکو مرۆڤـەکان مێــژوو و ڕووداو و بەســەرهاتەکانی کەســانێکیان نوســیوەتەوە و، تــەنها وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی سەیری کتێب ئەکرێت نەك وەحیی خوایی.

تەواو بوو ولله الحمد

٢٧/ ٩/ ٢٠٢٣ || ١٣/ ربيع الأول/ ١٤٤٥ || سلێمانی - عێراق

## سەرچاوەکان:

[١] قورئانی پیرۆز (القرآن الكريم).

[٢] فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (أحاديث الرسول صلى الله عليه وسلم).

[٣] الكتاب المقدس (الطبعة اليسوعية).

[٤] محتويات العهد القديم / محمد شاهين التاعب.

[٥] شبهات حول الإسلام / محمد قطب.

[٦] معجم مصطلحات العلوم الشرعية / مجموعة من المؤلفين.

[٧] جامع البيان عن تأويل آي القرآن / أبو جعفر الطبري.

[٨] لسان العرب / ابن منظور.

[٩] معجم مقاييس اللغة / أحمد بن فارس بن زكريا.

[١٠] شرح الورقات / سعد الشثري.

[١١] الكتاب المقدس (الترجمة العربية المشتركة).

[١٢] الكتاب المقدس (ترجمة الحياة).

[١٣] التورات كتاب مقدس أم جمع من الأساطير؟ / ليوتاكسيل.

[١٤] تفسير الكتاب المقدس / تادرس يعقوب ملطى.

[١٥] الموسوعة الفقهية / وزارة الأوقاف والشئون الإسلامية - الكويت.

[١٦] تفسير القرآن العظيم / إسماعيل بن عمر بن كثير.

[١٧] الكتاب المقدس (ترجمة فان دايك).

[١٨] موسوعة الإجماع في الفقه الإسلامي / سعدي أبو جيب.

[١٩] القرآن والعلم الحديث / ذاكر عبد الكريم نايك.

[٢٠] Evidence for the Big Bang \ Western Australia University.

[٢١] http://holybookhistory.com/

[٢٢] حوار الحضارات / روجيه غارودي.

[٢٣] قصة الحضارة / ويل ديورانت.

[٢٤] شوێنەواری هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت (آثار الصحابة رضي الله عنهم).

[٢٥] الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة / الندوة العالمية للشباب الإسلامي.

[٢٦] الإعلان العالمي لحقوق الإنسان / الأمم المتحدة.

[٢٧] USA: Pattern of brutality and cruelty -- war crimes at Abu Ghraib \ Amnesty International.

[٢٨] Twenty Years on, Iraq Bears Scars of US-led Invasion \ Sarah Sanbar.

[٢٩] World War 1 \ Simon Adams.

[٣٠] World War 2 \ Simon Adams.

[٣١] الأم / محمد بن إدريس الشافعي.

[٣٢] ئێزیدییەکان (جیلوە و مەسحەفا رەش) و بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی / نەجاتی عەبدوڵلا.

[٣٣] الكون والإنسان بين العلم والقرآن / بسام دفضع.

[٣٤] نظام الرق في الإسلام / عبد الله ناصح علوان.

[٣٥] Don't look away from China's atrocities against the Uyghurs \ Lauren Baillie; Matthew Parkes.

[٣٦] شرح الورقات / وليد بن راشد السعيدان.